زنجیرەی ژیانی دوای مردن - ٢-

## لە قورئان و فەرموودە صەحیحەکاندا

نووسینی

محمد ملا فائق شارەزووری

چاپی سێهەم

١٤٣١ هـ ٢٠١٠ م

📖 ناوی کتێب : قیامەت لە قورئان وفەرمووده صەحیحەکاندا.

✍ نووسینی : محمد ملا فائق شارەزووری.

❁ ژمارەی لاپەڕە: ٣١١

❁ نۆرەی چاپ: سێهەم

❁ چابخانەی: ڕێ نوێ

❁ ژمارەی تیراژ: ٢٥٠٠دانه

❁ ساڵی چاپ : ١٤٣١ هـ - ٢٠١٠ م

❁ ژمارەی سپاردن: (٤٨٣) ی ساڵی ١٩٩٩


**تێبینی :**

**بۆ دەست کەوتنی ئەم بەرهەمە بە(کۆ) پەیوەندی بکە بەم ژمارە مۆبایلەوە: ٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥**

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد الله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك لَهُ، وَ أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدهُ وَ رَسولهُ .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ (آل عمران :١٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ (النساء /١).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ (الأحزاب :٧٠-٧١).

أمّا بعد فإنَّ أصدَقَ الحديثِ كتابَ الله وَ خَيرُ الهَدي هَديُ محمد (ﷺ) وَ شَرَّ الأمورِ مُحدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدَثةٍ بِدعة، وَ كُلَّ بِدعَةٍ ضَلالة وَ كُلَّ ضَلالةٍ في النّار*.

**پێشەکی :**

**باوەڕ بوون بە ڕۆژی کۆتایی یەکێکە لەشەش پایەکەی ئیمان، وە بابەتەکانی باوەڕ بوون بە زیندوو بوونەوە و لێ پرسینەوە و کێشانەی کارەکان و بەهەشت و دۆزەخ، یەکێکن لە بنچینەکانی باوەڕبوون بەڕۆژی کۆتایی.**

**لەبەر گرنگی ڕۆژی کۆتایی، دەبینین لە قورئانی پیرۆزدا زۆرجار خوای گەورە باوەڕ (الإيمان) ی کردۆتە هاوتا لەگەڵ باوەڕ بوون بەڕۆژی کۆتایی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ .....ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ..... ﴾(البقرة: ١٧٧) واتە: ﴿چاکە بریتی یە لە باوەڕ بوون بە خوا و ڕۆژی کۆتایی﴾.**

* ئەمە پێی دەوترێت (خطبة الحاجة) کە هەمیشە پێغەمبەر (ﷺ) وتارەکانی بەمە دەست پێ دەکرد.وە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە سەیری کتێبی (خطبة الحاجة) بکە لاپەڕە (١٤ـ ١٩) کە شەش لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویانەتەوە.

وە لەبەر گرنگی باسەکە دەبینین خوای گەورە زۆر لە وردەکاریەکانی ئەو ڕۆژە ترسناکەی بۆ ئاشکرا کردووین . وە ڕوونی کردۆتەوە کەچی ئامادەکردووە لە سزای سەخت بۆ بێ باوەڕان، لەگەڵ ئامادەکردنی پاداشتی گەورەی نەبڕاوە بۆ بڕواداران.

لەبەر کەمی نوسراوی تایبەت بەم باسە یاخود هەندێك لەو نوسراوانە گشت گیر و پوخت نەبوون، بەڵکو کەم و کورت و ناڕێك بوون. بۆیە بە پێویست زانرا کە هەوڵ بدرێت بۆ نوسینی نوسراوێکی پوخت و گشت گیر سەبارەت بە ڕۆژی دوایی، و کۆکردنەوەی لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە (صحیح)ەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، و وتەی پێشینەچاکەکان و ڕێکخستنی باسەکە بەوردی و بەشێوەیەك کە هەموو موسوڵمانێك زۆر بەئاسانی بتوانێت سوودی لێ وەربگرێت و شارەزابێت لە باس و وردەکاریەکانی ئەو ڕۆژە ترسەناکە کە چارەنوسی هەمووانە. داواکارم لە خوای گەورە و میهرەبان لە هەڵەوکەم و کورتیەکانمان ببورێت و کارەکانمان تەنها هەر بۆ خۆی بێت و بیکاتە تێشووی ڕۆژی دواییمان و ببێتە مایەی سوود لێ وەرگرتنی هەموو موسوڵمانان. (آمین).

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد أن لا اله إلاّ أنت استغفرك وأتوب إليك

باوکی عەبدوڵا

محمد ملا فایەق شارەزووری

# پێویستی ناسینی ڕۆژی کۆتایی و یادکردنەوەی وە خۆ ئامادەکردن بۆی.

پێویستە هەموو موسوڵمانێك بەردەوام ڕۆژی کۆتایی لە یاد بێت. تا زیاتر جێبەجێ کاری فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بێت، وە هەردەم یادی ئەو ڕۆژە ترسناکە فەرامۆش نەکات. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾( السجدة: ١٤ ). واتە:﴿بیچێژن سزای پشت گوێ خستنی گەیشتننتان بەم ڕۆژە، ئێمەش ئێوە فەرامۆش دەکەین بیچێژن سزای هەتا هەتایی بە هۆی کارەکانتانەوە﴾.

وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت : ﴿ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾ (الجاثية: ٣٤). واتە: ﴿ پێیان دەوترێت ئەمڕۆ پشت گوێ دەخرێن، وەك چۆن گەیشتننتان بەم ڕۆژە پشت گوێ دەخست، ئێوە جێگەتان هەر دۆزەخە و هیچ پشتوانێکتان نی یە﴾. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴾ (الروم: ٧).واتە: ﴿ ئەوانە تەنها ڕوکەشێکی ژیانی دونیا شارەزان و تەواو بێ ئاگان لە ڕۆژی دوایی﴾. پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە کە خوای گەورە زۆر بەڕقە بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە .

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە کە فەرموویەتی : ((إنّ الله تعالى يبغض كل عالم بالدنيا وجاهل بالآخرة))[1] واتە : (خوای گەورە توورەیە لەو کەسە کە شارەزایە لە دونیا و بێ ئاگا و نەزانە بەرامبەر بە ڕۆژی دوایی) .

ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((عودوا المريض، واتبعوا الجنائز تذكركم الآخرة ))[2] واتە: (سەردانی نەخۆش بکەن وە

---

[1] اخرجه: الحاكم في ((التاريخ)) ، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (١٨٧٩).

[2] اخرجه : البخاري في ((الادب المفرد)) (٥١٨)، وابن حبان (٧٠٩)، وابن ابي شيبة (٧٣/٤)، واحمد (٢٧/٣) (١١١٨٠) وقال محققه الشيخ الارناؤوط : اسناده صحيح ، والطيالسي (٢٢٤/١ )، وحسنه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة )) (١٩٨١) ، و ((صحيح الادب المفرد)) (٤٠٣) ، و ((احكام الجنائز)) (ص :٦٦) ، و((صحيح الجامع)) (٤١٠٩) .

بەدوای جەنازەدا بڕۆن ڕۆژی داویتان بیردێنێتەوە) . وە دەفەرموێت : ((قد کنت نهیتکم عن زیارة القبور ........ ولکن فزوروها (فانها تذکرکم الآخرة))[٣]. واتە: (من پێشتر سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردبوون، بەلأم لەمەودوا سەردانیان بکەن چونکە ڕۆژی دواییتان بیردێنێتەوە).

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردووین کە زۆر باش خۆمان ئامادە بکەین بۆ بەپیرەوە چوونی هاتنی ڕۆژی کۆتایی، ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ لای گۆڕێك و لێی نزیك بووەوە و فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە ڕووی کردە هاوەڵانی و پێی فەرموون: ((یا إخواني لِمثل هذا الیوم فَاَعِدّوا))[٤] واتە : (ئەی برایانم بۆ ڕۆژێکی ئاوا خۆتان ئامادە بکەن).

هەروەها ناسینی ڕۆژی کۆتایی و یادکردن و خۆئامادەکردن بۆی نیشانەی ژیری ئادەمیزادە . ئیبن و عومەر (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : ((أفضل المؤمنینَ أحسنهم خلقا واکیسهم اکثرهم للموت ذِکراً واحسنهم [ لِما بَعْدە] استعداداً أولئك الأکیاس))[٥] . واتە: (چاکترینی باوەڕداران، خوڕەوشت جوانەکانیانن، وە ژیرترینیان ئەوانەن کە لە هەمووان زیاتر یادی مردن دەکەنەوە وە لە هەموان زیاتر خۆیان بۆ دوای مردن ئامادەکردووە بەڕاستی ئەوانە ژیرن). وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((اولئك الاکیاس ذهبوا بشرف الدنیا وکرامة الاخرة))[٦] واتە:(...... ئەوانە بەڕاستی ژیرن و سەربەرزی دنیاو ڕێزی ڕۆژی کۆتاییان بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە).

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرمانی پێکردووین کە خولیای یەکجارەکیمان تەنها پەرۆشی و بەدەست هێنانی سەرفرازی بێت لە ڕۆژی کۆتاییدا . زەیدی کوڕی

---

[٣] اخرجه : مسلم (٩٧٧)، وابو داود (٣٢٣٥)، والنسائي (٤/٩٨)؛ والترمذي (١٠٥٤) وقال حديث حسن صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٨٨٦).

[٤] اخرجه: احمد (٤/٢٩٤) ، وابن ماجة (٤١٥٩)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٣٨٣)، و ((السلسلة الصحيحة)) (١٧٥١)، و((صحيح الجامع)) (٢٦٥٩) ، واللفظ لابن ماجة .

[٥] اخرجه: ابن ماجة (٤٢٥٩)، والبيهقي ((شعب الايمان)) (٧٩٩٣)، وحسنه الالباني ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٣٥) ، و ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٨٤).

[٦] اخرجه: الطبراني في ((الصغير)) (١٠٠٨)، واسناده حسن كما قال الهيثمي في ((مجمع الزوائد))(١٠/ ٣٠٩).

ثابت (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( ... من كانت الآخرة هَمَّهَ (نيّته)، جمع الله لـه أمرُه، و جعل غناه في قلبه، و آتتهُ الدُنيا وهَي راغِمة))[٧]. واتە: (.....هەر کەسێك مەبەست و خولیای ڕۆژی کۆتایی بێت، خوای گەورە کارەکانی بۆ ڕێك دەخات، وە دەوڵەمەندی دەخاتە دڵیەوە وە دونیاشی پێ دەبەخشێت گەر نەشیەوێت). وە لە ڕیوایەتێکدا ئیبن و مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من جعل الهموم هما واحدا، هم آخرته، كفاه الله هم دنياه، ومن تشعبت به الهموم في احوال الدنيا لم يبال الله في أي أوديتها هلك))[٨]. واتە:(هەر کەسێك هەموو خەمەکان بکاتە یەك خەم ئەویش خەمی ڕۆژی کۆتایی بێت، خوای گەورە خەمەکانی دونیای لێ دەڕەوێنێتەوە، وە هەر کەسێك هەموو خەمێکی بۆ بەدەست هێنانی دونیا بێت، خوای گەورە بەلایەوە گرنگ نی یە لە کام شیو و دۆڵدا تیادەچێت) .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردووین کە ئەوەندە سور نەبین لە بەدەست هێنانی ژیانی دونیاماندا چونکە ئەوە دەبێتە هۆی زیاتر دوور کەوتنەوەمان لە خوای گەورە .ئیبن و مەسعود (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : : (( اقتربت الساعة ولا يزدادُ الناس على الدينا إلاّ حرِصاً ولايزدادوُن مِنَ الله إلاّ بُعـداً ))[٩] .واتە: (تا بێت ڕۆژی کۆتایی نزیك دەبێتەوە، تابێت خەڵکان سوورتردەبن لەسەر بە دەست هێنانی دونیا، وە تا بێت لە خوای پەروەردگار زیاتر دوور دەکەونەوە)

---

[٧] أخرجه: إبن ماجة (٤١٠٥) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٣١٣) ، و ((السلسلة الصحيحة)) (٩٥٠) .

[٨] أخرجه : إبن ماجة (٢٥٧) ، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن إبن ماجة)) (٢٠٧) .

[٩] اخرجه: ابو نعيم في ((الحلية)) (٣٢٤/٧) ، والحاكم (٣٢٤/٤) وصححه، وحسنه الشيخ الالباني ((السلسلة الصحيحة))(١٥١٢)، و ((صحيح الجامع)) (١١٤٦).

# ناوەكانی ڕۆژی كۆتایی

١- یــوم القیامــة: (واتــە: ڕۆژی هەســتانەوە) خــوای گــەورە دەفــەرموێت:

﴿........لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ........﴾( النساء: ٨٧).

٢- یوم الآخرة: (واتە: ڕۆژی كۆتایی) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿........وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ........﴾ (البقرة: ١٧٧).

٣- الساعة: (واتە: كاتی دیاری كراو) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ (الحج: ١).

٤- یــوم البعــث: (واتــە: ڕۆژی زیندوو بوونــەوە) خــوای گــەورە دەفــەرموێت:

﴿........فَهَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (الروم: ٥٦ ).

٥- یوم الخروج: (واتە: ڕۆژی دەرچوون لە گۆڕەكان) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ﴾ (ق: ٤٢).

٦- القارعــة: (واتــە: دەنــگ دانــەوە) خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿الْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا الْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾ (القارعة: ١ - ٣ ).

٧- یوم الفصل: (واتە: ڕۆژی جیاكردنەوە) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ (الصافات: ٢١).

٨- یوم الدین: (واتە: ڕۆژی پاداشت وەرگرتنەوە) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ﴾ (الانفطار: ١٥).

٩- الطامة الكبری: (واتە: تێك ڕژان و پڕبوونی گەورە) خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَىٰ﴾ (النازعات: ٣٤).

١٠- یوم الحسرة: (واتە: ڕۆژی داخ وپەژارە ) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (مریم: ٣٩).

١١- الغاشیة: (واتە: داپۆشەر و كارەسات) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ (الغاشیة: ١).

١٢- **یوم الخلود**: (واتە: ڕۆژی نەمری). خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴾ (ق : ٣٤).

١٣- **یوم الحساب**: (واتە: ڕۆژی لێ پێچینەوە) خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴾ (ص: ١٦).

١٤-**یوم الوعید**: (واتە: ڕۆژی هەڕەشە)خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴾ (ق : ٢٠).

١٥- **یوم الازفة**: (واتە: ڕۆژی نزیك بوونەوە)خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ (غافر : ١٨)

١٦- **یوم الجمع** : (واتە: ڕۆژی کۆکردنەوە)خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ ........وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴾ (الشوری : ٧).

١٧- **الحاقة**: (واتە: ڕۆژی زاڵبوون و ڕاستی). خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ٱلْحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴾( الحاقة: ١ – ٣ ).

١٨- **یوم التلاق**: (واتە: ڕۆژی بەیەك گەیشتن) خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴾ (غافر :١٥).

١٩- **یوم التناد**: (واتە:ڕۆژی بانگ کردن بۆ مەحشەر) خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ وَيَٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴾ (غافر : ٣٢).

٢٠- **یوم التغابن**: (واتە: ڕۆژی توانج گرتن و گاڵتە پێ کردن) .خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ ﴾ (التغابن : ٩).

٢١- **الصاخة**:(واتە: شریخەی گەورە) خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴾ (عبس : ٣٣).

٢٢- **الواقعة**: (واتە: ڕووداو) خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴾ (الواقعة : ١).

**ڕۆژی کۆتایی چەند ناوێکی تری هەیە جگە لەمانە.وەك عەبدول حەقی ئیشبیلی لە کتێبەکەیدا بەناوی ((العاقبة)) (٩٩) ناوی قیامەتی هێناوە، وە زانا ابن کثیر لە کتێبی ((نهایة البدایة)) (١/٢٥٥) زیاتر لە هەشتا ناوی هێناوە. بۆ زانیاری زیاتر دەتوانیت بگەڕێتەوە بۆیان.**

# سەرەتای ڕۆژی کۆتایی

## بەشی یەکەم:دەست پێکردنی ڕۆژی کۆتایی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە وردی سەرجەم ڕووداوەکانی ڕۆژی کۆتایی ڕوون کردۆتەوە بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی (ﷺ).

عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) دەفەرموێت: ((قام فينا رسول الله (ﷺ) مقاما فاخبرنا عن بدء الخلق حتى دخل اهل الجنة منازلهم واهل النار منازلهم حفظ ذلك من حفظه ونسي ذلك من نسيهُ))[1]. واتە: ( ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) هەستا لە ناوماندا و لەسەرەتای دروست بوونی بوونەوەرەوە بۆی گێڕاینەوە هەتاکو گەیشتنی بەهەشتیەکان بە جێگای خۆیان وە دۆزەخیەکان بە جێگەی خۆیان و ئەو کەسانەیکە وتەکەی پێغەمبەری خوا یان لەبەرکرد ئەو ڕۆژە لەبەریان کرد و ئەوانەش کەلەبیریان چووەوە لەبیریان چووەوە).

وادەی هاتنی ڕۆژی کۆتایی نهێنی یە، تەنها خوای گەورە دەیزانێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ..... ﴾ (لقمان: ٣٤).

عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) دەفەرموێت: ((بينما نَحْنُ جلوسٌ عِندَ رسول الله (ﷺ) ذات يومٍ إذْ طَلَعَ علينا رَجُلٌ شَدِيدُ بياضِ الثيابِ شديدُ سَوادِ الشَّعْرِ، لايُرى عليه اثرُ السَفَرِ، ولا يَعْرِفُهُ مِنَّا أحدٌ حتى جَلَسَ إلى النبي (ﷺ) فأسْنَدَ رُكْبَتَيهِ إلى رُكْبَتَيهِ، وَوَضَعَ كَفَّيهِ على فَخِذَيهِ وَقال: يا محمد أخبرني عَنْ ... قال فأخبِرني عن الساعة، قال: ما المسؤولُ عنها بأعْلَمُ مِنْ السائل...، ثم قال: ياعمر، اتَدْري مَنْ السائل ؟ قلتُ: الله ورسوُلُهُ اعْلَمْ، قال: فإنَّهُ جِبْرِيلُ اتاكُمْ يُعَلِمُكُمْ دِينَكُمْ))[2]. واتە: (کاتێك ئێمە دانیشت بوین لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و پۆشاکێکی زۆر سپی و قژێکی زۆر ڕەشی هەبوو، ماندووی سەفەری پێوە دیار نەبوو، وە کەس لە ئێمە نەی دەناسی، هات و لای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دانیشت، هەردوو ئەژنۆی نوساند بە ئەژنۆیەوە،و هەردوو لەپی دەستی خستە سەر هەردوو ڕانی و وتی: ئەی موحەمەد.... باسی ڕۆژی کۆتاییم بۆ بکە:

---

[1] اخرجه: البخاري (٢٩٧٢).

[2] حديث جبريل المشهور رواه البخاري (٥٠)، ومسلم (٨) (١) من حديث عمر بن الخطاب.

ئەویش فەرمووی: (پرسیار لێ کراو زاناترنیە لەو باسە لەپرسیارکەر). [واتە: من وتۆ هەردووکمان وەك یەك نازانین کەی ڕۆژی کۆتایی دێت و بەرپا دەبێت].... پاشان فەرمووی: ئەی عومەر، ئەزانیت کێ بوو ئەو پرسیارکارە ؟ وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتردەزانن، فەرمووی: ئەوە جوبرەئیل بوو هاتبوو بۆ لاتان تا ئاینەکەتان فێربکات)، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمانیڕوون کردۆتەوە کە ڕۆژی کۆتایی دێت دوای هاتنە دی نیشانە بچووك و گەورەکانی ڕۆژی کۆتایی کاتێك کە قورئان بەرز دەکرێتەوە و گیانی خاوەن باوەڕان لە (شام) دەکێشرێت، بەهۆی شنە بایەکەوە کەبەسەریاندا دێت و کەس لەسەر زەوی لە موسوڵمانان نامێنیت تەنها کافر نەبێت، و ڕۆژی کۆتایی بەسەر ئەواندا بەرپا دەبێت، وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((لاتقوم الساعة إلاّ على شرار الخلق، وهم شرٌ مِن اهل الجاهلية لايدعون الله بشيءٍ إلاّ ردّهُ عليهم))[3] واتە: ( ڕۆژی کۆتایی بەرپا نابێت تەنها بەسەر خراپترین دروست کراواندا نەبێت، ئەوانەی کە خراپترن لەخەڵکانی زەمانی نەفامی داوای هەرشتێك بکەن لە خوای گەورە، خوای گەورە ئەیداتەوە بەڕوویاندا و لێیان وەرناگرێت) .

وەپێش بەرپابوونی ڕۆژی کۆتایی جاڕچی یەك جاڕ دەدات و دەڵێت: ڕۆژی کۆتایتان لێ هاتە پێش و بەرپا بوو . ئیبن و عەباس (ﷺ) دەفەرموێت: ((يُنادي مُنادٍ بينَ يَديَّ الساعةِ (الصَيحة): آتتكم الساعَة، فَيَسْمَعُه الأحياءُ و الأموات [وينزل الله عزوجل الى السماء الدنيا فينادي منادٍ: لمن الملك اليوم ... لِلّهِ الواحد القهار]))[4] .واتە: (جاڕچی یەك جاڕ دەدات لەپێش بەرپابوون یـڕۆژی کۆتاییدا و دەڵێت: ڕۆژی کۆتایتان پێگەیشت و بەرپا بوو، ئەو کاتەهەموو مردوو و زیندوو گوێیان لێ دەبێ، [خوای باڵادەست دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا و جاڕچی یەك بانگ دەکات: خاوەنداریەتی ئەمڕۆ بۆ کێ یە ....بۆ خوای تاك و تەنها و بەرزە]). بەرپابوونی ڕۆژی کۆتایی لە ڕۆژی جومعەدا دەبێت لە ناو ڕۆژەکانی هەفتەدا،ئەبو هورەیرە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری

---

[4] أخرجه: مسلم (١٩٢٤).

[5] أخرجه: الحاكم (٤٣٧/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي فيه وفي ((مختصر العلو)) ص(١٢٦، ٩٤)، واخرجه عبدالله بن احمد في ((كتاب السنة)) (٢٢٠) وقال محققه: إسناده حسن، وقال الشيخ الألباني في ((مختصر العلو)): إسناده صحيح على شرط مسلم، وأخرجه: اللالكائي: ((شرح أعتقاد أهل السنة و الجماعة)) رقم: (٣٦٦)، وابو نعيم بن حماد في ((الفتن)) (١٧٦٩) وقال محققه: اسناده حسن..

خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خير يومٍ طلعت عليهِ الشمس يَوم الجمعة، فيه خُلِقَ آدم [وفيـه أُدخِـلَ الجَنَّة وفيهِ أُخرِجَ منها] .. [وفيه ماتَ، وفيه تِيبَ عليهِ، وفيـهِ تَقـوم السـاعة] [وفيـهِ النفخـةُ وفيـه الصَّعقَة ][5]، مامِن مَلَكٍ مُقرّبٍ ولا سماءٍ ولا أرضٍ ولا رياح ولا جبالٍ ولا بحرٍ إلاّ وهُنَّ يُشفِقن مِن يوم الجمعة][6]، وما من دابةٍ الاّ وهي مُصيّخةٌ (أي مستمعة) يوم الجمعةِ مِن حينِ تُصبِحُ حتى تَطلـعَ الشَمسُ[7]، شَفَقاً مِنَ الساعةِ إلاَّ الجِنَّ و الإنسَ))[8] واتـە:چاکترین ڕۆژ کە خۆر بەسەریدا هەڵهاتبێت ڕۆژی جومعە یە، تیایدا ئادەم دروست کراوە [وەتیایدا براوەتە ناو بەهەشت و لـێ ی دەرکـراوە] [وەتیایـدا مـردووە، وەتیایـدا تۆبـەی لـێ وەرگـیراوە، وەتیایدا ڕۆژی کۆتـایی دێت] [وەتیایدا نەعرەتەو مردن دێت] [وهیچ مەلائیکەیەکی نزیـك و ئاسمانێـك و زەویـەك و بایـەك و چیایەك و دەریایـەك نـی یـە کـە نەترسـێت لـەڕۆژی جومعـەدا] و هـیچ زینـدەوەرێك نـی یـە گـوێی قـوڵاغ نـەکردبێت و هەسـتی ڕانـەگرتبێت لـە ڕۆژی جومعـەدا لـەکاتی بەرەبەیانـدا هـەتاکو ڕۆژهـەڵاتن لەترسـی بەرپابوونی ڕۆژی کۆتایی تەنها جنۆکە ومرۆڤ نەبێت .

وا دەردەکـەوێت لـەم فـەرموودە(صـحیح)ەدا وە (خـوای گـەورە باشتر دەزانێت) کە ڕۆژی کۆتایی لەکاتی نوێژی بەیانی تا ڕۆژهـەڵاتن لەڕۆژی جومعەدا دەبێت. بەڵگەش

---

(5) أخرجه: مالك (١٠٨/١)، وأحمد (٥٠٤/٢) مسلم (٨٥٤)، وعبدالرزاق (٥٥٨٣)، والنسائي (٨٩/٣)، وأبـوداود (١٠٤٦)، والترمذي (٤٩١)، والحاكم (٢٧٨/١) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وابـن حبـان (٢٧٧٢) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط الشيخين، و صـححه الشـيخ الألبـاني في: ((صـحيح سـنن النسـائي)): (١٣٠٠-١٣٥٤)، و((صحيح سنن أبي داود)): (٩٢٤)، و((صحيح سنن الترمذي)) (٤٠٥-٤٠٧)، و((صـحيح الجـامع)) (٣٣٢٩)، و((الإرواء)) (٧٦٥)، و((المشكاة)) (١٣٦١).

(6) أخرجه: ابن ماجة (١٠٨٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٨٨٨)، وفي ((المشكاة)) (١٣٦٣).

(7) يبدو من هذه الرواية الصحيحة والله اعلم ان الساعة تقع فيما بين صلاة الفجر حتى طلـوع الشـمس، مـن يـوم الجمعـة، على ذلك قوله تعالى: ﴿فاخذتهم الصيحة مصبحين﴾ وقول ابن عمر: [... ولاتقـوم السـاعة الا في الأذان] رواه الطبراني وقال: معناه عندي والله أعلم في وقت آذان الفجر، وقال الهيثمي في ((مجمع الزائد)) (٤٧/٧): رواه الطبرانـي و رجالـه ثقات.

(8) اخرجه: مالك (١٠٨/١)، ومسلم (١٩٧٣ – ١٩٧٤)، وابوداود (١٠٤٦)، والنسائي (١٣٧٢)، الترمذي (٤٨٨)، ابن حبان (٢٧٧٢) و قال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، الحاكم (٢٧٨/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، البيهقي، و((السنن الكبرى)) (٢٤٨/٣) و ((الصغرى)) (٥٣٩)، و ((شعب الإيمان)) (٢٩٧٤)، وصححه الشيخ الألباني في: ((صحيح سنن الترمذي)) (٤٠٥)، و((صحيح ابي داود))(٩٦١)، ((المشكاة)) (٣٥٢٧)، ((السلسلة الصحيحة)) (٩٦١).

بۆ ئەمە ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورەیە دەفەرموێت: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴾ (الحجر: ٨٣) واتە: ﴿دەنگێکی سامناك و بومەلەرزەیەکی سەخت یەخەی پێ گرتن لەبەرەبەیاندا﴾. وە وتەکەی ئیبن و عومەرە (ﷺ) کەدەفەرموێت: "... ڕۆژی کۆتایی نایەت تەنها لەکاتی بانگدا نەبێت"ئەم وتەیە طبراني ڕیوایەتی دەکات و دەفەرموێت:" ماناکەی وای تێ دەگەم (والله اعلم) کەلەکاتی بانگی بەیانیدا دەبێت، " ئیبن حەجەری هەیثەمی لە کتێبی (مجمع الزوائد) (٤٧/٧) ئەم فەرموودەیە نەقڵ دەکات و دەفەرموێت: "ئەمە طبرانی لە (معجم الکبیر)دا ڕیوایەتی کردووە و پیاوانی گێڕەرەوەی ئەم وتەیە پیاوانی متمانە پێ کراون (رجاله ثقات).

ڕۆژی کۆتایی بەرپا دەبێت دوای ئەوەی کە خوای گەورە ڕێگە دەدات بەو مەلائیکەیەی کە (صور)ی پێ داوە وکردوویەتی بە لێپرسراوی فوکردن بە ناویدا تا فوی پیا بکات، (صور)یش وەك شاخی مانگا وایە کە فوی پیا دەکرێت، عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((جاء أعرابي الى رسول الله (ﷺ) فقال: ما الصور؟ قال: ((قَرنٌ ينفخ فيه))[9]. واتە:(پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو (ﷺ) وتی: (صور) چی یە؟ لەوەڵامدا فەرمووی: (وەك شاخی گاو مانگا وایە فووی پیا دەکرێت))،

ئیسرافیل مەلائیکەی بەناوبانگ لێپرسراوی فووکردنە بە(صور)دا، وەك زانای پایە بەرز ئیبن و حەجەری عەسقەلانی لە (فتح الباری)دا (٣٥٢/١١) ئاماژەی پێ کردووە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی ڕوون کردوویندتەوە کە چۆن ئەو مەلائیکەیە واتە (ئیسرافیل) ئامادە باشە بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە. ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((چۆن شادمان بم کاتێك خاوەنی (الصور) کەڕەناکەی بەدەمەوە گرتووە و ناوچەوانی بۆ دانەواندووە [واستمع الإذنَ متى يُؤمَرُ بالنفخ فيَنفَخُ ][10]، واتە: [گوێ بیستی ڕێگە پێدانە و ئەویش تا فەرمانی پێ بکرێت بە فووکردن پیایدا فووی پیا بکات]، ئێمەش وتمان: چی بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: ((قولوا: حسبنا الله ونِعْمَ الوكيل " على الله

---

[9] أخرجه: احمد (١٦١/٢)، و الدارمي (٣٢٥/٢)، والترمذي (٣٢٤٤) حسن، وابوداود (٤٧٤٢)، وابن حبان (٧٣١٢) و قال الشيخ الأرناؤوط: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((لسلسلة الصحيحة)) (١٠٨٠).

[10] في رواية الترمذي (٣٢٤٤).

توکلنا))[11] واتە:(بڵێن تەنها هەر خوامان بەسە و باشترین پشت وپەنامانەوە هەر پشت بەو دەبەستین)). ئەبو هورەیرە(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ما طَرْفُ صاحِبِ الصُور مُذ وكِل بهِ، مستعِداً يَنظُر نَحوَ العَرشِ مَخافَةَ انْ يُؤمَرَ قَبْلَ انْ يَرتَدَ إلَيهِ طَرفُهُ كأنَّ عَيْنيه كوكبانِ دُرّيان))[12] واتە: (چاوی خاوەن صور کراوەیە و ناتوانێت بی تروکێنێ لەو کاتەوە کە ئەرکی فووکردن بە (صور)دای پێ سپێرراوە، ئامادە باشە تەماشای لای عەرش دەکات و چاوی تێ بڕیوە لە ترسی ئەوەی نەوەك فەرمانی پێ بکرێت پێش ئەوەی چاوی بتروکێنێت و هەردوو چاوی وەك دوو ئەستێرەی درەوشاوە وان).

## فوو کردن بە (صور)دا

فووکردن بە (صور)دا زەمین لەرزەیەکی گەورە لەسەر زەوی دروست دەکات ودەنگێکی گەورەی تۆقێنەر دێنێتە ئاراوە کە هەموو زیندووان دەمرێنێ و لەناویان دەبات. وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴾ ( یس: ٢٩) واتە:﴿ یەك دەنگی گەورە و شریخەیەکی بەهێز بوو، جا ئەوان دەست بەجێ مردن وخامۆش بوون﴾.

وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:﴿ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴾( النازعات: ٦ ) واتە: ﴿لە ڕۆژێکدا فوو دەکرێت بە صوردا و دەست بەجێ زەوی تەکان دەدات و دەکەوێتە لەرزەو ژێرەو ژوور دەبێت﴾،﴿ إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ﴾( الزلزلة: ١) واتە:﴿ کاتێك زەوی دەهێنرێتە لەرزەو بومەلەرزە زۆر بەهێزەکەی بۆ پێش دێت﴾وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

---

[11] اخرجه: احمد (٣/٧)، والحميدي (٧٥٤)، والطبراني في ((الكبير)) (١٢٦٧٠)، والترمذي (٢٤٣١)، (٣٢٤٣) وقال: حسن، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذى)) (١٩٨٠)، و (٢٥٨٥)، وابن حبان (٨٢٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وقال ابن كثير في ((تفسير القرآن العظيم)) (٦١٢/١): اسناده جيد، وصححه الشيخ الألباني ايضاً في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٠٧٩)، وأخرجه أيضا: اللالكائي: ((شرح أعتقاد أهل السنة و الجماعة)) (رقم:٢١٨٥)، وحسنه الحافظ في ((الفتح)) (٣٦٨/١).

[12] اخرجه: الحاكم (٥٥٩/٤) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن أبي الدنيا ((الأهوال))(٥١) وقال محققه: حديث حسن، وقال الحافظ العراقي في تخريجه على ((الاحياء)) (٤٩٦/٤): اخرجه أبو الشيخ ((العظمة)) بإسناد جيد، وصححه الشيخ الالباني على شرط مسلم في ((مختصر العلو))(ص:٩٣)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٠٧٨).

﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴾( المزمل: ١٤). واتە: ﴿لە ڕۆژێکدا زەوی و کێوەکان دێنە لەرزە، سەر ئەنجام کێوەکان وردوخاش دەبن و وەك تەپۆڵکەی لمیان لێ دێت﴾.

لە ڕیوایەتێکی تردا سەمورە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لاتقوم الساعة حتى تزول الجبال عن أماكنها وترون الامور العظام التي لم تكونوا ترونها [ ثم على أثر ذلك يكون القبضُ])) [١٣] واتە: (قیامەت نایەتە پێش تا دەبینن چیاکان لە جێگاکانی خۆیاندا نەماون، وەچەندەها کاری گەورەتر دەبینن کە لەپێشتردا نەبووە و نەتان بینیوە و بەدوای ئەودا مردنی یەکجارەکی دێت). وهەموو ئەوانەی نێوان ئاسمانەکان و زەوی دەتۆقێنێ. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ ﴾( النمل: ٨٧) واتە: ﴿لە ڕۆژێکدا کە فوو دەکرێت بە صوردا هەر کەس لە ئاسمان و زەویەکاندایە ترس و بیمێکی زۆر دایان دەگرێت، جگە لەوانەی کە ویستی خوا وایە ترس دایان نەگرێت، وە هەموو بە ملکەچی و ناچاری دێن﴾. وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴾(الزمر: ٦٨). واتە: ﴿لەو ڕۆژەدا فوو دەکرێت بە صوردا هیچ دروست کراوێکی خوا لە ئاسمانەکان و زەوی دا نامێنێت و هەموو دەمرن، تەنها ئەوانە نەبێت کە خوای گەورە نایەوێت بیان مرێنێت، لەوەودوا فوویەکی تری پیادا دەکرێت جا دەست بەجێ هەر هەموو خەڵکی هەستاونەتە سەر پێ و بەسەرسامیەوە چاوەڕوانن﴾.

ئیبنو مەسعود (ﷺ) ڕوونی دەکاتەوە کەچۆن ئەو مەلائیکەتە فوو دەکات بەو (صور)ەدا وە دەفەرموێت: ((... ثُمَ يقومُ مَلَكُ الصور بين السَماء والارض فَينفخُ فيه، والصور القرن فلا يبقى خلقٌ في السّماواتِ ولافي الارض إلاّ ماتَ، إلا مَنْ شاء رَبُك ...))[١٤]، (واتە:... ئەنجا مەلائیکەی خاوەن (صور) دەوەستێت لە نێوان ئاسمان و زەویدا وفووی

---

[١٣] أخرجه: الطبراني (٦٨٥٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٣٠٦٢) و الزيادة لابن حبان (٢٨٥٢)، وابن خزيمة (١٣٩٧)، و الحاكم (٣٢٩/١)، والطبراني (٣٢٥/٧).

[١٤] اخرجه: البيهقي بسند قوي، كما قال الحافظ ابن حجر العسقلاني في ((فتح الباري)) (٣٧٠/١١).

پیادەکات، وە(صور)یش وەك شاخی ئاژەڵە و هیچ دروست کراوێکی خوا لە ئاسمانەکان و زەوی دا نامێنێت و هەموو دەمرن تەنها ئەوانە نەبێتکە خوای گەورە نایەوێت بیان مرێنێت).

پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانە کێن کە خوای گەورە جیای کردوونەتەوە و نایان مرێنێت لەکاتی فووکردن بە (صور)دا، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی:((هُمْ الشُهداء))[١٥]واتە: (ئەوانە شەهیدەکانن).

وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((للشهید عند الله سِتُ خصال: .... ویأمَنْ مِنْ الفزع الاكبَرْ))[١٦] واتە:(شەهید لای خوا شەش خەصلەتی هەیە:...... وە بێ باك دەبێت لە ترسی هەرە گەورە ( مەبەست لە فووکردن بە (صور)دایە )) .

وە هەروەها ئەوانەی کە لە پاسەوانیدا لە پێناوی خوادا مردوون ئەوانەش بێ باکن لەوترسە گەورە . وەك ئەبو درداء (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:((مَنْ ماتَ مُرابِطاً في سبيل اللهِ أمِنَمِن الفزعِ الأكبر ...))[١٧] واتە:(هەر کەسێك لەکاتی پاسەوانی لە پێناوی خوادا بمرێت، ئەو کەسە بێ باك و دوور دەبێت لەترسی هەرە گەورە .....) .

وە ئیمام ئەحمەد (رحمه الله) وەك ئیبن و تەیمیە (رحمه الله) لێوەی دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((... بأنَّهُم اهلُ الجَنَّة: الحُور والولدان وخزنةُ جَهَّنَم))[١٨]. واتە:(ئەوانە حۆریەکان و خزمەتکارانی ناو بەهەشتن لەگەڵ فریشتەکانی لێپرسراوای جەهەننەم (ئەمانەن کە خوای گەورە بەو فووکردنە نایان مرێنێت).

---

[١٥] اخرجه: الحاكم (٢/٢٥٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب)) (١٣٤٥).

[١٦] اخرجه: الترمذي (١٦٦٣) وقال: حسنٌ صحيح غريب، وابن ماجة (٢٧٩٩)، وصححه الشيخ الالباني في ((المشكاة)) (٣٨٣٤)، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٧٤٧)، وفي ((صحيح ابن ماجة)) (٢٢٥٧).

[١٧] اخرجه: الطبراني في ((المعجم الكبير)) (٧٤٨٠) بلفظ: ((من فتنة القبر))، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٣٤٧٩).

[١٨] أنظر: ((الفتاوى الكبرى)) لابن تيمية (٦/٣٧١).

# یەکەم کەس کە گوێ ی لە فووکردن بە (صور)دا دەبێت

یەکەم کەس گوێی لە دەنگی (صور) دەبێت پیاوێکە کە حەوزی ئاوی وشترەکەی سواغ دەدات و چاکی دەکات. عەبدولاَی کوڕی عومەر (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:((... ثُمَ يَنفُخ في الصور فَلا يَسمَعهُ احدٌ الا اصغى لِيَتا واول مَنْ يَسمعهُ رَجلٌ يَلوط حوضَ إبلِهِ))[19] واتە: (.... ئەنجا فوو دەکرێت بەصوردا و هەر کەسێ گوێی لێ بێت بەلادا دەکەوێت، یەکەم کەسیش کە گوێی لێدەبێت پیاوێکە حەوزی ئاوی وشترەکەی سواغ دەدات).لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((ولَتقومَنّ الساعة وَقَد نشر الرَّجلان ثُوبَهُما بَيْنَهُما فلا يَتَبايعانهِولا يطويانهِ،... ولَتقومَنّ الساعةُ وَقَدْ رَفَعَ أكلَتَه الى فيهِ فلا يُطعِمُها ... ))[20] واتە: (ڕۆژی کۆتایی بەرپا دەبێت لەو کاتەدا دوو پیاو بەرگ و پۆشاکیان بلاَوکردۆتەوە بۆ کڕین و فرۆشتن لە نێوانیاندا، نەفریای کڕینی دەکەون ونەفریا فرۆشتنی..، وە ڕۆژی کۆتایی بەرپا دەبێت وکەسی وا هەیە پاروە نانەکەی بەرز کردوەتەوە بۆ دەمی وفریای ناکەوێت بیخوات....). وە هەروەها کاتێك بەرپا دەبێت کە کەسانی تر دەمەقاڵیانە لەناو یەکتردا و فریای دەمەقاڵەکەیان ناکەون، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَا إِلَىٰ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾ (يس: ٤٩ – ٥٠). واتە:﴿ئەوانە تەنها چاوەڕێی یەك شریخە و دەنگێکی زۆر گەورەی سامناك دەکەن و لەناویان دەبات لەکاتێکدا کەسەر گەرمی کار و باری دونیای خۆیانن، ئەوسا ئیتر نەدەتوانن ڕاسپاردەیەك بگەیەنن، وەنە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان﴾.

---

[19] اخرجه: مسلم (٢٩٤٠).

[20] اخرجه: البخاري كما في ((فتح الباري)) (٣٥٢/١١).

# ئەو گۆڕانکاریانەی کە ڕوو دەدات لەئاسمانەکان و زەویدا لەدوای فووکردنی یەکەم بە (صور)دا

خوای گەورە ئەو گۆڕانکاریانەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە لە قورئانی پیرۆزدا لەسێ سورەتدا . ئیبن و عومەر (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مَنْ سَرّه أَنْ يُنظَرَ إلى يَوم القيامَـة كأنَّـهُ رأي عـينٍ، فَلْيقـرأ: أذا الشـمس كُـورَتْ، وإذا السـماءُ انفطـرت، وإذا السَّـماءُ انشـقت))[21]. واتـە:( هـەر کەسێ پـێی خۆشـە تەماشـای ڕۆژی کۆتـایی بکـات وەك بەچـاو بیبینێـت بـا ئـەم سـورەتانە بخوێنێتـەوە:﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴾ (التكوير: ١) ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ﴾( الانفطار: ١) ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴾( الانشقاق: ١) .

سـەرەتا ڕۆژ دەکوژێتـەوە و ڕوونـاکی نامێنێـت وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴾( التكوير: ١). وە ئەبو هورەیرە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: ((... تاتيهم الساعة كأنها قطع الليـل المظلـم.... ))[22] . واتـە: (قیامەتیان لـێ دێتـە پێش وەك بەشـەکانی شـەوێکی تاریـك وایـە (واتـە: وردە وردە ڕۆژ ڕوونـاکی نامێنێت و ئاوا دەبێت و تاریکی بەسەر هەموو زەویدا دێت)).

هێـزی ڕاکێشـانی ئەسـتێرەکان لـە ئاسمانـدا نامێنێـت، ئـەنجا شـیرازەی ڕێـڕەوی ئەسـتێرەکان تێـك دەچـێت و کـەرت دەبـن وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ﴾( التكوير: ٢)پاشان ئەستێرەکان دەتەقنەوە و پارچە پارچە دەبن بەئاسماندا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ﴾( الانفطار: ٢)، پاشان ون دەبن ونابینرێن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ﴾ (المرسلات: ٨). بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((النجومُ أمنَةُ السَماء فإذا ذهبتْ النجومُ أتَـتْ السـماءُ مـا

---

[21] اخرجه: احمد (٢٧/٢)، والحاكم (٥٧١/٤) وصححه ووافقه الذهبي، والترمذي (٣٣٣٣) وقال: حديث حسن غريب، و قال ابن حجر العسقلاني في ((فتح الباري)) (٦٩٥/٨): حديث جيد، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الترمـذي)) (٢٦٥١)، و((صحيح الجامع))(٦١٩١)،و صححه الشيخ عبدالقادر الأرناؤوط أيضا في ((الإذاعة)) (ص:٨).

[22] أخرجـه: البخـاري ((التـأريخ)) (٢٨٤/١)، وابـن عسـاكر ((التـاريخ)) (٥٢٨/١) وصـححه الشـخ الألبـاني في ((الصحيحة)) (٣٤٢٥).

ئُوعدون)) [٢٣] واتـە: (ئەستێرەكان نیشانەی ئارامی ئاسمانن هـەر كاتێك ئەستێرەكان نەمان، ئەو هەڕەشانەتان پێ دەگات و ئاسمان ئەوانەی بەسەردا دێت كەبەڵێنتان پێ دراوە).

## بەرپا بوونی ڕۆژی كۆتایی

سەرەتا شاخەكان بەسـەر زەوی یـەوە نامێنن و دەتەقێنرێنـەوە وەك خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴾( طـه: ١٠٥) واتـە: ﴿پرسـیارت لـێ دەكەن (مەبەست لە پێغەمبەرﷺ) دەربارەی كێوەكان، تۆش پێیـان بڵـێ: پـەروەردگارم هەڵیان دەتەكێنێت و وردوخاشیان دەكات﴾. وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ﴾(التكوير: ٣) واتە:﴿كاتێك كێوەكان لە شوێنی خۆیان هەڵ دەكەنرێن و بەملاولادا دەبرێن﴾، و بەشێوەك دەتەقێنرێنەوە كە ئەو بەردە ڕەقە گەورانە دەبنـە لمێكـی داكراو وەك خوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴾ (المزمل: ١٤) .دیمەنی پارچەی شاخەكان كە تەقێنراونەتـەوە تێكـەڵ بەیـەك دەبن وەك خوری یـەكی شـیكراوەی ڕەنگـاو ڕەنـگ دەنوێنرێـت وەك خـوای گـەوره دەفـەرموێت: ﴿ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴾ (القارعـة: ٥)، دواترشـاخەكان نـامێنن كـە وەك مێخێك دانـرا بـوون بـۆ ڕاگیر كـردن و هاوسـەنگی كردنـی گـۆی زەوی ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴾ (النبـأ: ٧) پاشـان زەوی لەتـەوەرەی خـۆی دەردەچـێت وبومەلـەرزەی گـەورەی لـێ دەكەوێتـــەوە وەك دەفــــەرموێت: ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴾ (الزلزلـــــة: ١) ﴿ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴾ (الواقعة: ٤) ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴾( المزمل: ١٤).

پاشان ئاوی دەریاكانی سەرگۆی زەوی هەمووی دەتەقێنرێتەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴾ (الانفطار: ٣)، ئینجا گڕ دەگرێت و دەسوتێت و كڵپە دەكات وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴾ (التكوير: ٦) . پاشان هیچ مشتە ئاوێك لەسەر زەویدا نامێنێت و دەگەڕێتەوە سەر پێكهاتەكەی یەكەمجاری كە لە

---

[٢٣] اخرجە: أحمد (٢/٣٩٨)، و مسلم (٣١٢٥).

دووگەردیلە هایدرۆجین و یەك گەردیلە ئۆکسجین پێك هاتووە. ئەم دوو گازەش یەکێکیان سوتێنەرە و ئەوی تریان یارمەتی سوتان دەدات. بۆیە عەبدولڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەفەرموێت:((یوشك ان تطلبوا في قراكم هذه طستاً من ماءٍ فلا تجدونهُ، ينزوى كل ماءٍ الى عنصُرهِ فيكون في الشام بقيَّة المؤمنين والماء))[٢٤] واتە: (نزیکە لە هەموو لادێ کاندا بەدوای تەشتێك ئاودا بگەڕێن ودەستتان نەکەوێت چونکە هەموو شتێك دەگەڕێتەوە سەر پێکهاتەی یەکەمجاری. لەو کاتەشدا پاشماوەی ئاو لەگەڵ بڕواداران تەنها لە شام دەبێت).

وە لەڕیوایەتێکی تردا عەبدولڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەفەرموێت: ((ليأتين على الفرات يوماً و لوطلب فيه طست من ماء لم يوجد يرجع كل ماء الى عنصره وبقية الماء و المؤمنون بالشام))[٢٥] واتە:(ڕۆژێك دێت بەسەر ئاوی فوراتدا گەر بگەڕێن تیایدا بەدوای تەشتێك ئاودا دەست ناکەوێت چونکە هەموو ئاوەکان دەگەڕێتەوە سەر پێك هاتەکەی یەکەمجاریان و لەوکاتەدا پاشماوەی ئاو وبڕواداران تەنها لە شام دەبێت). وە ئاسمانەکانیش گۆڕانکارییان بەسەردا دێت و کەرت کەرت دەبن و لاواز دەبن و سوور هەڵ دەگەڕێن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ﴾ (الحاقة: ١٦) و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾ (الانفطار: ١) و ﴿فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ﴾ (الرحمن: ٣٧) واتە:﴿سور هەڵ دەگەڕێن وەك پێستێکی سوور یاخود وەك ڕۆنێکی پاڵفتەی سوورباو﴾ .

---

[٢٤] أخرجه: الحاكم (٥٠٤/٤) وصححه و وافقه الذهبي، و قال الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٣٠٧٨): اسناده صحيح. وهوموقوف في حكم المرفوع.

[٢٥] أخرجه: نعيم بن حماد ((الفتن))(١٨٣٠) وقال محققه: اسناده حسن.

# فووکردنی دووەم بە (صور)دا

فووکردن بە (صور)دا دووجار دەبێت، یەکەم جاریان ترسان و تۆقان و مردنە وە دووەم جار یش بۆ زیندووبونەوەی لاشەکانە . وەك خوای گەورە دەفەرمویت ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ (الزمر: ٦٨ )

لە نێوان فووی یەکەم و دووەمدا (چل)ە . وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: [((ما بين النفختين أربعون)) قالوا: يا أبا هريرة أربعون يوماً ؟ قالَ: أَبَيْتُ، قالوا: أربعون شهراً ؟ قالَ: أَبَيْتُ، قالوا: أربعون عاماً ؟ قالَ: أَبَيْتُ][٢٦]واتە [((لە نێوان فووی یەکەم و دووەمدا (چل)ە )) وتیان: ئەبو هورەیرە چل ڕۆژە؟ منیش بێ دەنگ بووم وتیان: چل مانگە؟ منیش بێ دەنگ بووم، وتیان چل ساڵە؟ منیش بێ دەنگ بووم].

زانای پایە بەرز ابن كثير (رحمه الله) دەفەرمویت: "... ويَقبِضُ الله جميع الأرواحِ ويكُونُ آخرهُم إسرافيل" [٢٧] . واتە: (... خوای گەورە ڕۆحی هەموو ڕۆح لەبەران دەکێشێت و کۆتاییشیان ئیسرافیل دەبێت)، لەڕیوایەتێکی تردا ئەنەس (ﷺ) دەفەرمویت: ((... ثم يموت جبريل و ميكائيل و إسرافيل و ملك الموت فيمكث الخلائق موتى ما بين النفختين اربعون عاما))[٢٨]. واتە:(......دواتر جیبریل و میکائیل و ئیسرافیل و مەلائیکەی مردن دەمرن و هەموو بونەوەرەکان بە مردوویی دەمێننەوە چل ساڵ) .پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرفەمویت: ((ثُمَّ ينزل الله إلى السماء الدُنيا فينادي لِمن المُلك اليوم: للهِ الواحدِ القَهّار))[٢٩].

---

[٢٦] أخرجه: مسلم (٢٩٥٠).

[٢٧] انظر: ((تفسير القرآن العظيم)) لابن كثير (١٧٢/٥).

[٢٨] أخرجه: أحمد (٢٦٦/٣) (١٣٨١٤) وقال محققه: اسناده حسن. و أبو يعلى (٤٠٤١) واللفظ له، و الدينوري في((المجالسة)) (٢٧٥٩) و قال محققه: رجاله ثقات.

[٢٩] اخرجه: الحاكم (٤٣٧/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في ((مختصر العلو)) (٩٤).

واتە: (پاشان خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا و بانگ دەکات ئەمڕۆ موڵك هی کێیە ؟! هی خوای تاك و تەنهای بەدەسەڵاتە).

خوای گەورە ئیسرافیل زیندوو دەکاتەوە و (صور)ەکەی دەداتە دەست و فەرمانی پێ دەکات کە فووی دووەمی پیادا بکات تا گیانلەبەران زیندوو بکاتەوە .

عەبدولاّی کوڕی عەباس (ﷺ) دەفەرموێت: [﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾ (المؤمنون: ١٠١) فهذا في النفخة الاولى ينفخ في الصور فيصعق مَن في السماواتومَن في الارض الا من شاء الله فلا أنساب بينهم يومئذ ولايتسألون ثم اذا كانت النفخة الاخرى قاموا فاقبل بعضهم على بعض يتسألون ][٣٠]. واتە: (مەبەستی ئەو ئایەتە پیرۆزە ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾ لێرەدا فوکردنی یەکەمە کە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن دەمرن، تەنها ئەوانەی خوای گەورە نایەوێت بیان مرێنێت لەو کاتەدا هیچ نەژادو ڕەچەڵەکێك نامێنێت و کەس پرسیار لە کەس ناکات، بەلاّم دوای فووکردنی دووەم هەموو لە گۆڕەکان هەڵدەستن و ڕوودەکەنەیەك و پرسیار لەیەك دەکەن.

## چۆنیەتی زیندووبونەوە

لە ئەبو ڕەزینی عەقیلیەوە(ﷺ) فەرموویەتی:((قال: قلت: يا رسول الله كيف يحي الله الموتى ؟ قال: ((أما مررت بواد ممحل، ثم مررت به خضرا ؟)) قال: بلى، قال: ((كذلك يحي الله الموتى))[٣١]. واتە: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) پرسی: خوای بالاّدەست چۆن مردووەکان زیندوو دەکاتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: ئایا بە دوّڵێکی وشك دا تێپەڕ بوویت، دواتر بە سەوزی پیایدا تێپەڕ بووبیت ؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: بەو شێوەیەش خوای گەورە مردووەکان زیندوو دەکاتەوە، ئەنەس (ﷺ) فەرمووی: ((تبعث الخلائق يوم

---

[٣٠] أخرجه: الخطيب البغدادي ((صحيح الفقية والمتفقة)) (٨٠) موصولاً رواهُ البخاري تعليقاً، وقال محققه: اسناده حسن، وابن منده ((التوحيد)) (١-١٩).

[٣١] أخرجه: أبو داود الطيالسي باسناد صحيح كما قال البوصيري في: ((إتحاف الخيرة المهرة)) (برقم: ١٠٠٢٨).

القيامة وإن السماء لتطش بالمطر...))[٣٢] واتە: (لە ڕۆژی کۆتاییدا بوونەوەرەکان زیندوو دەکرێنەوە و بارانی ئاسمان بە لێزمە دەبارێت بەسەریاندا...).

زیندوو بوونەوە تەنها بۆ لاشەیە چونکە ڕۆحی خاوەن باوەڕ لە بەهەشت دەبێت و ڕۆحی بێ بڕواش لەدۆزەخ. کەعبی کوڕی مالیك (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((نَسَمةُ المؤمِنِ طائِرٌ يَعَلَقُ في شَجَرِ الجَنَّةِ حتى يَرُدَّها [في رواية: يبعثها]الله الى جَسَدِهِ يوم القيامة))[٣٣] واتە: ( ڕۆحی خاوەن باوەڕ باڵندەیەکە دەخوات و دەنۆشێت لە درەختەکانی بەهەشت هەتا خوای گەورە دەیگێڕێتەوە بۆ لای لاشەکەی (لەڕیوایەتێکدا:بۆ ناو لاشەکەی کەزیندووی دەکاتەوە) لەڕۆژی کۆتاییدا ). دواتر خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت وەك شەونم، عەبدولڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ثُمَ يُنفَخَ في الصورفلا يسْمَعُهُ أحدٌ إلاّ أصغى، ثُمَ لايَبقى أحَدٌ إلاّ صُعِقَ، ثُمَ يُرسِلُ اللّهِ مطراً [ماء الحياة] كأنَهُ الطَلُّ (الندى) أو الظِّلُّ (نعمان الشاك) [فَتَنْبُتُ مِنهُ أجسَادُ النّاسِ] فَيَنبتُونَ كما يَنبُتُ البَقلُ [و في رواية ابن أبي عاصم: حتّى إذا خرجت الأجسادُ أرسلَ الله الأرواح، وكانَ كلُّ روحٍ أسرعَ إلى صاحِبِهِ مِنَ الطَرفِ، ثمَّ يُنفَخُ في الصور ﴿ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴾ (الزمر:٦٨) وَليسَ مِن الإنسانِ شيءٌ إلاّ يُبلى إلاّ عَظماً واحِداً وَهُوَ عَجْبُ الذَنَب][٣٤] منه خلق ومِنهُ يُرَكَّبُ الخَلق يَوْمَ القيامة))[٣٥].واتە: (پاشان فوو دەکرێت بە (صور)داو هەموو کەسێك گوێی لێ دەبێت نامێنێت و

[٣٢] أخرجه: أحمد (٢٦٦/٣) (١٣٨١٤) وقال محققه: اسناه حسن. و أبو يعلى (٤٠٤١)، و الدينوري في: ((المجالسة)) (٢٧٥٩) و قال محققه: رجاله ثقات.

[٣٣] اخرجه: احمد (٤٥٥/٣)، والنسائي (٢٩٢/١)، وابن ماجة (٤٢٧١)، وابن حبان (٤٦٥٧) وقال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((المشكاة)) (١٦٣٢)، وفي ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٤٦)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٩٩٥).

[٣٤] وفي رواية: [((... الاعجب الذَنَبْ)) قيل: ومامثله يارسول الله ؟ قال: ((مثلُ حبة خَردلٍ منه تُنبتون))] اخرجه:احمد (٢٨/٣) (١١٢٣٠) و قال محققه الشيخ الأرناؤوط: حديث حسن لغيره، وابن حبان (٣١٤٠)، وأبويعلى (١٣٢٨)، والحاكم (٦٠٩/٤) وصححه و وافقه الذهبي، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٢٣٢/١٠): رواه احمد و إسناده حسن،و ضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف الترغيب)) (٢٠٨٠).

[٣٥] اخرجه: احمد (١٦٦/٢)، ومسلم (٢٩٤٠)، وابن حبان (٣١٣٨) وقال الشيخ الارناؤوط: اسناده صحيح على شرط مسلم، واللفظ لابن حبان، واخرجهابن ابي عاصم ((السنة)) (٨٩١) وقال محققه الشيخ الالباني: اسناده جيد.

دەمرێت، دواتر خوای گەورە بارانێك دەنێرێت ودەبارێت وەك شەونم ( لاشەی خەڵکانی پێ دەڕوێنێتەوە) و لاشەکانیان زیندوو دەکاتەوە وەك چۆن پاقلە دەڕوێت [لە ڕیوایەتی ئیبن ئەبی عاسیم دا: کاتێ لاشەکان دێنە دەرێ خوای گەورە ڕۆحەکان دەنێرێت وهەموو ڕۆحێك لە چاو تروکانێکدا خێرا تر دەگاتە لای جەستەکەی،دواتر فوو دەکرێت بە (صور) دا .و هەموو شوێنێکی لاشەی ئادەمیزاد دەفەوتێت، تەنها یەك ئێسك نەبێت ئەویش لە (کلێنچەیە)] لەوێوە دروست کراوە و هەر لەوێشەوە زیندەوەران دروست دەکرێنەوە لەڕۆژی کۆتاییدا .

هەموو لاشەکان دروست دەکرێنەوە تەنها لاشەی پێغەمبەران نەبێت، چونکە خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بخوات و بیفەوتێنێت وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت ((إنَّ الله حَرَّمعلي الأرض أن تأكُل أجساد الأنبياء))[٣٦] .

پاشان زەوی ڕادەکێشرێت و ئەوەی لەناوسکی دابێت فڕێی دەداتە دەرەوە، ئەویش لاشەی مردووانە وکانزاکانی ترە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴾ (الانشقاق: ٣ - ٤) .واتە: ﴿کاتێك زەوی درێژ دەکرێتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا و لاشەی مردووانی تیا دەردەکرێت﴾ وەك ئیبن و عەباس ڕوونی کردوەتەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا (بڕوانە کتێبی (المستدرك)ی ئیمام حاکم (٥١٨/٢)، وە حاکم و زەهەبی دەفەرمون ئەم ڕیوایەتە (صحیح)ە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴾(یس: ٥١). واتە:﴿زیندەوەران لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە و بەپێوە دەوەستن و تەماشادەکەن﴾ وە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴾ (المعارج: ٤٣ )

---

[٣٦] اخرخه: احمد (٨/٤)، واسناده صحيح كما في ((زاد المعاد)) (٣٦٥/١) تحقيق الشيخ الأرناؤوط، وابن حبان (٥٥٠)، وابو داود (١٠٤٧)، والنسائي (٩١/٣)، وابن ماجه (١٠٨٥)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح ابن ماجه)) (١٣٢٦)، و((صحيح ابي داود)) (٩٢٥)،والحاكم (٢٧٨/١) صححه على شرط البخاري و وافقه الذهبي، وابن خزيمة (١٧٣٣)، والبيهقي في ((السنن الصغرى)) (٥٣٩) وقال محققه: رجاله ثقات، والبيهقي في ((السنن الكبرى))(٢٤٨/٣)، وصححه الإمام النووي في ((الأذكار)) (ص: ٣٩٨)، وقال المنذري في ((الترغيب)) (٣٠٢/٣): إسناده جيد.

واتە:﴿ئەو ڕۆژە بەپەلە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە وەك چۆن بۆلای بت و پەرستراوەکانیان ڕایان دەکرد﴾، ئنجا بانگیان لیّ دەکرێت کە بەرەو مەیدانی مەحشەر بۆلای خوای خۆیان بڕۆن. وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویێت: (( ... ثمَ نُفِخَ فِيهِ أُخرى فَإذا هُمْ قِيامٌ يَنْظرونَ، ثُمَ يُقال: يا أيّها الناسُ هَلُمَّ إلى رَبكم، وقفِوُهُمْ إنَّهُمْ مسؤلون))[٣٧] واتە: (ئنجا فووی دووەمی پێدا دەکرێت و هەموو هەڵدەستن و تەماشا دەکەن، پاشان دەوترێت: هۆ خەڵکینە وەرن بۆلای خوای خۆتان، بیان وەستێنن!! ئەوانە بەرپرسیارن وە هەمووان زۆر خێرا دەڕۆن لەو ڕێ ڕۆیشتنەدا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (ينسلون)). بێباوەڕان کە باوەڕیان بەزیندوو بوونەوە نەبووە لەو ڕۆژەدا زیندوو دەکرێنەوە و دەڵێن: هاوار بۆ ئێمە کێ ئێمەی زیندوو کردەوە لە گۆڕەکانماندا ئا ئەمە پەیمانی خوا بوو بەڕاستی پێغەمبەران ڕاستیان کرد، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴾(يس: ٥٢) .

هەموو ئادەمیزادێك لەسەر بیرو باوەڕی خۆی زیندوو دەکرێتەوە وەك جابر (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يُبْعَثُ كلُ عبدٍ على ما مات عليه [المؤمن على إيمانهِ والمنافِقُ على نِفاقهِ]))[٣٨] واتە:(هەمووو بەندەیەك زیندوو دەکرێتەوە لەسەر ئەو بیرو باوەڕەی کە لەسەری مردووە لەناو گۆڕدا (خاوەن باوەڕ لەسەر باوەڕی خۆی ودووڕوو لەسەر دووڕوویی خۆی). هەموو بەندەیەك زیندوو دەکرێتەوە لە سەر ئەو کارەی کە ئەنجامی داوە پێش مردنی، لە ئەبی سەعیدەوەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت ((المَيتُ يُبعَثُ في ثيابهِ التي قُبِضَ فيها))[٣٩].
واتە:هەموو مردوویەك زیندوو دەکرێتەوە لەو پۆشاکەی کە ڕۆحی تیا کێشراوە .

---

[٣٧] أخرجه: مسلم (٢٩٤٠).

[٣٨] اخرجه: احمد (٣٤٦/٣) رقم (١٤٧٢٢) وقال محققه الأرناؤوط: حديث صحيح، وعبدالله بن احمد في ((السنة)) (١٤٥٠) وقال محققه: في اسناده ابن لهيعة، و ابن أبي عاصم ((السنة)) (٨٦٥) و قال محققه الشيخ الالباني: صحيح، والحاكم (٤٥٢/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٣١٣) وقال محققه: اسناده قوى.

[٣٩] اخرجه: ابوداود (٣١١٤)، والحاكم (٣٤/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، والبيهقي (٣٨٤/٣)، وابن حبان (٧٣١٦) وقال محققه: اسناده على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني في ((المشكاة)) (١٦٤٠).

ئەم فەرموودەیە بە (لفظ)ی (الأكفان)یش هاتووە:((... فَإنَّهُمْ يُبْعَثُونَ في أكفانِهم و يَتَزَاوَرُون في اكفانهم))[40]. واتە: (.. ئەوانە زیندوو دەکرێنەوە لەکفنەکانیاندا و سەردانی یەکتر دەکەن بەکفنەکانیانەوە) . موعاذە وابن عەباس(رضي الله عنهما) دەفەرمون:((حسنُّوا أكفانَ موتاكم فإنَّهُمْ يُحْشَرونَ فيها ...))[41] واتە: (کفنی مردووەکانتان با چاك بێت چونکە تیایدا حەشر دەکرێن....). بەرگ و کفن لەم فەرموودانەدا مەبەست ئایین و بیرو باوەڕی ئادەمیزادە (الله اعلم) وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾ (المدثر: ٤) . واتە: ﴿بیروباوەڕەکەت خاوێن کەو با دوور لە هاوتا بڕیاردان بێت بۆ خوای گەورە﴾وە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ....وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ .... ﴾( الأعراف: ٢٦). واتە: ﴿پۆشاکی لەخواترسی چاکترە. ...﴾.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((انما يُبعثُ [يُحْشَرُ] الناس على نياتهم))[42]. واتە: (خەڵکان زیندوو دەکرێنەوە و(کۆدەکرێنەوە) لەسەر نیەتەکانیان). ئادەمیزاد زیندوو دەکرێتەوە لەسەر پلەی ئەو کارەی کە ئەنجامی داوە لە ژیانی دنیادا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَنْ ماتَ على مرتبةٍ مِنْ هذهِ المراتب بُعِثَ عَليها يوم القيامة يعنى الغزو والحج))[43]. واتە: (هەر کەسێك لەسەر پلەیەك لەم پلانە مردبێت هەر لەسەر ئەوانە زیندوو دەکرێتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا (واتە: غەزاو حەج)). ئیبن عەباس (رضي الله عنه) دەفەرموێت: [((انَّ رجلاً مُحرِماً [كان])) [44] مع النبي (ﷺ) بِعَرَفَة اذْ وقع عن راحلتهِ فوقَصَتهُ فقال رسول الله (ﷺ): ((اِغْسِلوهُ بِماءٍ وسدِرٍ وَكَفّنُوه في ثوبَين ... ولا تخمروا رأسهُ فانَّ الله يَبْعَثُه

---

[40] أخرجه: الخطيب ((التاريخ بغداد)) (٩/٨٠)، والبيهقي، و صححه السيوطي في ((اللالئ المنثورة)) (٢/٤٤١)، وحسنه الاحدب في ((زوائد تاريخ بغداد)) (رقم:٥٢٨)، وحسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٢٥)، وفي ((صحيح الجامع)) (٨٤٥).

[41] اخرجه: ابن ابي الدنيا ((الأهوال)) (١٠٨) (١٠٩)، وحَسّنَ إسناده الشيخ الارناوؤط في تحقيقه على ابن حبان (٣٠٩/١٦).

[42] اخرجه: ابن ماجة (٤٢٢٩)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٢٩٥٩)، وفي ((السلسلة الصحيح)) (٢٩٤).

[43] اخرجه: الحاكم (٣٤٠/١) وصحّحه الذهبي على شرطهما، وقال الشيخ الالباني ((السلسلة الصحيحة)) (٥٥٠/١): اسناده جيّد.

[44] في رواية اخرى.

يَومَ القيامَةِ مُلبيّاً))][٤٥] .واته: (پیاوێك لەکاتی حەجدا بەرگی ئیحرامی پۆشی بوو له عەرەفاتدا ولەگەڵ پێغەمبەری خوادا وەستابوو، لەسەر حوشترەکەیەوە کەوتە خوارەوە و ملی شکاو مرد، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((بیشۆن بەئاو و سدر (واته:ڕووەکێکی کەفداری بۆن خۆشه) و دوو بەرگ بکەن بەکفنی ......وە سەری دامەپۆشن چونکە خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا بەدەم (لَبيكَ اللهمَ لبيك)، کەلەسەری مردبوو). وەجابری کوڕی عەبدولاّ (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من مات على شيء بعثه الله عليه)) [٤٦]واته: هەر کەسێك لەسەر هەر شتێك بمرێت هەر لەسەر ئەوە خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە). خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ .... ﴾ (البقرة: ٢٧٥)

واته: ﴿ ئەوانەی سوو خۆرن هەڵناسنەوە مەگەر وەك ئەوکەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندووە (واته: وەك شێتێك هەڵدەستنەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا) ﴾.

ئیبن و عەباس (ﷺ) دەفەرموێت: ((...آكِلُ الرّبا يُبعَثُ يَومَ القيامةِ مجنوناً يُخنَق))[٤٧]. واته: (.... سووخۆر زیندوو دەکرێتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا وەك شێتێکی فێدار کە دەستی لێ وەشێنرابێت). بەپێچەوانەی خاوەن باوەڕی خوا ویست کە لە ڕۆژی کۆتاییدا زیندوو دەکرێتەوە و بێ ترس و بێ باکە ودوو مەلائیکەکەی کە لەدونیادا لەگەڵیدابوون مژدەی دەدەنێ و دڵخۆشی دەکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾( فصلت: ٣٠ ) .

---

[٤٥] اخرجه: احمد (١/٢١٥)، والبخاري (١٨٥٠)، ومسلم (١٢٠٦)، والترمذي (٩٥١)، وابوداود (٣٢٣٨)، والبيهقي (٣/٣٩٢)، وابن ماجة (٣٠٨٤)، والنسائي (١/٢٦٩)، والدارمي (٢/٤٩).

[٤٦] اخرجه: الحاكم (٤/٣١٣) و صححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٨٣).

[٤٧] انظر: ((تفسير القرآن العظيم)) لابن كثير (١/٤٦٩) وقد ورد مرفوعاً بلفظ: ((.... فمن اكل الربا بُعث يوم القيامة مجنوناً يتخبط)). أخرجه: الطبراني (١٨/٦٠/١٠٠)، والخطيب ((التاريخ)) (٨/١٧٨) وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٣٣١٣). وقد روي عن عبد الله بن عمرو بن العاص (ﷺ)أنه قال: ((يجيء يوم القيامة شارب الخمر مسوداً وجهه مزرقة عيناه مائلٌ شقة مدلياً لسانه يسيل لعابه على صورةٍ يقذره كل من يراه)) أخرجه: عبد الرزاق ((المصنف)) (١٧٠٧٤)..

((قال ثابت البناني: بلغنا ان المؤمن حيث يبعثه الله من قبره، يتلقاه ملكاه اللذان كانا معه في الدنيا، فيقولان له، لاتخف ولاتحزن، فيؤمِن الله خوفه، ويقر الله عينه، فما من عظيمه تغشى الناس يوم القيامة الاهي للمؤمن قرة عين لما هداه الله له، ولما كان يعمل في الدنيا)) [٤٨]. واتە:تابعی پایه بەرز(ثابت البناني) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمویت:[پیمان گەیشتووه، خاوەن باوەڕ كاتیك كه خوای گەوره زیندووی دەكاتەوه دوو مەلائیكەكەی كه لەدونیادا لەگەڵیدا بوون پێی دەگەن و پێی دەڵێن: مەترسه و خەفەت مەخۆ و دڵ گران مەبە، پاشان خوای گەورەترسی لیْ دەڕەوێنێتەوه و دڵ خۆشی دەكات بەوەی كه پێی خۆشه و هەر ترسێكی گەوره كه دێته پێش خەڵكی لەڕۆژی كۆتاییدا ئەو ترسە خاوەن باوەڕ زۆر لێی بێباكه و دڵ خۆشه، بە هۆی ڕێنموییی خوای گەوره بۆ ئەو كاره باشانەی كەلە دونیادا ئەنجامی داوه).

یەكەم كەس لە نەوەی ئادەم(ﷺ) كەخوای گەورەزیندووی دەكاتەوه: پێغەمبەری بەڕێز و پایه بەرز محمده (ﷺ) وەك ئەبو هورەیره(ﷺ) لە پێغەمبەری خواوه (ﷺ) دەگێڕێتەوه دەفەرمویت: ((انا سَيّدُ وَلَدِ آدَم يَومَ القِيامَة، واول مَنْ يُنشَق عنه الارض [في رواية: القبر] يوم القيامة)) [٤٩].وفي رواية:(( ... فأكونُ اوّلَ مَنْ يفيق)) [٥٠] (( ... فاكون اول من يُبعَثُ)) [٥١].واتە: (من سەرورەی كوڕانی ئادەمم لە ڕۆژی كۆتاییدا وەیەكەم كەسم كه گۆڕەكەم لەسەرەوه درز دەبات، وەلەڕیوایەتێكدا [...یەكەم كەس دەبم كه هۆشم دێتەوه بەخۆمدا ]، وه لەڕیوایەتێكدا ...[ یەكەم كەس دەبم كه زیندوو دەكرێمەوه]).

خەڵكان هەندێكیان بە منداڵی و هەندێكیان بەلاوی و هەندێكیان بەپیری مردوون بەلام هەموو لەڕۆژی كۆتاییدا زیندوو دەكرێنەوه لەتەمەنی (٣٣) ساڵیدان هاوەڵی بەڕێز (المقدام بن معد كرب) (ﷺ) دەیگێڕێتەوه لە پێغەمبەری خواوه كه فەرموویەتی: ((ما مِن أَحَدٍ يَموتُ سِقطاً و لا هَرِماً، وإنّما الناسُ فيما بَين ذلِكَ إلاّ بُعِثَ ابنُ ثلاثٍ وثلاثينَ

---

[٤٨] اخرجه: ابن ابي حاتم (٨/٢٠٩)، وقال ابن كثير في (تفسيره): (٧/١٦٦) اسناده حسن.

[٤٩] أخرجه: مسلم (٢٢٧٨).

[٥٠] أخرجه:البخاري (٢٤١١)،و مسلم (٢٣٧٣)، وابوداود (٤٦٧١).

[٥١] وفي رواية.

سنة))[٥٢] واتە: (هەر کەسێك مرد بێت بە لەبارچوویی لەسکی دایکیدا یان بەپیری وە خەڵکانیش لەو نێوانەدان هەموویان زیندوو دەکرێنەوە کوڕ وکچی سیٚ وسیٚ ساڵن).

خوای گەورە ڕۆژانی هەفتەش سەرجەم زیندوو دەکاتەوە وەك ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی ((إنَّ الله يبعثُ الأيام يَوم القيامة عَلى هَيْئتِها ويَبعثُ يَوم الجُمعة زَهراء مُنيرَة ...))[٥٣] واتە: (خوای گەورە ڕۆژەکان زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا لەسەر شێوەی خۆیان، و ڕۆژی جومعە، زیندوو دەکاتەوە لەناویاندا ڕووناك و پرشنگدارە... ) .

هەروەها خوای گەورە ئاژەڵان ومێرووەکان وباڵندەکان وتێکڕای زیندەوەران زیندوو دەکاتەوە بۆ لیٚ پرسینەوە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾(الأنعام: ٣٨) ﴿هەموو زیندەوەر وگیانلەبەرێك کەبەسەر زەویدا دەڕوات هەموو باڵندەیەك کەبەباڵەکانی دەفڕێت ئەوانیش هەموو ئومەت و گەلن وەك ئێوە، هیچ شتێك نی یە پشت گوێمان خست بێت وهەموو لە( لوح المحفوظ)دا هەیە، لەوەودوا هەر هەموو ئەوانە کۆدەکەینەوە بۆ ئەوەی دادگایی بکرێن﴾. دوای زیندوو بوونەوەی بونەوەران لە ناو گۆڕەکانیان بانگ دەکرێن بۆ گۆڕەپانی مەحشەر بۆ وەستان لەبەردەم خوای گەورەدا وەك لە فەرموودەی ئیبن عومەردا (ﷺ) هاتووە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... ثم ينفخ فيه أخرى فإذا هم قيام ينظرون، ثم يقال: يا ايها الناس هلموا إلى ربكم، وقفوهم إنهم مسؤلون))[٥٤]. واتە: پاشان فووی دووەمی پیادەکرێت و هەموو لەسەر پیٚ هەڵدەستن و تەماشا دەکەن، پاشان دەوترێت: ئەی خەڵکینە وەرن بۆ بەردەم خوای خۆتان و بیان وەستێنن ئەوانە بەرپرسیارن .

---

[٥٢] اخرجه: الطبراني في ((الكبير)) (٢٠/٦٦٣)، وقال ابن حجر الهيثمي في ((المجمع)) (١٠/٣٣٤): اسناده حسن، وقال المنذري في((الترغيب)) (٦/٢٧٣): رواه البيهقي و اسناده حسن،وقال الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٥١٢): اسناده صحيح.

[٥٣] اخرجه: ابن خزيمة (١/١٨١)، والحاكم (١/٢٧٧) و صححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٠٦)، وفي ((صحيح الترغيب)) (٧٠٠).

[٥٤] أخرجه: أحمد (٢/١٦٦)، و مسلم (٢٩٤٠).

# کۆکردنەوەی بونەوەران (حشر)

لەو ڕۆژە ترسناکە وپڕمەترسیەدا، بڕواداران وەك نوێنەران بەڕێز و سەربەرزییەوە دەچن بۆلای پەروەردگاریان بۆ مەحشەر، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴾ (مريم: ٨٥ ). بەڵام بێ باوەڕان بە کوێری و کەڕی و لاڵی دەبرێن بۆ لای خوا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴾ (طه: ١٢٤ - ١٢٦) واتە: ﴿ئەو بێ باوەڕانەی کە ئایینی خوایان پشت گوێ خستووە لە دونیادا، بەکوێری حەشر دەکرێن،دەڵێ خوایە بۆچی بە کوێری حەشرت کردم؟ خۆ من کوێر نەبووم؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ئایەتەکانمان پێت گەیشت و پشت گوێت خست بەهەمان شێوە پشت گوێ دەخرێیت﴾.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ دُونِهِ..... يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِهِ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا ﴾ (الإسراء: ٩٧) واتە: ﴿ئەوەی لادەدات لە ڕێگای ڕاست کەسێ نامێنێت هیدایەتی بدات جگە لە خوای گەورە، و بەکوێری و کەڕی و لاڵی حەشر دەکرێن و جێگەیان ئاگرە، هەرکاتێك کەم بێتەوە زیاتر گڕی بۆ زیاد دەکەین﴾.

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلِ الْعَادِّينَ ﴾ (المؤمنون: ١١٢- ١١٣) واتە: ﴿خوای گەورە پێیان دەڵێت: ئەوە چەند ساڵ لە زەویدا ژیانتان بردەسەر، دۆزەخیەکانیش دەڵێن: ڕۆژێك یان بەشێك لە ڕۆژێك، وە پرسیار لەو کەسانەبکەن کە بیروهۆشیان لای خۆیانە﴾، وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ..... ﴾ ( يونس: ٤٥ )واتە: ﴿ڕۆژێك دێت خوای گەورە هەموویان کۆدەکاتەوە، وا

هاست دەکەن ژیانی دونیایان هیچ نەبووە تەنها سەعاتێك نەبێت لە ڕۆژێك وە یەکتر ناسین (تعارف) دەکەن﴾. لەوێدا ئەوکەسانەی سەر بە شەیتانەکان بوون لەگەڵیاندا (حەشردەکرێن) وکۆدەکرێنەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَـٰطِينَ.... ﴾(مريم:٦٨).

هەروەها هەموو زیندەوەران و دڕندەکانیش زیندوودەکرێنەوە و حەشر دەکرێن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴾ (التكوير: ٥). هەروەها شەیتانەکان وئادەمیزاد و جنۆکە و باڵندە و هەموو دڕندەکانیش لەوێ کۆدەکرێنەوە و دەبرێن بۆ مەحشەر.

## زەوی مەحشەر

خاکی مەحشەر خاکێکی تەختە بێ بەرزی و نزمی یە و سنوور و نیشانەی هیچ کەسێکیٚ بەسەرەوە نی یە و پێوەی دیار نی یە وە خاکێکی تەخت و ڕێکە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴾ (طه: ١٠٧) وە ﴿ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴾ (النازعات: ١٤).

خاکی مەحشەر خاکێکی سپییە وەك سەهلی کوڕی سەعد (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:((یُحشر الناس یوم القیامة علی ارض بیضاء کخبزة [کقرصة] النقي لیس فیها علم لأحد))[1] واتە: (خەڵکی کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا لەسەر زەویەکی سپی وەك کولێرەی زۆر سپی، سنوور و نیشانەی هیچ کەسێکی تیا دیاری نەکراوە). صەحابی بەڕێز ئیبنو مەسعود (ﷺ) سەبارەت بەشێواز و چۆنیەتی خاکی مەحشەر دەفەرموێت: ((... أرضٌ بیضاءُ نقیّةٌ لَم یُسفَك فیها دَمٌ ولَم یُعَمل فیها بِخَطیئةٍ... ))[2] واتە:(..... خاکێکی سپی بێ گەردە، خوێنی لەسەر نەڕێژراوە وە هیچ خراپەیەکی لەسەر ئەنجام نەدراوە ....).

---

[1] اخرجه : البخاري (٦٥٢١)، ومسلم (٢٧٩٠)، وابن حبان (٧٣٢٠) قال محققه: اسناده صحيح.

[2] اخرجه :الطبراني في ((الكبير)) (٩٠٠١)، و الأوسط (٧١٦٧)، وقال ابن حجر الهيثمي في ((المجمع)) (٧/٤٥٤) : اسناده جيد : وقال ابن حجر العسقلاني في ((فتح الباري)) (١١/٣٨٣) : رجاله رجال الصحيح، والحاكم (٤/٥٧٠) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.

دوای ئەوەی خەڵکان هەڵدەستنەوە لە گۆڕەکانیان پێیان دەوترێت: ئەی خەڵکینە وەرن بۆلای خوای خۆتان، ئیبن عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەفەرموێت:((... ثُمَ يُنفَخُ فيه أُخرى فَإذا هُمْ قِيامُ يَنْظرون، ثُمَ يُقالُ: يا أيها الناسُ هَلمُوا إلى رَبكُم وَقفوهُم إنَهُم مَسؤلون .....))[٣]. واتە:(...دواتر بۆ جاری دووەم فووی پێدا دەکرێت و هەموو لەسەرپێ ڕادەوەستن و سەیر دەکەن پاشان پێیان دەوترێت: ئەی خەڵکینە وەرن بۆ لای خوای خۆتان ڕایان گرن ئەوانە بەرپرسیارن).

خەڵکی تێکڕا پۆل پۆل بەڕێ دەکەون و دەچن بۆ مەحشەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴾ (النبا: ١٨). وە خەڵکان شێوەی بەڕێ کەوتنیان بەرەو مەحشەر جیاوازە هەندێك لەسەر پێ دەڕۆن و هەندێك لە تاوانباران لەسەر دەم و چاویان دەڕۆن و قاچیان بۆ سەرەوەیە، لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّكُم محشُورونَ رِجالاً وَرُكْباناً [وفي رواية: وتحشرون][٤] وتجَرّوْن على وجوهِكم))[٥] واتە:( ئێوە کۆدەکرێنەوە ودەبرێن بۆ مەحشەر هەندێك بەپێ وهەندێك بەسواری وە هەندێکتان ڕادەکێشرێن لەسەردەم و چاوتان) .

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەفەرموێت: ((إن رجلا قال: يا نبي الله كيف يُحشر الكافرُ على وجهه يوم القيامة ؟ قال: [أليس الذى أمشاهُ على الرجُلين قادرٌ على أن يمشيه على وجهه يوم القيامة]))[٦] واتە: (پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن بێباوەڕ لەسەر ڕوو (واتە: دەم و چاوی) حەشر دەکرێت و دەڕوات ؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ئایا ئەوەی لەسەر دوو قاچ بردوویەتی بەڕێوە ناتوانێت لەسەر دەم و چاوی بیبات بەڕێوە لە ڕۆژەدا کۆتاییدا)، لەو ڕۆژەی ئادەمیزادە فیز زل و خۆ بەزلزانەکان لەشێوەی مرۆڤدا بەهێندەی مێرووە ڕەشە وردەکان حەشر دەکرێن،

---

[٣] اخرجه : احمد (١٦٦/٢)، ومسلم (٢٩٤٠).

[٤] وفي رواية.

[٥] اخرجه: احمد (٤٤٦/٤) (٢٠٠٣١)وقال محققه :إسناده حسن، واحمد في ((الفضائل)) (١٧١٠) وقال المحقق: أسناده صحيح، والطبراني في ((الكبير)) مجلد (١٩) برقم (٩٦٩)، وابن ابي شيبة (٢٥٠/١٣) والحاكم (٥٦٤/٤)، والهيثمي في ((المجمع)) (٣٥١/١٠) وقال رجال احمد رجال ثقات، والترمذي (٢٤٢٤) وقال : حسن صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الترمذي)) (١٩٧٦).

[٦] اخرجه : البخاري (١١٨٤)، والحاكم (٤٠٢/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

وەك عەبدولأی کوڕی عەمر (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يُحشَر المتكبِّرون يَومَ القيامَةِ أمثال الذَّرّ في صوَرِ الرِّجال تَطؤَهم النّاسُ لِهوانِهم على الله [يَغشاهُم الذّلُ من كُل مكان][٧]))[٨] واتە:خۆبەزل زانەکان ڕۆژی کۆتایی کۆدەکرێنەوە بەوێنەی مێرووله ڕەشە بچکۆلەکان، لەسەر وێنەی پیاوان، وە خەڵکان دەیانکەن بەژێر پێیانەوە بەهۆی بێ نرخیان لای خوای گەورە (سەرشۆڕی دێت بەسەر یاندا لەهەموو جێگەیەکدا ).

هەموو ئاژەڵان وباڵندەکان لەگەڵ ئادەمیزاد و جنۆکە بە یەکەوە حەشر دەکرێن، ئەبو هورەیرە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی:((يُحشر الخلقُ كلهُم يوم القيامة: البهائمُ و الدوابُ و الطير))[٩]، واتە: (دروست کراوانی خوا لە ڕۆژی کۆتاییدا هەموو کۆدەکرێنەوە بە زیندەوەرەکان و ئاژەڵەکان و باڵندەکان).

هەموو ئوممەتان کۆدەکرێنەوە بە موسوڵمانانەوە حەفتا ئوممەت پێك دێنن وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا: ﴿...كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ (آلعمران: ١١٠) واتە: (ئێوە باشترین ئوممەتن کە دەرکەوتوون لەنێو خەڵکدا)، فەرموویەتی: ((إنكم تتمون سبعين امة: أنتم خيُرها و أكرمُها على الله))[١٠]، واتە: (ئێوە تەواوکەری حەفتا ئوممەتن و لەهەموویان چاکترو بەڕێزترن لای خوای گەورە). وە هەموو ئوممەتەکان شوێن پێغەمبەری خۆیان دەکەون و بەدوایاندا دەچن بەرەو مەحشەر، ئیبنو عومەر (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:((إنَّ الناسَ يَصيرونَ يومَ القيامةِ جُثاً كُلّ أمّةٍ تَتبعُ نَبيّها))[١١] واتە:(خەڵکان بەش بەش دەبن لەڕۆژی کۆتاییدا هەموو ئوممەتێك شوێن پێغەمبەری خۆی دەکەوێت)، و پێغەمبەری

---

[٧] في رواية.

[٨] اخرجه: الترمذي (٢٤٩٢)، و البزار (٣٤٢٩) بإسنادٍ حسن، كما قال الحافظ العراقي في تخريجه على ((الأحياء)) (٣٢٩/٣)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الترمذي ))(٢٠٢٥) وفي (المشكاة) (٥٥١٢)، و((صحيح الترغيب)) (٢٩١٢).

[٩] اخرجه : الحاكم (٣١٦/٢) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبى، وقال الشيخ الالبانى فى ((السلسلة الصحيحة)) (١٩٦٦): اخرجه ابن جرير (١٧/٣) بإسناد صحيح.

[١٠] اخرجه :احمد (٣/٥)، والطبراني في (الكبير) (١٠٣٠/١٩)، والترمذي (٣٠٠١) وقال حديث حسن، و صححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي))(٢٣٩٩):و في((صحيح سنن ابن ماجة))(٣٤٦١)،وفي((المشكاة))(٦٢٨).

[١١] اخرجه: البخاري (٤٧١٨).

وا هەیە تێپەڕ دەبێت وکەمتر لە دە کەسی لە گەڵدایە، وەهەیانە تەنها دوو پیاوی لە گەڵدایە و هەشیانە کەسی لە گەلدا نی یە، وەك ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((عُرِضَ عليَّ [ في رواية:الأُمَم ][12] الانبياء بِإتباعِها مِن أمتِها، فإذا النبـي معَهُ الثُلةُ مِن أُمتهِ، وَإذا النبـي ليسَ مَعَه أحدٌ... حَتى مَرَّ موسى بن عمران ومَن مَعَهُ مِن بني إسرائيل، قلت: يارب فأَين أُمَتي، قال: أُنظر عَن يمينِكَ فاذا الظرابُ (جبالُ صغار) ظِرابُ مكة قد سُدَّ مِن وجوه الرِّجال، قال: أرضيت يامحمد ؟ قلت: رضيت رَبٌّ، قال: انظر عَن يَسارِكَ فنظرتُ فإذا الأفق قَد سُدَّ مِن وجُوه الرِّجال، قال: ارضيت يامحمد ؟ قلت: رَّضيت رَبٌّ قال فإنَّ مع هؤلاء سَبعُونَ الفاً...))[13] واتە:(پێغەمبەران و شوێن کەوتوەکانیانم نیشاندرا لە ئوممەتەکان، پێغەمبەری وا دێت کەسانێکی زۆری ئومەتەکەی خۆی لەگەڵ دایە، وە پێغەمبەری وا دێت دوو پیاوی لەگەڵدایە وە پێغەمبەری وا دێت سیانی لەگەڵدایە وەپێغەمبەر هەیە کەسی لە گەڵدا نی یە... هەتا موسای کوڕی عیمران تێ پەڕی لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئومەتەکەی لە بەنو ئیسرائیل، وتم خوای گەورە ئەی ئومەتەکەی من لەکوێیە؟ فەرمووی: تەماشای لای ڕاستت بکە، بینیم کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر وەك زنجیرە چیاکانی شاری مەککە هەموو پڕ بوو بوون لە ڕوخساری پیاوان، فەرمووی ڕازی بوویت ئەی محمد؟ وتم: بەڵێ خوای پەروەردگار، فەرمووی تەماشای لای چەپتەوە بکە، تەماشام کرد ڕووی خەڵکان ئاسۆیان داپۆشی بوو، فەرمووی ڕازی بووی ئەی محمد؟ وتم: بەڵێ خوای پەروەردگار، فەرمووی: ئەمانەو حەفتا هەزاریشیان لەگەڵدایە....).

وە زۆری ژمارەی ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەگەڕێتەوە بۆ خەلات کردنی قورئان بۆ پێغەمبەری خوا وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ما مِن الأنبياءِ نبـي إلاّ أُعطيَّ مِن الآياتِ مامِثله آمن عليه البشرُ وإنَّما كان الذي

---

[12] في رواية.

[13] اخرجه : احمد (٤٠١/١) (٣٩٨٧) وقال محققه : حديث صحيح، وابو يعلى (٢٤٧/٢)، والبزار (٢٣٨/١)، والطلياسي (٤٠٤)، والطبراني ((الكبير)) (٩٧٦٧)، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٠٥/٩) : رواه احمد والبزار ورجالهم رجال الصحيح، وقال الحافظ ابن حجر العسقلاني في ((فتح الباري)) (٤٠٧/١١) : رواه احمد واسناده صحيح، وقال الحافظ ابن كثير في ((تفسير القرآن العظيم)) (٥٥٧/١) : اسناده صحيح، وابن حبان (٧٣٤٦) وقال محققه : حديث صحيح.

أوتيتُ وحيّاً أوحاهُ اللهُ إليَّ فأرجو إنّي أكثرهُم تابعاً يومَ القيامـةِ))[١٤]. واتـه: (هـەر پێغەمبـەرێك لەپێغەمبەرانی خوا نیشانە و معجیزەی پێ دراوە کە خەڵکان لەسەری باوەڕیان پـێ بێنن، بەڵام ئەوەی بەمن بەخشراوە نیگایەك (الوحي) بووە خوای گەورە بۆی هێناومەتە خـوارەوە، و منـیش هیـوام وایـە ژمـارەی ئوممـەتم زۆرتـرین ژمـارە بێـت لـە ڕۆژی کۆتاییدا).

موسوڵمانانی لە خواترس وەك نوێنەر (وفد) دەبرێن بۆلای خوای گەورە، وە پـێ دەچێت چینی موجاهیدان و حاجیـەکان و ئەوانـەی عـەمرە دەکـەن بگرێتـەوە- والله أعلم- وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((وَفدُ اللهِ ثلاثةٌ: الغازي والحـاج والمعتمـر))[١٥]. واتـە: وەفدی خوا سیانن: موجاهیدان و حاجیـەکان و ئەوانـەی کـە چـوون بـۆ عـەمرە). وە هەنـدێ لـە خـەڵکان کـە دەبـرێن بـۆ مەحشەر گوناه و تاوانەکانیان بەسەر شانیانەوەیە وهەڵیان گرتووە وەك خـوای گـەورە دەفەرموێت:﴿ .....وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴾ (الأنعام: ٣١)، نەك گوناه و تاوانی خۆیان بەڵکو بگرە تاوانی شوێن کەوتوانیشیان لەدونیادا وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴾ (النحـل: ٢٥)، ئـەو کەسـانەی کـە خـاك و زەوی خـەڵکانی تریـان دەسـت بەسـەردا گرتـووە و داگیریـان کـردووە ئـەوانیش ئـەو خـاك وخۆڵـەی ئـەو زەویانـەیان بـە کۆڵەوەیـە و هـەڵی دەگـرن تـاکو دەگەنـە مەحشـەر. یـەعلای ئـە قـەڤ لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مَن أخَذَ مِـنَ الأرضِ شيئاً ظُلمـاً جاءَ يَومُ القيامةِ يَحمِلُ تُرابَها إلى المَحشرِ))[١٦]. واتـە: (هـەر کەسـێ هەرچـەندێك زەوی داگیر

---

[١٤] اخرجه : البخاري (٤٩٨١)، ومسلم (٣٨٦).

[١٥] اخرجه : النسالي (٥/١١٣). واللفظ له، ابن ماجة (٢٨٩٣)، وصحّحه الشيخ الالباني في: ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٣٣٩)، )(صحيح االنسالي)) (٢٤٦٢).

[١٦] اخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٢٢/٦٩١)، وابن ابي شيبة (٦/٦٦٥)، واسناده صحيح كما قال الشيخ الارنـوؤط في تحقيقه لصحيح ابن حبان (١١/٥٦٨)، وصححه الشيخ الالبـاني في ((صـحيح الجـامع)) كمـا في ((ترتيـب صـحيح الجامع)) (٣/٥٣) برقم (٣٠). و((السلسلة الصحيحة)) (٢٤٠) وفي رواية : ((مـن اخـذ أرضـاً بغـير حقِهـا كُلِـفَ اَن يَحمِلَ تُرابَها إلى المحشر)) اخرجه: احمد (٤/١٧٣) رقم (١٧٥٥٨) و قال محققـه ارنـاؤوط: اسـناده حسـن، و صـحح إسناده الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) ( ٢٤٢).

کردبێت بەستەم، ئەو کەسە لە ڕۆژی کۆتاییدا دێت و خاك وخۆڵەکەی هەڵ دەگرێت هەتاکو دەگاتە مەحشەر).

چینی شەهیدان و بریندار کراوان لە پێناوی خوادا بە برینەکانیانەوە دەچنە بەردەم خوای گەورە، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((و الذي نفسي بيدِهِ لا يُكلَمُ أحدٌ في سبيل اللهِ و الله أعلَم بِمَن يُكلَمُ في سبيلِهِ إلا جاءَ يَوم القِيامة و كُلمُه يَدمي، اللونُ لون الدَّم [في رواية... لون الزعفران...][17] والريحُ ريحُ المِسك))[18] واتە: ( سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە هەرکەسێ بریندار بکرێت لە پێناوی خوادا و خوای گەورەش باشتر دەزانێت کە کێ بریندار کراوە لە پێناوی ئەودا، ئەوا دێت لە ڕۆژی کۆتاییدا برینەکەی خوێنی لێ دەتکێ و ڕەنگ ڕەنگی خوێنە (لەریوایەتێکی تردا: ڕەنگی زەعفەرانە) وە بۆنەکەشی بۆنی میسکە). وە دەفەرموێت: ((ومن خَرَجَ بِه خُراجٌ في سبيل الله فَإنَّ عِليه طابع الشهداء))[19] واتە: ( هەر کەسێك بریندار بوو بێت و برینەکەی هەرچی دەربدات ئەو کەسە لە پێناوی خوادا مۆری شەهیدی پێ وە دەبێت ).

خەڵکان سەرجەم لەڕێ ڕۆیشتنیان بەرەو مەحشەر هەموویان ڕووت و بێ جل و بەرگن، وەك ئیبنو عەباس (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: [((يُحشَر الناس يَوم القِيامة حفاةً عُراةً غُرلاً..))[20] .. قالت عائيشة: يارسولَ الله الرِّجال و النِساء جميعاً يَنظرُ بعضهم إلى بَعضٍ ؟ قال: ((يا عائشةَ الأمرُ أشَدُ مِن أنْ يَنظُرَ بَعضُهم إلى بعضٍ))][21] واتە: ( خەڵکان کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا پێپەتی و ڕووتن........ عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوان و ئافرەتان پێکەوەن ئایا هەندێکیان تەماشای هەندێکیان دەکەن؟ فەرمووی: ئەی عائیشە بارو دۆخەکە زۆر گەورەتر و ترسناکترە لەوەی کە تەماشای یەکتر بکەن) ، وە یەکەم کەسێك کە پۆشاکی لەبەردا

---

(17) اخرجه : أبوداود (٢٢٥١)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٢١٦).

(18) أخرجه: البخاري (٢٦١٣).

(19) اخرجه : أبوداود. (٢٥٤١)، و صححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٢١٦).

(20) انظر : لتوضيح ذلك وحكمته في كتاب (تحفة المودود) لابن قيم الجوزية (ص: ١٦٦).

(21) أخرجه : احمد (١٩١٣)، و البخاري (٣٣٤٩)، والنسائي (٤/١١٤)، والترمذي (٢٤٢٣)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٧٥)، وفي ((المشكاة)) (٥٥٣٦).

دەکرێت (ابراهیم ﷺ)ە وەك ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ أول الخلائقِ يُكسى يومَ القيامةَ إبراهيمُ الخليل))[٢٢]،واتە:( یەکەم کەس لە دروست کراوانی خوا لە ڕۆژی کۆتاییدا بەرگ و پۆشاکی بەبەردا دەکرێت (ابراهیم الخلیل)ە)، وە دوو پۆشاکەکەی ئیبراهیمیش دوو پۆشاکی سپی (قبطین) پاشان دوای ئەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پۆشاکێکی سەوزی بەبەردا دەکرێت، وەك ئیمامی علی (ﷺ) فەرموویەتی: ((أول مَن يُكسى إبراهيم قِبطيَتَين، ثُمَ يُكسى النبيُّ (ﷺ) حُلَّةَ حَبرةً [في رواية... حُلةٌ خضراء] [٢٣] وَهُوَ عَن يمين العرش)). [٢٤] واتە: یەکەم کەس کە پۆشاکی بەبەردا دەکرێت ئیبراهیمە ئەویش دوو جلی سپی قیبتیە، ئەنجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پۆشاکێکی خەتی ( لەڕیوایەتێکدا: پۆشاکێکی سەوزی بەبەردا دەکرێت، لەوکاتەدا لای ڕاستی عەرشەوە دەبێت).

## بارودۆخی خەڵکان لەمەحشەر

خوای گەورە ناهەمواری و سەختی ئەو ڕۆژەی بۆ باس کردووین لە قورئاندا کە ڕۆژێکە ستەم کاران چاویان تیایدا ئەبلەق دەبێت و سەرشۆڕ و ڕیسوا دەبن و ئاخ هەڵدەکێشن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ (ابراهیم: ٤٢) واتە: ﴿خوای گەورە ئاگای لە هەموو کردەوەی ستەم کارانە، دوای خستوون بۆ ڕۆژێك تیایدا چاو ئەبلەق دەبێ و سەر شۆڕ دەبن﴾.

خەڵکان لەمەحشەردا زۆر دەترسن و دەتۆقێنرێن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ... ﴾(دغافر: ١٨)، دەبینرێن حەپەساون لە ترسناکی ئەو ساتە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ .... ﴾ (الحج: ٢) واتە: ﴿لەو ڕۆژەدا کەس ئاگای لەکەس نابێت وە

---

[٢٢] اخرجه : البخاري (٦٥٢٦)، وفي ((فتح الباري)) (٣٧٧/١١).

[٢٣] في رواية : الحاكم (٣١٣/٢) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي.

[٢٤] اخرجه : أبو يعلى (١٦٥/١) بإسناد صحيح على شرط مسلم، كما قال الشيخ الألباني في ((مختصر العلو)) (ص: ١٢٥) برقم (٨٩).

دایکیش ڕۆڵەی خۆی فەرامۆش دەکات﴾، بێباوەڕان لەو ڕۆژە ترسناکە دا چاوشۆڕو زەلیل و ڕیسوان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞ ... ﴾ (القلم: ٤٣) وەکاتێك سزای خوای گەورە بەچاوی خۆیان دەبینن پەشیمانی یەکجارەکی دەکێشن وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۖ لَمَّا ... ﴾ (یونس: ٥٤)، خەڵکان لەو ڕۆژەدا کارە چەپەڵەکانی خۆیان بەڕوویاندا دەدرێت و نیشانیان دەدرێت داخ و حەسرەتی بۆ هەڵ دەکێشن وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ....كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡ... ﴾(البقرة: ١٦٧)، لەو ڕۆژەدا بیری کردەوەکانی خۆیان دەکەوێتەوەو وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴾ (النازعات: ٣٥).

لەو ڕۆژەدا سەرپێچیکارانی خواو پێغەمبەر خۆزگە دەخوازن کە مردنەکەیان یەکجارەکی بوایە و زیندوو نەبونایەتەوە و هەر لەژێر خاکدا بوونایە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا ﴾ (النساء: ٤٢) و﴿ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾( الحاقة: ٢٧ – ٢٨ )، هەر لەو ڕۆژە ترسناکەدا خەڵکان دڵ و چاویان دەکەوێتە لەرزەلەرز وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَخَافُونَ يَوۡمٗا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ (النور: ٣٧) لەو ڕۆژە تۆقێنەرەدا منداڵان لەترسا مووی سەریان سپی دەبێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ﴾ (المزمل: ١٧)، وە لەو ڕۆژە ترسناکەدا ڕێگا نادرێت بەخەڵکان کە بێنە قسەو ڕێگەشیان پێ نادرێت کە پاساو (العذر) بهێننەوە لەسەر کارە چەپەڵەکانیان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ ﴾ (المرسلات: ٣٥ – ٣٦ )، ئەگەر عوزریش بهێننەوە ئەوانە بەهیچ جۆرێك لێیان قبوڵ ناکرێت و وەرناگیرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴾ (غافر: ٥٢).

لەو ڕۆژە ترسناکەدا خەڵکان لەترسی سەختی سزای خوا وەك سەرخۆش وان و هۆشیان بەخۆیانەوە نی یە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا

هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ..... ﴾ (الحج: ٢ )، ئا لەو ڕۆژەدا تاوانباران خۆزگە دەخوازن کە یەکێك هەبوایە تکای بۆ بکردنایە یاخود بگەڕانایەتەوە بۆ دونیا تا کاری چاکە بکەن وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿..... قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ إِلَّا... ﴾ (الأعراف: ٥٣ ).

لەو ڕۆژەدا ستەم کاران پەشیمان دەبنەوە و پەنجەی پەشیمانی دەگەزن و خۆزگە دەخوازن کە دۆستایەتی و لایەنگریەتی پێغەمبەری خوا و موسوڵمانانیان بکردایە وەلایەنگری و هاوەڵایەتی کافرانیان نەکردایە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴾ (الفرقان: ٢٧ – ٢٨)، وە لەو ڕۆژەدا دۆستان و هاوەڵانی زۆر خۆشەویستی دونیا لەوێدا دەبن بەدوژمنی یەکتر تەنها بڕوادارە پارێزگارەکان نەبێت،وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ (الزخرف: ٦٧).

لەو ڕۆژەدا شوێن کەوتوانی ستەمکاران دێن بە گژ گەورەکانی خۆیانداو پێیان دەڵێن ئێمە لەدونیادا لەخزمەت ئێوەدا بووین. ئایا ئێوە دەتوانن شتێك لەسزای خوامان لێ دووربخەنەوە ئەمڕۆ؟ ئەوانیش بەگژیاندا دێن و دەڵێن گەر ئێمە باش بوینایە ئێوەش باش دەبوون، وەهەر لەو ڕۆژەدا شەیتان دژ بەو کەسانەی کە گومڕای کردوون دەوەستێت و پێیان دەڵێت: وتەو پەیمانی خوا بۆ ئێوە ڕاست بوو، وەهێنایەدی بەڵام وتە و پەیمانی من بۆ ئێوە درۆ و هەڵخەڵەتاندن بوو وە منیش هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو بەسەرتاندا تەنها ئەوە نەبێت کە بانگم کردن و ئێوەش بەدوامدا هاتن وگوێ ڕایەڵم بوون، کەوا بوو لۆمەی من مەکەن و لۆمەی خۆتان بکەن من هیچم پێناکرێت بۆ ئێوەو ئێوەش هیچتان پێ ناکرێت بۆ من، من بەریم لەو شتانەی کە جگە لەخوا بۆمنتان ئەنجامدا بەڕاستی ستەمکاران ئەمڕۆ سزایەکی پڕ ئێش و ئازاریان بۆ ئامادەکراوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿.... فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ

إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ ۖ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (ابراهيم: ٢١ - ٢٢).

هەر لەو ڕۆژەدا بێ باوەڕان و بت پەرستان دەچن بەکڕ گەورەکانیاندا و خۆیانی لێ بەری دەکەن و بەدرۆیان دەخەنەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ۖ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ (النحل: ٨٦)، وە هەردوولایان بەری بوونی خۆیان ڕادەگەیەنن بۆ یەکتری بەتایبەت شوێن کەوتووان خۆزگە دەخوازن کە بگەڕێنەوە بۆ ژیانی دنیاو بەری بوونی خۆیان ڕابگەیەنن بەو پەرستراوانە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ..... ﴾ (البقرة: ١٦٧)، هەر لەو ڕۆژە ناهەموارەدا ئادەمیزاد لەخزمان و نزیکانی خۆی هەڵدێت و خۆی لێ یان دەشارێتەوە نەوەك داوای مافێکی خۆیان بکەن چونکە ئەو ڕۆژە هەموو لایەك سەرقاڵە بەچارەنووسی خۆیەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴾(عبس: ٣٤ - ٣٧)، هەر لەو ڕۆژەدا ستەم کاران خۆزگە دەخوازن بە بەختکردن و بەخشینی کوڕانیان و ژنەکانیان و برایانیان و خزمانیان تا ڕزگاریان بێت لەسزای ئەو ڕۆژە، بەڵام هەرگیز شتی وا نابێت و هەرگیزلێ یان قبولْ ناکرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُبَصَّرُونَهُمْ ۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴾ (المعارج: ١١ - ١٥).

# ناڕەحەتیەکانی مەحشەر (اهوال المحشر)

ناڕەحەتی هەرە گەورەی مەحشەر نزیك بوونەوەی خۆرە لە دروست کراوان (جنۆکە و ئینسان و ئاژەڵان) و تواندنەوەیان لەو ڕۆژەدا کە تەنها یەك دانە میل دووری هەیە لە نێوان گۆی خۆر و خەڵکاندا، صەحابی بەڕێز (مقدادی کوڕی ئەسوەد) (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: [((تُدنی الشمسُ يَوم القيامةِ مِنَ الخَلقِ حتّى تَكونَ مِنهُم كَمِقدار ميلٍ))، قال سليم بن عامر الراوي: فو الله لا أدري مايعني بالميل: أ مسافة الارض أم الميل الذي نكتحل بهِ العين ][25]، واتە: [ (ڕۆژ نزیك دەکرێتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا لە دروست کراوان بە ئەندازەی یەك میل سەلیمی کوڕی عامر کە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە. دەفەرموێت: واللە نازانم مەبەست بە (میل) چی یە؟ ئایا یەك میل دوورە لەزەوی یاخود مەبەست بەو (میل)ە یە کە چاوی پێ دەڕێژین].

سەلمانی فارسی (ﷺ) دەفەرموێت: ((تُعطى الشَمسُ يَومَ القيامةِ حَرَّعَشرَسنينٍ ثُمَ تُدنى مِن جَماجِمِ النّاس...))[26] واتە: (ڕۆژ هێز و تینی دە دانە ساڵی پێ دەبەخشرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا، ئەنجا نزیك دەکرێتەوە لە کەللە سەری خەڵکان ...)، لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((... تكون قيد ميلٍ أو ميلين فَتَصهرُهُم الشَمسُ))[27] واتە: (ماوەی میلێك یان دوو میل دوور دەبێت وە لەبەر گەرمی ئەو ڕۆژە دەکەونە عارەق کردنەوە و تواندنەوە بەقەدەر کارەکانی خۆیان).

وەك میقدای کوڕی ئەسوەد (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((.... فتكونُ الناسُ عَلى قَدر أعمالِهم في العَرقِ، فَمِنهم مَن يَكون الى كعبيهِ، وَمِنهم مَن يكون الى رُكبتيهِ، ومِنهُم مَن يَكون الى حقويهِ، ومِنهُم مَن يُلجِمُه العَرق إلجاماً، واشار

---

[25] اخرجه : احمد (٣/٦)، والطبراني في ((الكبير)) (٢٠)/(٦٠٢)، ومسلم (٢٨٦٤)، والترمذي (٢٤٢١) وقال : حسن صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الترمذي)) (١٩٧٣).

[26] اخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٦١١٧)، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٧٢/١٠) رجاله رجال الصحيح، وصححه المنذري في ((الترغيب)) كما في ((تهذيب الترغيب)) (٣٥٣٩) : اسناده صحيح، وابن ابي عاصم في ((السنة)) (٨١٣) : وقال الشيخ الالباني في تحقيقه : اسناده صحيح على شرطهما وهو في حكم المرفوع لانه لايقال من قبل الراي وفي رواية (تدنوا الشمس يوم القيامة على قدر ميل و يزداد في حرّها كذا وكذا يغلى منها الهام كما يغلى القدور ويعرقون فيها على قدر خطاياهم ) أخرجه : احمد (٢٢١٨٦) وقال محققه : اسناده قوي، والطبري ((الكبير)) (٧٧٧٩).

[27] اخرجه : احمد (٣/٦)، ومسلم (٢٨٦٤)، والترمذي (٢٤٢١) وقال محققه : اسناده صحيح.

رَسُــولَ الله (ﷺ) بِيَــدِهِ الى فيــهِ))[٢٨] واتــە:(... خــەڵکان بەهێنــدەی کارەکانیــان دەکەونــە عارەقــەوە، هــی وایــان هەیــە عــارەق تــا قولــە پێیــەتی، هــی وایــان هەیــە تــا هــەردوو ئەژنۆیەتی، هی وایان هەیە عارەق هەتا یەخەیەتی، هی وایان هەیە هەتا دەمیەتی).

وە لەڕیوایــەتێکی تــردا عوقبــەی کــوڕی عامــر (ﷺ) بۆمــان دەگێڕێتــەوە لەپێغەمبەری خــواوە (ﷺ) کە فــەرموویەتی: ((فَمِنَ الناس من يَبلُغُ عَرقُه كَعبَيهِ، وَمِـن النـاس مِن يَبلُغُ عَرقُه نِصفَ الساقِ، وَمِنَ الناسِ مَن يَبلُغ عَرَقُه رُكبتهِ، وَمِنَ الناسِ مَن يَبلُغُ عَرَقُه مِنكَبيَـهِ، ومِن النّـاسِ مَـن يُلجِمُـه، ومِـنهُم مَـن يَغمـرُهُ))[٢٩]. واتــە: (خــەڵکی وا هەیــە عــارەقی لەشــی دەگــاتە قــوولەپێی، و خــەڵکی وا هەیــە عارەقی دەگــاتە نیــوەی خــوار ئــەژنــۆی، و خــەڵکی وا هەیــە عــارەقی دەگـــاتە هــەردوو ئەژنـــۆی، وەخــەڵکی وا هـــەیە عــارەقی دەگـــاتە کەلەکـــەی، وخەڵـــکی وا هەیە عارەقی دەگاتە پشتێنەی، وەخەڵکی وا هەیە عـــارەقی دەگـــاتــە ســەر هەردوو شــانــی، و خــەڵکی وا هـــەیەعارەقی دەگاتە لغاوەی دەمی وە هی وا هەیە عارەقی دای دەپۆشێت و نوقمی دەکات).

عــارەق کردنــەوەی خــەڵکان ئەوەنــدە زۆر دەبێــت تــا بــەناخی زەویــدا حــەفتا گــەز دەچێتە خوارەوە وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەیگێڕێتــەوە لەپێغەمبــەری خــواوە (ﷺ) کە فەرموویــەتی: ((يَعرَقُ الناسُ يَوم القيامَة حتى يَذهب عَرَقُهُم في الأَرضِ سَبعينَ ذِراعاً [..في رواية: باعاً...] و يُلجِمُهُم[٣٠] حتى يَبلُغَ آذانَهُم))[٣١] و في رواية ضعيفة: ((.. يلجمُهم العرقُ حتـى انَّ السُفَنَ لواُجريَت فيه لجرَت))[٣٢] واتــە: ( خــەڵکان عارەق دەکەنــەوە لــەڕۆژی کۆتــایی هــەتا عارەقیــان بــەناو زەویــدا حــەفتا گــەز (لەڕیوایەتێکدا:حــەفتا بــاع) دەچــێتە خــوارەوە و لغاوەیــان دەگرێتــەوە هــەتا دەگاتــە گوێچکەیان، لــە ڕیوایەتێکدا: بــەڵکو عــارەقی ئــەو

---

[٢٨] اخرجه مسلم (٢٨٦٤).

[٢٩] اخرجـه : احمـد (١٥٧/٤)، والطبراني في ((الكـبير)) مجلـد (١٧) بـرقم (٨٤٣)، وقـال الهيثمـي في ((المجمـع)) (٣٣٥/١٠) : اسناد الطبراني جيّد، والحاكم (٥٧١/٤) صححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٣٢٩) وقـال محققـه : اسناده صحيح.

[٣٠] في رواية : مسلم (٧١٣٤).

[٣١] اخرجه : البخاري برقم (٦٥٣٢).

[٣٢] أخرجه : احمد (١٢٥٦٦) وقال محققه : اسناده ضعيف، والطبري ((الأوسط )) (١٩٧٦) وقال محققه : اسناده حسن، وحسنه كل من المنذري ((الترغيب)) (٣٩٠/٤)، والهثمي ((المجمع)) (٣٣٤/١٠)، وضعفه الشيخ الالباني في ((ضعيف الترغيب)) (٢٠٩١) و اوردته للعلم فقط.

خەڵکانە ئەوەندە زۆرە هەتا دەگاتە لغاوەیان و وای لێ دێت ئەگەر کەشتی هاتوو چۆی تیا بکات ئەوا ئەتوانێ هاتوو چۆی تیا بکات). بەڵام ئەم فەرمموودەیە (لاوازە).

وە خەڵکان لەمەحشەردا دەوەستێنرێن لە قەرەباڵغییەکی یەکجار گەورەدا، جابری کوڕی عەبدوالله (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خـواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((تُمَدُّ الأرضَ یوم القیامة مدّ العظمة الرَّحمن ثم لایکون لبشرٍ مَنِ بَنِي آدم إلاَّ موضع قدمیه...))[٣٣] واتە: ( زەوی لەڕۆژی کۆتاییدا درێژ دەکرێتەوە و ڕادەکێشرێت ئەنجا هیچ ئادەمییەك جێگای وای دەست ناکەوێت تەنها جێگەی هەردوو پێی نەبێت...)، وە گۆڕەپانی مەحشەر ئەوەندەیە چاو ئەمسەر و ئەوسەری دەبینێ وە جارچی دەنگی جارەکەی لەم سەر بۆ ئەو سەر دەگات وەك ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أرض بیضاء نَقیَّة... یسَمَعهُم الَّداعي ویَنُفذُهم البصر))[٣٤] واتە: (زەویەکی سپی بێ گەردە.... بانگەوازکار بانگەوازەکەی دەگاتە گوێی هەموو کەسانی مەحشەر و چاو ئەمسەر و ئەوسەری دەبینێت).

وەستانی هەموو خەڵکان لەو جێگە تەسك وتەنگەدا زۆر ناڕەحەتە چونکە بونەوەران سەرجەم لەوێدا کۆدەکرێنەوە وەك چۆن تیرێکی زۆر لە کیفێکی تەسکدا کۆدەکرێتەوە عەبدولای کوڕی عومەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((تَلا رَسـوُل الله (ﷺ) ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (المطففین: ٦)، ثُمَّ قال: ((کیف بِکم إِذا جَمَعَکُم اللهُ کَما یُجمَع النَبلُ في الکِنانةِ خمسین ألفَ سنةٍ ثم لایَنظُرُ إلیکُم))[٣٥]. واتە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ پاشان فەرمووی: (دەبێ چۆن بن کاتێك خوای گەورە کۆتان دەکاتەوە وەك چۆن تیر کۆدەکرێتەوە لەناو کیف دا پەنجا هەزار ساڵ پاشان تەماشاشتان ناکات)، وەماوەی ئەو ڕۆژە زۆر درێژە لەسەربێ باوەڕان تا دەگاتە پەنجا هەزار ساڵ). لە چەند ڕیوایەتێکدا باسی ئەو کاتە درێژ خایەنە هاتووە، لە ئیبنو

---

[٣٣] اخرجه : الحاکم (٤/٥٧٠) صححه علی شرطهما ووافقه الذهبي وقال محققه برقم (٨٧٤٢) مرسل وسنده صحیح علی شرط الشیخین، و البیهقي في ((الشعب)) رقم: (٣٠٣).

[٣٤] أخرجه : الترمذي (٣٤٣٤) و قال حسن صحیح، وصَحَحه الشیخ الألباني في ((صحیح سنن الترمذي)) (١٩٨٢) : صحیح، والحاکم (٤/٥٧٠) صححه علی شرطهما و وافقه الذهبي، انظر : ((صحیح الجامع)) (١٤٦٦).

[٣٥] اخرجه : الحاکم (٤/٥٧٢) و صححه ووافقه الذهبي، وقال الهیثمي في ((المجمع)) (٧/١٣٥) : رواه الطبراني ورجاله ثقات، وصححه الشیخ الالباني في ((السلسلة الصحیحة)) (٢٨١٧).

عومەرەوە (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((في يومٍ كان مقداره خمسين ألـفَ سَنة حتّى إنَّ الرَجُلَ يَتغيبُ في رشحهِ إلى انصـاف أُذنيـة))[٣٦]. واتـە: (لەڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە هەتا وای لێ دێت پیاو ون دەبێت لەعارەقی خۆیدا وتا دەگاتە نیوەی هەردوو گوێ)، هەر لەبەر ئەوە یە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە لە دوعا و نزاکانیدا دەپاڕایەوە و پەنای دەگرت بەخوا لە ناڕەحەتی قەرەباڵغی ڕۆژی کۆتایی وەك عائشە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدوعاکانیدا ئەی فەرموو: ((أعوذُ باللهِ مِنْ ضِيقِ المَقامِ يومَ القِيامةِ))[٣٧]. واتە: (پەنا ئەگرم بەخوا لە ناڕەحەتی و جێگای تەسکی وەستانی ڕۆژی کۆتایی).

# چاوەڕێ کردنی دروست کراوان بۆیەك لاکردنەوەی چارەنووسیان

دروست کراوان بۆیەك لاکردنەوەی چارەنووسیان ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی دەکەن وەك ئیبنو مەسعود (ﷺ) گێڕاویەتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يَجمعُ اللهُ الأوّلينَ والآخرينَ لِميقاتِ يومٍ معلومٍ قياماً أربعين سَنَةً شاخصةً أبصارهُم الى السماءِ ينتظرون فَصل القضاء، ويَنزِلُ اللهُ عزوَجل في ظُللٍ مِن الغَمام مِن العرش الى الكرسي...))[٣٨] واتە: (خوای گەورە یەکەمینەکان و کۆتاییەکان (واتە: دروستکراوانی) کۆ دەکاتەوە بۆ کات و ڕۆژێکی دیاری کراو چل ساڵ بەپێوە چاویان ئەبڵەق بووە و دەڕوانن بەرەو ئاسمان چاوەڕێی یەك لاکردنەوەی چارەنووسیان دەکەن، وە خوای گەورە دێتە خوارەوە لەناو سێبەری چەند هەورێکدا لەعەرشەوە بۆ کورسی، لەو ڕۆژەدا ئاسمان پارچە پارچە دەبێت بەپەڵە هەور، وە فریشتەکان دێنە خوارەوە بەخێرایی وەك خوای

---

[٣٦] اخرجه : احمد (٢/١٠٥)، والبخاري (٤٩٣٨)، ومسلم (٢٨٦٢)، وابن حبان (٧٣٣١) قال محققه : اسناده صحيح على شرطهما.

[٣٧] اخرجه : ابو داود (٧٦٦)، وابن ماجة (١٣٥٦)، وابن حبان (٢٦٠٢) وقال محققه : اسناده حسن، والنسائي (٢٠٩/٣).و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٨٧٤) واللفظ له، و((صحيح ابي داود )) (٧٤١)، و((صحيح ابن ماجه)) (١١١٥).

[٣٨] اخرجه: الطبراني في ((الكبير))) (٩٧٦٣)، والحاكم (٣٧٦/٢) صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الالباني في((مختصر العلو)) (ص :١١٠)(٦٩)، وفي ((شرح العقيدة الطحاوية)) (ص: ٢٦٤) : حديث صحيح،وعبد الله بن احمد في : ((كتاب السنة)) (١٢٠٣) قال محققه : إسناده حسن.

گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ۚ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ عَسِيرًا ﴾ (الفرقان: ٢٥ - ٢٦). وە زەوی ڕووناك دەبێتەوە بە (نور)ی خوا وەك خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا .... ﴾ (الزمر: ٦٩). ئەنجا خوای گەورە دێت پاشان مەلائیکەکان پۆل پۆل دێن وەك خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴾ (الفجر: ٢٢)، هاتنە خوارەوەی خوای گەورە لەوانەیە بۆ ئاسمانی دونیا بێت لە ئیبنو عەباسەوە (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویت: ((...ثُمَ يَنزِلُ إلى السَّماءِ الدُنيا فيُنادي لِمَنِ المُلك اليـوم، لِلّـهِ الواحِـدُ القَّهـار))[٣٩] واتە: (...دواتر دێتە ئاسمانی دونیا و ئەفەرمویت موڵك ئەمڕۆ بۆ کێ یە بۆ خوای تاك و تەنهای بەزێنەرە) ، (الله اعلم ) خوای گەورە خۆی زاناترە ئەوەش پێش گۆڕینی ئاسمان و زەوی یە یاخود لەدوای ئەوانەدایە.

## چاوەڕێی خەڵکان بۆ یەکلابوونەوەی چارەنووسیان

لە کاتی هاتنە خوارەوەی خوای گەورە سەرجەم خەڵکان و هەموو بونەوەران لەهۆشی خۆیان دەچن (والله اعلم) یاخود دەمرن وەك زانای پایە بەرز ئیبنو قەیمی جەوزی (رحمه الله) دەفەرمویت، ئەوەش لەفەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا هاتووە (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویت:((إنَّ الناسَ يَصعقُونَ يَوم القيامَة، فأكونُ أوّلَ مَنْ يَفيقُ [ في رواية: أوّل من يُرفع رأسهُ][٤٠] فإذا موسى آخذٌ بقائمةِ العرش، فَلا أدري أفاقَ قبلي أم جوزيَ [أحوسَب][٤١] بصعقتهِ يوم الطُورِ))[٤٢] واتە: (خەڵکان دەبوورێنەوە لەڕۆژی کۆتاییدا، من یەکەم کەس دەبم کە بەئاگا دێمەوە (لەڕیوایەتێکدا: یەکەم کەس دەبم کە سەرم بەرز دەکەمەوە) دەبینم موسا دەستی گرتووە بەپێچکەیەکی عەرشەوە نازانم پێش من

---

[٣٩] اخرجه : الحاكم (٤٣٧/٢) و صححه على شرط مسلم و ووافقه الذهبي.و صححه الشيخ الألباني في ((مختصر العلو)) رقم (٩٤) و قال : إسناده صحيح على شرط مسلم، وحسن إسناده محقق : كتاب السنة – عبدالله احمد بن حنبل رقم (٢٢٠).

[٤٠] أخرجه : الترمذي (٣٢٤٠)، وابن ماجة (٤٢٧٤)، وابن حبان (٧٣١١) و قال محققه : اسناده حسن.

[٤١] أخرجه : ابن ماجة (٤٢٧٤) : ((أوكان ممن استثنى الله عزوجل...)) و صححه الشيخ الألباني في : ((صحيح إبن ماجة)) (٣٤٤٨).

[٤٢] اخرجه : البخاري (٢٤١١)، مسلم (٢٣٧٣)، و ابوداود (٤٦٧١).

بەئاگا هاتۆتەوە، یاخود خوا ئەوی تووش نەهێناوە و خستویەیتە بری بورانەوەکەی لە ڕۆژی (طوردا)، زانای پایە بەرز ئیبن ئەبی عیز (رحمه الله) دەفەرموێت: "... وهذا الصَعِقُ في مَوقفِ القيامةِ، إذا جاء الله لفصل القضاء و اشرقت الأرض، فحينئذٍ يَصعُقُ الخَلائق كلّهم... لتجلي الله لعباده، إلاّ موسى (عليه السلام) فانه جوزي بصعقته يوم الطور... ))[٤٣].

واتە:(..... ئەم بورانەوەیە لەمەحشەردایە کە جێگای وەستانە لە ڕۆژی کۆتاییدا ئەویش کاتێك کە خوای گەورە دێت بۆ یەك لاکردنەوە و زەوی ڕوناك دەبێتەوە ئا لەو کاتەدا بونەوەران هەموویان لە هۆش خۆیان دەچن بە خۆنیشاندانی خوای گەورە بۆ بەندەکانی تەنها موسا نەبێت (عليه السلام) چونکە ئەو پاداشتی دراوەتەوە بەو لە هۆش خۆچونەی کە توشی هاتووە لە ڕۆژی کێوی (طور) دا )، هەروەها ئەمەش دەقاو دەق بۆ چوون و قسەی زانای پایە بەرز (ابن القيم)ە لە کتێبی(الروح) دا (لاپەڕە ٣٥) ، بەڵام شەیخ ئەلبانی بۆچونێکی جیاوازی هەیە لەم بارەیەوە لە ((مختصر شرح العقيدة الطحاوية) (ص: ٢٦١)). دەفەرموێت: ((وهذه الصعقة الثانية انماهي صعقة البعث، وليست صعقة تقع لفصل القضاء)).واتە:(ئەم بورانەوەی دووەمە بۆ زیندووکردنەوەی بونەوەرانە نەك بورانەوەیەکی تایبەتە کە لەکاتی یەك لاکردنەوە دێتە دی).

وە دوای بەهۆش هاتنەوەی خەڵکان خوای گەورە فەرمان دەکات کە دۆزەخ بهێنرێت و نزیك بکرێتەوە لە خەڵکان بۆ ئەو کەسانەی کە دەتوانن ببینن لەو ڕۆژەدا و کوێر نین، وە ئەو بینینە بۆ بێباوەڕان زۆر سەخت دەبێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴾ (النازعات: ٣٦) وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَرَضۡنَا جَهَنَّمَ يَوۡمَئِذٍ لِّلۡكَٰفِرِينَ عَرۡضًا ﴾ (الكهف: ١٠٠) واتە: ﴿دۆزەخ لەو ڕۆژەدا نیشانی کافران دەدەین و بەتەواوەتی دەری دەخەین﴾.

وە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ ..... ﴾ (الفجر: ٢٣) ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:((... ثُم يُؤتى بجهنم تُعرَض كأنها سرابُ...))[٤٤] واتە: (... ئەنجا دۆزەخ دەهێنرێت نیشان دەدرێت وەك سەراب) (واتە:وەك دەریایەکی دوور دێتە پێش چاو...)، وە دۆزەخیش زۆر زۆر

---

[٤٣] انظر: ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٢/٦٠٢).

[٤٤] اخرجه : البخاري (٤٩١٩).

گەورەیە تەنانەت بەچەندین ملیار مەلائیکە ئنجا هەڵدەگیرێت و دەهێنرێت وەکو ئیبنو مەسعود (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يُؤتى بجَهَنَمَ [..في رواية: بالنار...] يومَ القيامَة لها سبعون ألفَ زمام مع كل زِمامٍ سبعون ألفَ مَلَكٍ يَجرُّونَها))[٤٥] واتە:(دۆزەخ لەڕۆژی کۆتاییدا دەهێنرێت، حەفتا هەزار (زمام)[٤٦]ی (واتە:جڵەوڵ)ی هەیە هەر (زمام)ێك حەفتا هەزار مەلائیکە ڕای دەکێشن ).

کاتێ ستەم کاران ئاگر دەبینن پەشیمان دەبنەوە لە کردەوەکانیان و هیوا دەکەن بیان گەڕێننەوە بۆ دونیا بەڵام هەرگیز ئەو ئاواتەیان نایەتەدی، و زۆر زەلیل و ڕیسوا دەبن و ناوێرن تەماشای دۆزەخ بکەن تەنها بەتیلەی چاو نەبێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ..... وَتَرَى ٱلظَّـٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَـٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِىٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴾ (الشورى: ٤٤ – ٤٥).

دۆزەخ لە دوورەوە خەڵکان دەبینێت، ناڵە و گرمەیەکی زۆری هەیە و زۆر بەداخ و تووڕەیە لە بێ بڕوایان وتاوانباران، و خەڵکانیش لە دوورەوە گوێیان لە ناڵەو گرمە و تووڕەبوونی دۆزەخ دەبێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴾ (الفرقان: ١٢)، کەعبی کوڕی مالیك (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:((والّذي نفسي بِيَدهِ إن لِجَهَنّم يومَ القيامةِ لَزَفرةً ما يَبقى مِنْ مَلَكٍ مُقَرّبٍ ولا نبي مُرسَلٍ إلاّ لَيَخِرُّ لِرُكبَتَيه حتّى إنَّ إبراهيمَ خَليلُ الله يقولُ: ربِّ نفسي نفسي))[٤٧] واتە: (سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە دۆزەخ لە ڕۆژی کۆتاییدا ناڵەو گرمەیەکی هەیە هیچ مەلائیکەیەکی نزیك و هیچ پێغەمبەرێکی نێرراو نی یە کە بەسەر ئەژنۆدا نەکەوێت هەتا ئیبراهیمی خەلیل دەفەرموێت: خوایە تەنها نەفسی خۆم خوایە تەنها

---

[٤٥] اخرجه : مسلم (٢٨٤٢)، والترمذي (٢٦٩٨)، والحاكم (٤/٥٩٥).

[٤٦] زمام:لە (زمامُ الناقة) وەرگیراوە مەبەست ئەو ڕەشمەیەیە کە بەلغاوی حوشترو ئەسپەوە بەستراوەو بەدەست خاوەنەکەیەتی کاتێ کە سواری پشتی دەبێت.

[٤٧] اخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٩٧٦٣)، والحاكم (٢/٣٧٦) و صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((مختصر العلو)) (٦٩).

نەفسی خۆم). هەر لە دوورەوە دۆزەخ بریسکە و ئاگری وەك کۆشك هەڵدەدات بەئاسماندا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ ﴾ (المرسلات: ٣٢ - ٣٣). دۆزەخ کە دەهێنرێت زۆر باش گەرم کراوە و ئامادەکراوە بۆ بێباوەڕان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴾ (التكوير: ١٢). دیارە لەبەر گەرمی ئەو ڕۆژە و لە سەختی گەرمای دۆزەخ و پریشك و پزیشکەکانی هەموو زەوی گەرم دەبێت وەك لە ڕیوایەتێکی (ضعیف) دا هاتووە ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەفەرموێت: ((الأرضُ كلّها نار يومَ القيامة، و الجَنّةُ من وَرائِها يَرونَ كواعبها و أكوابها))[٤٨] واتە: (زەوی هەمووی ئاگرە لە ڕۆژی کۆتاییدا، وە بەهەشتیش لە دوای ئاگرەکەوە وحۆریەکان و کوپەکانی دیارە).

لەو ڕۆژە گەرمەدا گەرمایی دۆزەخ ئەوەندە زۆرە لە دووری چل ساڵەوە کافر وادەزانێت کەوتۆتە ناو دۆزەخ و نازانێت کە هێشتا چل ساڵ لێی دوورە. وەك ئەبو هورەیرە(ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((يُنصَبُ للكافِر يومَ القيامةِ مِقدَار خَمسِين ألفَ سَنةٍ " [كما لم يعمل لله في الدنيا ] و إنَّ الكافِرَ يَرى جَهَنم وَيَظُنُّ إنَّها مُواقِعَتُهُ مِن مَسيرةِ أربَعين سَنَة))[٤٩] واتە: ( کافر لەڕۆژی کۆتاییدا ئەندازەی پەنجا هەزار ساڵ دەوەستێنرێت لەبەر ئەوەی هیچ کارێکی بۆ خوا ئەنجام نەداوە لە دونیادا و دۆزەخ دەبینێ و وادەزانێت خراوەتە ناوی یەوە لەدووری چل ساڵەوە) .

---

[٤٨] أخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٨٧٧١)، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٣٦/١٠) رجاله رجال الصحيح، وقال المنذري في ((الترغيب)) (١٨٣/٦) : رواه الطبراني و إسنادة جيد قوي، وضعفة الشيخ الالباني في ((ضعيف الترغيب)) (٢٠٩٢) و اوردناه للعلم فقط.

[٤٩] اخرجه : احمد (٧٥/٣)(١١٧١٤) وقال محققه : حسنٌ لغيره، و أبو يعلى (١٣٨٥)، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٣٦/١٠) : رواه احمد و أبويعلى و إسناده حسن، و الحاكم (٥٩٧/٤) و صححه، وإبن حبان (٧٣٥٢) و قال محققه : إسناده حسن.

# شەفاعەتی گەورە (الشفاعه الكبرى)

لەمەحشەردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە ئومەتەکەی لەسەر تەپۆڵکەیەك دەبن، کەعبی کوڕی مالك (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((يُبعَثُ الناسُ يَومَ القيامَةِ فَأكونُ أنا و أُمَتي على تلٍ فيكسُوَني رَبّي حُلةً خضراء [في رواية: حمراء] ثُمَ يَؤذَنُ لي فَاقول ماشاء اللّه أن أقوْلَ فذَلِكَ المُقامُ المحمود))[٥٠]. واتە: (خەڵکان زیندوو دەکرێنەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا من و ئومەتەکەم لەسەر تەپۆڵکەیەك دەبین و خوای گەورە جل و بەرگێکی سەوزم بەبەردا دەکات و (لە ڕیوایەتێکدا سوور) ئەنجا ڕێگەم دەدات و ئەوەی خوا بیەوێت بیڵێم لەوێدا دەیڵێم و ئەوە پایەی سوپاس کراوە (المقام المحمود))، عەبدوڵای کوڕی عومەر دەفەرموێت: ((المقام المحمود: يَحمدُه اهلُ الجمع كُلهم))[٥١] (المقام المحمود) واتە: (ئەو جێگە وەستانەیە کە هەموو ڕاوەستاوەکانی گۆڕەپانی مەحشەر سوپاسی دەکەن).

ناڕەحەتیەکانی گۆڕەپانی مەحشەر و ناڕەحەتی چاوەڕێکردن تێیدا زۆر گەورە دەبێت ، ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((... فالخَلقُ مُلجَمُون في العرقِ فأمّا المؤمِنَ فَهو عليه كالزّكمةِ، وأما الكافِرُ فيتَغَشاهُ الموتُ...))[٥٢]. واتە: (دروست کراوان تا لغاوەیان لەعارەق دایە لەوێدا خاوەن باوەڕان وەك هەڵامەت وایە لەسەریان بەڵام کافر وەك مردن و ڕوح کێشان تووشی دەبێت).

ئالەو کاتەدا ڕاوەستاوانی گۆڕەپانی مەحشەر بەپەرۆشەوە دەگەڕێن بەدوای یەکێکدا کە تکایان بۆ بکات و لەو ناڕەحەتیانە ڕزگاریان بکات، وە پێغەمبەرانیش ئەم کارەیان پێ ئەنجام نادرێت تەنها پێغەمبەری پایە بەرزمان(محمد) نەبێت (ﷺ)، ئەبو

---

[٥٠] اخرجه : احمد (٤٥٦/٣) رقم (١٥٧٨٣) و قال محققه الشيخ الأرناؤوط : إسناده صحيح على شرط المسلم، والطبراني في ((الكبير)) (١٤٢/١٩)، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٧٧/١٠) : أحد اسنادي ((الكبير)) رجاله رجال الصحيح، ابن حبان (٦٤٧٩)، و الحاكم (٣٦٣/٢) و صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٧) و (٢٤٦٠)، وفي رواية : (المقام المحمود الشفاعة) رواه احمد، المسند رقم (١٠٢٠٠) و قال محققه الارناؤوط : حديث حسن لغيره.

[٥١] انظر : رواية : ((السلسلة الصحيحة)) (٢٤٦٠).

[٥٢] اخرجه : احمد (١٧٨/٣)، وابن خزيمة ((التوحيد)) (٦١٦/٢)، وقال الشيخ السفاريني في ((لوامع الأنوار البهية)) (٢٥٥/٢) : رواه احمد بسند صحيح، وقال الشيخ مقبل في ((كتاب الشفاعة)) (٦٨) : حديث حسن، وصححه الألباني في ((صحيح الترغب)) (٣٦٣٩).

هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (([أنا سَيّدُ النّاسِ يومَ القيامةِ... يجمَعُ اللّٰه النّاسَ الأولين و الآخرين في صعيدٍ واحدٍ فَيُسمِعُهُم الداعِي ويُنفِذُهُم البصر [في رواية:الناظِرُ...][٥٣]، وَتدنوا الشَمسُ مِنهُم، فتَبلُغُ النّاسُ من الغمّ و الكَربِ ما لا يطيقون ولا يَحتمِلوَنَ [فيقولون: لو إستشفَعَنا إلى رَبّنا حتّى يُريحَنا مِن مكانِنا هذا] [٥٤]، فيقول الناسُ بعضُهم لبعضٍ [ألا تَرون ماأنتم فيه، ألاّ تَرَونَ ماقَد بَلَغكُم، ألاّ تَنظُرون إلى مَن يَشفع لَكم إلى ربكم، فيقول بَعضُ الناسِ لبعضٍ][٥٥] عليكم بآدَمَ فَيأتُونَه فيقولُونَ: يا آدمُ أنت أبو البَشرِ، خَلَقَكَ اللّٰه بيدهِ [وَنَفخَ فيكَ مِن رُوحِهِ، و أمرَ المَلائِكةَ فَسجَدُوا لَكَ و أسكَنكَ الجَنةَ [وَعَلّمكَ أسماءَ كُلَ شَيءٍ][٥٦] ألاّ تَشفعُ لنا إلى رَبِّكَ، ألاّ تَرى ما نَحنَ فيهِ وَ ما بَلَغنا [فاشفَعَ لَنا عندِ ربكِ يُريحَنا مِن مَكانِنا هذا][٥٧] فيقول: [قد لَقيتُ مثلِ الذي لقيتم][٥٨] رَبّي غضَب غضباً لَم يَغضب قَبلَهُ مثلَهُ " ولاَ يَغضبُ بَعدهُ مِثلَهُ " وَنَهاني عَنِ الشَجرةِ فَعَصَيتهُ [٥٩] [فَأخافُ أن يَطرُحَني في النّارِ][٦٠] [فَيستَحي رَبَّهُ مِنها (أي من الخطيئة)][٦١] إذهبوا إلى غيري إذهبوُا إلى نُوحٍ [إنطلقوا إلى أبيكم بعد ابيكم][٦٢] [فإنهُ أولَ رسَولٍ بَعثهُ اللّٰه إلى أَهلَ الأَرضِ][٦٣] فيَأتُونَ نُوحاً فَيَقولُونَ: يا نوحُ أنتَ أَوّلُ الرُسلُ الى أهلِ الارضِ وَقَد سَماكَ اللهُ عَبداً شكوراً [واستجابَ لَكَ في دُعائِكَ][٦٤]...... الا تَرى إلى مانَحنُ فيهِ؟ " ألا تَرى ماقَد بَلَغنا [ألاّ تَشفعُ لَنا إلى رَبِّكَ][٦٥] فيقول هم [ليس ذاكم عندي] إنَّ رَبّي قد غضب اليوم غضبا " لم يغضب قبله مثله ولن يغضب بعده مثله، وانه قد كانت لي دعوة دعوت

---

[٥٣] اخرجه : مسلم (٤٧٩).

[٥٤] اخرجه : البخاري (٦٥٦٥-٧٥١٦).

[٥٥] اخرجه : مسلم (٤٧٩).

[٥٦] في رواية البخاري (٤٤٧٦).

[٥٧] في رواية إبن ماجة (٤٣١٢)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن إبن ماجة)) (٣٤٨١).

[٥٨] في رواية احمد في ((المسند)) رقم (١٥) و قال محققه : شعيب الأرنؤوط : إسناده حسن.

[٥٩] في رواية البخاري (٤٧١٢) (٦٥٦٥).

[٦٠] في رواية إبن حبان (٦٤٦٥) و قال المحقق : إسناده صحيح على شرطهما.

[٦١] اخرجه : مسلم (١/١٠٠) كتاب الإيمان : باب اثبات الشفاعة، رقم (٤٧٤).

[٦٢] اخرجه: احمد في ((المسند)) رقم (١٥) و قال محققه : شعيب الأرنؤوط : إسناده حسن.

[٦٣] اخرجه : البخاري (٤٤٧٦-٧٤١٠)، و إبن ماجة (٤٣١٢)، وصححه الشيخ الألباني في((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٨١).

[٦٤] اخرجه : احمد في ((المسند)) رقم (١٥) وقال محققه : شعيب الارناؤوط : اسناده حسن.

[٦٥] في رواية البخاري : (٣٣٤٠).

بها على قومي [ويَذكُرُ سُؤلَهُ رَبّهُ ما لَيسَ لَه بِـهِ علـمٌ فيستحي][٦٦] (أي فيقـول): نفسـي نفسـي [أَخافُ أن يَطرُحَني في النّار][٦٧] اذهبوا [إلى غَيري][٦٨] اذهبـوا الى [خَليـلِ الـرّحمن][٦٩] ابـراهيم، فيأتونَ الى ابراهيم فيقولون:أنت نبـي الله و خَليلَهُ مِن أهلِ الأرضِ، إشفَعْ لنا إلى رَبِّكَ، ألا ترى مـا نحنُ فيهِ، ألا ترى ما قد بَلَغنا: فيقولُ إبراهيم: [ليس ذاكم عندي] إنَّ رَبِّي قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله ولا يغضب بعده مثله[٧٠] واني قد كذبت ثـلاث كـذبات فَـذَكَرَهُنَّ ، في روايـة وذكرها رسول الله (ﷺ) في حديث ابي هريرة، عن أبي هريرة مرفوعاً: ((لم يَكذِب إبـراهيم (عليـه السلام)عن شيء قط، الا في ثلاث: قوله (اني سقيم) ولم يكن سقيماً، وقوله لِسارة (أختي)، وقولـه (بل فعله كبيرهم هذا) ))][٧١]، [فأَخافُ أَن يُطرُحَني فِي النّارِ][٧٢] نفسي نفسي نفسي، اذهبـوا الى غيري، اذهبوا الى موسى [عَبداً كَلّمَهُ اللهُ وأعطاهُ التوراةَ][٧٣] فيأتونَ مُوسى، فَيَقُولـونَ: يـا مُوسَـى أنتَ رَسُولُ اللّهِ فَضَّلَكَ برِسالاتِهِ و بِكلامِهِ على البَشـرِ، إشـفِع لَنـا إلى رَبـكَ: ألاَ تَـرى مـا نَحَـنُ فِيهِ][٧٤] ألاَ ترى ماقدبَلغنا فيقول لَهُم مُوسَى (عليه السلام) إنَّ رَبّي قَد غَضَبَ اليَومَ غَضَباً لَم يَغضب قبلَهُ مِثلَهُ ولَن يَغضَبَ بَعدَهُ مِثلَهُ، و إني قَد قَتَلتُ نَفَساً لَم أؤمَرَ بِقتلها نفَسي نفَسّي [أخافُ أَن يَطـرُحَني فِيَ النّار][٧٥] [إذهبوا إلى غَيري][٧٦] إذهبوا إلى عِيسى (عليه السلام)، فَيأتونَ عيسى فيقولُـونَ: يـا عيسـى أنتَ رَسُول اللّه [وكَلمِتَهُ][٧٧] و كلّمَتَ النّاسَ في المَهدِ... فَيقُولُ: إنَّ رَبّي قَد غَضبَ اليَـومَ غَضَبـاً لَم يَغَضب قَبلَهُ مِثلَهُ وَلَن يَغضَبَ بَعدَهُ مِثلَهُ [و أَخافُ أن يَطـرُحَني فِـيّ النّـار][٧٨] (وَلَـم يَـذكرُ لَـهُ

---

[٦٦] في رواية البخاري (٤٤٧٦).

[٦٧] في رواية ابن حبان (٦٤٦٥) وقال محققه : اسناده على شرطهما.

[٦٨] في رواية الترمذي (٢٤٣٤) وقال : حسن صحيح.

[٦٩] اخرجه : البخاري(٤٤٧٦).

[٧٠] اخرجه : مسلم (١٠٣/١).

[٧١] اخرجه : الترمذي (٣١٦٦) وقال حسن صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٥٣٢).

[٧٢] في رواية ابن حبان (٦٤١٥) وقال محققه اسناده صحيح على شرطهما.

[٧٣] مسلم (١٠٠/١)، وابن ماجة (٤٣١٢).

[٧٤] أخرجه : مسلم (١٩٤)، والترمذي (٢٤٣٤) و قال حسن صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٢)، و اللفظ للترمذي.

[٧٥] إبن حبان (٦٤١٥).

[٧٦] الترمذي (٢٤٣٤).

[٧٧] الترمذي (٢٤٣٤).

[٧٨] إبن حبان (٦٤١٥).

ذنباً): نَفسي نَفسي، إذهَبوا إلى غَيري، إذهَبُوا إلى مَحَمـدٍ [عَبـداً قَـد غُفِرَلَـهُ مَاتَقَـدم مِـن ذَنبِـه وَ مَاتأخَر](٧٩) فيأتُوني، فيقُولونَ: يا محمَّد أنتَ رَسولَ اللّه وَ خاتمُ الأَنبياءَ وَغَفَرَ الله لَـكَ مَاتَقَـدَم مِـن ذَنبِكَ وما تأخَر، إشفَعْ لَنا الى رَبّكَ، أَلاَ تَرى مانَحنُ فيه، ألا تَرى ماقَد بَلَغَنا، وفي رواية: [ اذ جـاء عيسى (عليه السلام) فقال: هذه الانبياء قد جاءتك يامحمد يسألون او قال: يجمعون اليك ويدعون الله ان يفرّق بين جمع الامم الى حيث يشاء لعظم ماهم فيه..... قال (اي النبي ﷺ): ياعيسى انظـر حتـى ارجع اليك قال: وذهب نبـي الله فقـال تحت العـرش فلقـي مـالم يلـق ملـك مصـطفى ولانبـي مرسل](٨٠) فأنطلِقُ فآتيَّ تَحتَ العَرشِ [فاستِأذن على رَبيِّ فَيُؤذَن لي فإذا أنا رأيتهُ وَقَعتُ سَـاجِداً] لِرَبيّ، ثُمَ يَفتَحُ الله عليَّ [فاقَومُ بَين يَدهِ فاحَمدُه بمحامدٍ](٨١) وَحُسنَ الثَناءِ عَليـهِ شَـيئاً لَـم يَفتَحُـه لأَحدٍ قَبلي [لا أَقدِرُ عَليهِ الآنَ](٨٢) ثُمَ يُقالُ: يامُحَمَدُ إرفَع راسَكَ، سَل تُعطهَ واشفَع تُشَّفَع فـارفع رأسي(٨٣)، [....((ثُمَ يُؤذَنُ لي في الشِفاعةِ،فأقَولُ: يارب عِبادَكَ عَبدُوكَ في أطرافِ الارضِ، فـذلِكَ المقامُ المَحمُود)) ] (٨٤).

**واتە: من سەروەری كوڕانی ئادەمم لەڕۆژی كۆتاییدا ... خوای گەورە خەڵكان لەیەكەمەوە تا كۆتاییان كۆدەكاتەوە بەیەكەوە لەیەك جێگەدا بانگەواز كار دەنگی دەگاتە گوێی هەمووان و، هەمووشیان یەكتر دەبینن (و تەماشاكاریش دەیانبینێت) وە ڕۆژ لێیان نزیك دەبێتەوە، لەوێدا خەڵكان بە خەم و خەفەتێك دەگەن كە لە وزەو تواناياندا نی یە و نایتوانن ( دەڵێن: بۆ تكاكار نەبین لای پەروەردگاری خۆمان تا ڕزگارمان بكات، هەندێكیان بەهەندێكیان دەڵێن: ئەرێ نابینن ئێوە لەچی دان ؟ ئەرێ نابینن ئەو حاڵەی پێی گەیشتوون ؟ ئەوە بۆ تەماشا ناكەن تا یەكێك بدۆزنەوە بچێت**

---

(٧٩) البخاري (٤/٢٢١٢).

(٨٠) أخرجه : أحمد (١٢٨٢٤)، وابن خزيمة (التوحيد ) (٢/٦١٦) وقال الشيخ مقبل في ((كتاب الشفاعة)) (٦٨) : حديث حسن، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٦٣٩).

(٨١) مسلم (١/١٠٢).

(٨٢) مسلم (١/١٠٢).

(٨٣) مسلم (١/١٠٣).

(٨٤) اخرجه : الحاكم (٤/٥٧٠) و صححه على شرطهما وقال محققه رقم (٨٧٤٢) :مرسل وسنده صحيح على شرط الشيخين، و قد ورد عند البيهقي ((شعب الإيمان)) (٣٠٣) بلفظ ((فأقولُ : يا رَبِّ إنّي تَرَكتُ عِباداً مِنْ عِبادِكَ قد عَبَدوكَ في أطرافِ البِلادِ، و ذكروكَ في شُعبَ الآكام، ينتظرونَ جوابَ ما أجيءُ بِهِ مِنْ عِندِكَ، فَيقول، أمّا إنّي لا أخزيكَ فيهم، قال رسول الله (ﷺ) فذلِكَ المقام المحمود الذي قال الله عز و جل [عسى أنْ يَبعَثَكَ رَبُّكَ مقاماً محموداً])) و قال البيهقي : ((شعب الإيمان)) (١/٢٨٦) : وهذا الحديث يجمع شفاعة النبي (ﷺ) لأهلِ الجمعِ حتى يحَهُم مِن مَكانِهِم....

تکاتان بۆ بکات لای پەروەردگاری خۆتان؟ ئەنجا خەڵکان هەندێکیان بەهەندێکیان دەڵێن بچن بۆلای ئادەم،دەچن بۆلای و پێی دەڵێن: ئەی ئادەم تۆ باوکی ئادەمیزادانی، خوای گەورە دروستی کردوویت بەدەستی خۆی وە فووی پیاکردیت لەرووحی وە فەرمانی کرد بەمەلائیکەکانی کە سوجدەت بۆبەرن وە نیشتەجێی بەهەشتی کردیت، وە ناوی هەموو شتێکی فێر کردیت، ئەرێ بۆ تکامان بۆ ناکەیت لای پەروەردگاری خۆت؟ ئایا نابینیت لەچیداین و گەیشتووین بەچی؟ تکامان بۆ بکە لای پەروەردگاری خۆت تا بمان حەوێنێتەوە و ڕزگارمان بکات لەم جێگەیەی کە تیایداین دەفەرموێت: (واتە ئادەم) ئەوەی کە پێتان گەیشتووە بە منیش گەیشتووە، پەروەردگارم توڕەبوونێك توڕە بووە لەمەو پێش بەم شێوەیە توڕە نەبووە، وە لەمەو دواش بەو شێوەیە توڕە نابێت، وە ئەو درەختەکەی لێ قەدەغەکردبووم و سەرپێچیم کرد، ئەترسم کە فڕێم بداتە ناو ئاگر،( پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: بەهۆی ئەوەوە شەرم دەکات کە داوا لە پەروەردگاری خۆی بکات) دەڵێ: بڕۆن بۆلای یەکێکی تر، بچن بۆلای نوح، بڕۆن بۆلای باوکی دووەمتان دوای باوکی یەکەمتان، ئەو یەکەم نێردراوە کە خوا ناردوویەتی بۆلای خەڵکانی سەر زەوی، ئەنجا دەچن بۆ لای نوح و پێی دەڵێن: ئەی نوح تۆ یەکەم نێردراوی بۆلای خەڵکانی سەر زەوی وە خوای گەورەش ناوی لێ ناویت بەندەی سوپاس گوزار و (دوعاکەی لێ وەرگرتیت) ئایا نابینیت ئێمە لەچیداین ؟ ئایا نابینیت چیمان پێ گەیشتووە؟ ئایا تکامان بۆ ناکەی لای پەروەردگارت ئەویش دەڵێت:(واتە:نوح) ئەوەی ئێوە دەتانەوێت لای من نی یە، پەروەردگارم ئەمڕۆ تووڕە بوونێك توڕە بووە، لەمەو پێش بەو شێوەیە تووڕە نەبووە ولەمەو دواش بەو شێوە توڕە نابێت، وەمن تاکە دوعایەکم بۆ هەبوو دژ بە قەومەکەم کردم (پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: وە یادی داواکردنەکەی لەپەروەدگاری دەکاتەوە سەبارەت بەوەی کە زانستی نەبوو لەبارەیەوە، واتە: داواکردنەکەی بۆ کوڕەکەی کە بی پارێزێت لە تۆفانەکە) وە شەرم دەکات و دەفەرموێت: تەنها نەفسی خۆم تەنها نەفسی خۆم: ئەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە، بڕۆن بۆلای کەسێکی تر جگە لەمن، بچن بۆلای خۆشەویستی خوا (ئیبراهیم)، دەچن بۆلای ئیبراهیم و پێی دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خۆشەویستی خوای لەناو خەڵکانی سەر زەوی دا، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینیت ئەوەی ئێمە تیایداین؟ ئایا نابینیت چ نارەحەتیەکمان

پێی گەیشتووە؟ ئیبراهیم پێیان دەڵێت: ئەوەی ئێوە دەتانەوێت لای من نی یە، پەروەردگاری من ئەمڕۆ تورە بونێك تووڕە بووە لەمەو پێش بەم شێوەیە هەرگیز تووڕە نەبووە و لەمەو دواش بەم شێوەیە تورە نابێت، وە من سێ درۆم کردووە باسیان دەکات ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەوسێ درۆیەی کردووە دەفەرموێت: ئیبراهیم هەرگیز درۆی نەکردووە لە هیچ شتێکدا تەنها سێ جار نەبێت: وتەکەی کە وتی: من نەخۆشم وە نەخۆشیش نەبوو، وە وتەکەی بۆ سارا کە وتی: ئەوە خوشکمە، وە وتەکەی: بەڵکو بتە گەورەکە وای لێ کردوون ) ئیبراهیم (عليه السلام) دەفەرموێت ئەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە، تەنها نەفسی خۆم تەنها نەفسی خۆم، بڕۆن بۆلای یەکێکی تر جگە لە من، بڕۆن بۆلای موسا، ئەو بەندەیە خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵدا کردووە و تەوراتی پێ بەخشیوە، دەچن بۆلای موساو پێی دەڵێن: (ئەی موسا تۆ نێردراوی خوایت، ڕێزو سەروەری پێبەخشیت بەهۆی نامەکانیەوە وە بەهۆی گفتوگۆکردنەکەی لەگەڵتا تۆی بەرزکردەوە بەسەر ئادەمیزادا، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینی ئێمە لەچیداین ؟ ئایا نابینیت چیمان پێگەیشتووە ؟ موسا پێیان دەڵێت:ئەوەی ئێوە دەتانەوێت لای من نی یە، پەروەردگارم ئەمڕۆ تورە بوونێك تورە بووە لەوەو پێش بەو شێوە تووڕە نەبووە لەمەودواش بەو شێوەیە تووڕە نابێت، وە من نەفسێکم کوشت کە فەرمانم بەکوشتنی پێ نەکرابوو، تەنها نەفسی خۆم تەنها نەفسی خۆم، ئەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە، بڕۆن بۆلای یەکێکی تر جگە لەمن، بڕۆن بۆلای عیسا (عليه السلام) دەچن بۆلای عیساو پێی دەڵێن: ئەی عیسا تۆ نێردراو (وشەی) خوایت، ولەسەر بێشکە قسەت لەگەڵ خەڵکاندا کردووە ئەویش دەڵێت: پەروەردگاری من ئەمڕۆ تورە بوونێك تووڕە بووە کەلەمەو پێش بەو شێوەیە تورە نەبووە لەمەو دواش بەو شێوەیە تووڕە نابێت، وە دەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە تەنها نەفسی خۆم تەنها نەفسی خۆم، بڕۆن بۆلای کەسێکی تر جگە لەمن بچن بۆلای موحەمەد (ئەو بەندەیەکە خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی پێش و پاشی خۆش بووە)، دێن بۆلای من و دەڵێن: ئەی موحەمەد تۆ نێردراوی خوایت و کۆتاهەمین پێغەمبەرانیت، و خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی سەرەتا و کۆتایت خۆش بووە و (لەم ڕۆژەشدا تۆ بێ ترس هاتوویت)، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینیت ئێمە لەچیداین ؟ ئایا نابینیت چ نارەحەتیەکمان پێگەیشتووە؟

لە ڕیوایەتێکدا [من وەستاوم چاوەڕێی ئومەتەکەم دەکەم، وعیسی (عليه السلام) دێت بۆ لام پێم دەڵێت: موحەمەد ئەوا هەموو پێغەمبەران دێن بۆ لات ولەگەڵتدا کۆدەبینەوە تا بچیت داوابکەیت لە خوای گەورە تا هەموو ئومەتەکان لەیەك جیابکاتەوە بۆ ئەو جێگەیەی کە خۆی ویستی لێیەتی: ئەوەش لەبەر گەورەیی و ناڕەحەتی ئەو ڕۆژەی کە تیایداین.. پێغەمبەریش دەفەرموێت: منیش دەڵێم: عیسی چاوەڕێ بکە تا دەگەڕێمەوە لات. ودەڕۆم تا لەژێر عەرشدا دەوەستم و ڕێزو پلەی یەکەمم پێ دەدرێت کە نەدراوە بەهیچ فریشتەیەکی هەڵبژێردراو وە بە هیچ پێغەمبەرێکی نێردراو]، منیش دەچم هەتا دەڕۆمە ژێر عەرش.

(لەڕیواتێکدا:ئیزن وەردەگرم لە پەروەردگار و ڕێگەم پێ دەدات وەمن کە دەیبینم دەچم بە سوجدەدا ) بۆ پەروەردگارم، ئینجا دەرووم لێ دەکاتە و دەوەستم لەبەردەمیدا سوپاسی دەکەم بەچەندین سوپاس وستایش کە بەهیچ کەسێك نەدراوە پێش من (ئێستا توانام نی یە بەسەریدا و نایزانم) ئینجا دەوترێت: (ئەی محمد سەرت بەرز کەرەوە داوا بکە تا پێت ببەخشرێت تکا بکە تا لێت وەربگیرێت ئینجا سەرم بەرز دەکەمەوە ) پاشان ڕێگەم پێ دەدرێت کە تکا بکەم و دەڵێم ئەی پەروەردگارم بەندەکانت بەندایەتی تۆیان کردووە لە هەموو جێگەیەکی سەر زەوی دا، ئەوەشە جێگەی سوپاس کراو (المقام المحمود). وە ئەم تکا گەورەیە پەیمانەکەی خوای گەورە یە کە بە پێغەمبەری خۆی داوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ٧٩ ﴾ (الإسراء: ٧٩).

هەروەها ئوبەی کوڕی کەعب رضي الله عنه فەرموویەتی:((اذا كان يوم القيامة كنت إمام النبيين و خَطيبهم و صاحب شفاعتهم من غير فخر))[٨٥] واتە: (لە ڕۆژی کۆتاییدا من پێشەوای پێغەمبەران و وتاربێژ و خاوەن تکاکاران دەبم بێ شانازی).

وەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا ئومەتەکەی دەبینێ و دەیانناسێتەوە بەو نیشانە تایبەتەی کە نیشانەی ئومەتی پێغەمبەری خوایە ئەویش سپیایەتی و درەوشاوەیەتی ئەو شوێنانەیە کە ئاوی دەست نوێژیان بەرکەوتووە.

---

[٨٥] أخرجه: أحمد (٢١٢٤٥) وقال محققه: اسناده حسن.

وەك ئەبو دەردا (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەفەرموێت: ((انا أولُ مَن يُؤذَنُ لَهُ أن يَرفَعَ رأسَهُ، فَانظُر الى مابَينَ يَديَ فَاعرِفُ أُمَتي مِن بَينَ الأُمَم، وَمِن خَلفيْ مِثلُ ذلك وعن يميني مثل ذلك (...اِنّ مَثلَ المسلمين في الكفّار كالبقرة البيضاءِ فيها الشَعرةُ السوداء)[٨٦]، فقال رجل: يارسول الله كيف تعرف أمّتك مِنْ بينِ الأمَم فيما بين نوح إلى أمّتك؟ قال: ((هُم غُرٌّ مُحجَلَوُنَ مِن أثرَ الوضُوءِ ليسَ أحَدٌ كذلِكَ غَيرُهُم...))[٨٧]. واتە: (من یەکەم کەسم کە ڕێگەم پێ دەدرێت بە سوجدە بردن لەڕۆژی کۆتاییدا، ومن یەکەم کەسم ڕێگەم پێ دەدرێت کەسەر بەرز بکەمەوە، تەماشای بەردەمی خۆم دەکەم ئومەتەکەم دەناسمەوە لەناو ئومەتەکانی تردا، وە لە پشتمەوە بەهەمان شێوە (.... نموونەی موسوڵمانان لە نێوان بێباوەڕاندا وەك موویەکی ڕەش وایە بەمانگایەکی سپی یەوە)، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ئومەتەکەت دەناسیەوە لە نێوان ئومەتەکانی (نوح)ەوە هەتا ئومەتەکەی خۆت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەوان (واتە: ئومەتی پێغەمبەری خوا) دەم وچاو و دەست و قاچ سپین بەهۆی جێگەی دەست نوێژەوە ئەوەش تایبەتە بەوانەوەو وە بۆ هیچ کەسی تر نی یە).

## دەرکردنی بەشی دۆزەخ

خوای گەورە (تبارك وتعالی) دێت بۆ یەك لاکردنەوەی بونەوەران زەوی ڕووناك دەبێتەوە پاشان(کتاب) دادەنرێت و بانگی پێغەمبەران و شاهیدان دەکرێت وەك خوای گـــەورە دەفـــەرموێت:﴿ وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾ (الزمر: ٦٩)، وە لـەو ڕۆژەدا یەکـەم کـەس کـە بـانگ دەکرێت باوکی هـەموو ئادەمیزادانە (ئادەم ﷺ)، ئەبو هـورەیرە (ﷺ) لـە پێغەمبـەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: ((أَوَّلَ مَن يُدعَى يَومَ القيامَةِ آدَمَ فَتَـتَراءى [لَـهُ] ذُرِّيَتـهُ، فَيُقـالُ: هـذا أبوكُم آدَمَ، فَيَقول: لَبَيكَ وَسَعدَيْكَ [والخيرُ في يَدَيك][٨٨] فيقول: أخرِج بَعثَ النـار مِـن ذرّيَتـكَ،

---

[٨٦]اخرجه : احمد (٦/٣٨٦)، والبخاري (٦٥٢٨)، ومسلم (٢٢١)، والترمذي (٢٥٤٧)، وابن ماجة (٢٥٤٧) عن ابن مسعود مرفوعا.

[٨٧] اخرجه : احمد (٥/١٩٩)، واسناده صحيح كما قال الشيخ الالباني في ((المشكاة)) (٢٩٩).

[٨٨] في رواية: ((إن الله تعالى يقول يوم القيامة لآدم ( عليه السلام ) : قم فجهز من ذريتك تسعمائة و تسع و تسعين إلى النار و واحد إلى الجنة)) فبكى أصحابه و بكوا ثم قال لهم رسول الله (ﷺ): ((ارفعوا رؤسكم فو الذي نفسي بيده ما أمتي في

فیقول: یارب كم اخرج [في رواية... وما بعثُ النّـار][89] فیقـول: أخـرج مِـنْ كُـلِّ مِائَـةٍ تِسْـعَةً وَتِسْعِينَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا أُخِذَ مِنَّا مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ فَمَاذَا يَبْقَى مِنَّا قَالَ:إِنَّ أُمَّتِي فِي الْأُمَمِ كَالشَّعَرَةِ الْبَيْضَاءِ فِـي الثَّـوْرِ الْأَسْـوَدِ))[90]. واتـه: (یەكـەم كـەس كـە بـانگ دەكرێـت لەڕۆژی كۆتاییدا ئادەمە و نەوەكانی خۆی لەپێش چاوە و دەیـان بینێـت و ئەوانیش دەی بینن و بەخەڵكان، دەوترێت ئائەوە ئادەمی باوكتانە، ئادەمیش دەڵێت: (لبیـك وَسَـعديك) (والخـيرُ في يَـدَيك)، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: كۆمەڵی دۆزەخ لـە نەوەكـەت دەربكە، ئادەم دەفـەرموێت: ئـەی پـەروەردگار چـەندێ دەربكـەم؟ (لەڕیوایـەتێكی تـردا: كۆمەڵی دۆزەخ كامانـەن؟) دەفـەرموێت: (واتـە: خـوای گـەورە دەفـەرموێت) لـە هـەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆكەس، هاوەڵان دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر لـە هەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆكەس دەربكرێت بۆ ناو ئاگر ئەوا چەندێك لـە ئێمـە دەمێنێتەوە (واتـە:بچێتە نـاو بەهەشـت) پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی ژمارەی ئومەتەكـەی من لـە نـاو ئومەتـەكانی تـردا وەك موویـەكی ڕەش وایـە بەمانگایـەكی سپی یـەوە)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ئەوە ئەو كاتەیە كە منالْ مووی سەری سپی دەبێـت و هەموو دووگیانێك سكەكەی دادەنێت و دەبینرێت خەڵكان سەرخۆشن، بـەڵام بەهۆی سەختی سزای خواوە سەرخۆشن، ئەو هەواڵە زۆر گران بـوو بەسـەر موسـوڵمانانەوە و گریان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:((سددوا وقاربوا وابشروا فوالذي نفسی بیده ما انـتم في الناس إلا كالشّامة في جنب البعير.... وإنَّ معكم لخليقتين ما كانتـا مَـعَ شَـيءٍ قَـطُّ إلاَّ كَثَّرَتَـاهُ: يأجوُجَ وَمأجُوجَ، ومَن هَلَكَ مِن كفَرَةِ الجِنِّ ولأنـسَ))[91] واتـە: (كارەكانتـان بـا بـەو شێوەیە بێ كە خواو پێغەمبەرەكەی بۆی داناون و لێی لامەدەن وە نزیكی بكەونـەوە و خـۆش مژدە بن، سوێند بەوەی كەنەفسی منی بەدەستە ئێوە لـەناو خەڵكانـدا وەك خاڵێك وان بەلاتەنیشـتی وشـترێكەوەیە .....وە ئێـوە دوو جـۆر دروسـت كراوانتـان لەگەڵـدان كـە

---

الامم إلا كالشعرة البيضاء في جلد الثور الاسود)). أخرجه :أحمد (٦ / ٤٤١ )، و قال الشيخ مقبل في : ((الجامع الصحيح)) (٦ /٣٨٠ ) : حديث حسن.

[89] في رواية.

[90] أخرجه: البخاري (٢٠/١٩١) (٦٠٤٨).

[91] أخرجه: الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (١٠/٣٩٤).

لەگەڵ هەر شتێكدا بن ژمارەی زۆر دەكەن: یەئجوج و مەئجوج، و ئەوانەی كەتیاچوون لەبێ باوەڕانی جنۆكە و مرۆڤ).

لەڕوایەتێكدا عەبدوللای كوڕی عەباس (ﷺ) سەبارەت بە زۆری ژمارەی (یأجوج ومأجوج) دەفەرموێت: ((الارض سبعة أجزاء فستة اجزاء منها یاجوج ومأجوج وجزء فیه سائر الخلق))[٩٢].واتە: (زەوی و(خاكی مەحشەر) دەبێتە حەوت بەش یەئجوج ومەئجوج لە شەش بەشیان دا دەبن و سەرجەم دروست كراوانی تر لە یەك بەشەكەی تردا دەبن).

لەڕیوایەتێكدا: ((أبشِروا فإنَّ مِن یأجُوجَ و مأجُوجَ الفاً و مِنكُم رَجلٌ..))[٩٣] وفي روایة اخرى: ((... فإنَّ مِن یأجُوجَ و مأجُوجَ تسِعمائةَ تسعةٌ و تسعُون ومِنكم رَّجلٌ))[٩٤]واتە: ( مژدە بێ هەزار لە یەئجوج ومەئجوجە و لەئێوە تەنها یەك كەس)، وە لەڕیوایەتێكی تردا: (......لەیەئجوج و مەئجوج نۆسەدو نەوەدو نۆ كەس وە تەنها لەئێوە یەك كەس ).

## ئاوات خواستنی بێ باوەڕ بەمردن

لەو ڕۆژە نارەحەتەدا دادپەروەری خوای گەورە دەگاتە ئەو ئاستەی كە مافی هەموو دروست كراوان دەگێڕێتەوە بۆ خاوەنەكانیان وە تۆڵە لەتاوانباران دەسێنێت و هەتا لەنێو ئاژەڵانیش دا هەر بەم جۆرەیە تۆڵەی بزنی بێ شاخ لەشاخدار دەستێنێتەوە پاشان خوای گەورە فەرمان دەكات كە ئاژەڵ و مێروو و باڵندە و بونەوەرانی تر جگە لەمرۆڤ و جنۆكە هەموو ببن بەخۆڵ، ئالەو كاتە دا بێ باوەڕانیش خۆزگە دەخوازن كە ئەوانیش ببونایە بەخۆڵ ، ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((إنَّ اللهَ یَحشرُ الخَلقَ كُلَّ دابَةٍ[٩٥] وطائرٍ وانسانٍ، [فیكون أول ما یقضی في ذلك الیوم بین الوحوش والبهائم ] حتى إذالَم یَبقَ تَبعةٌ عِندَ واحدةٍ لاخرى قال اللهُ: كُونُوا تُراباً " فعِندَ ذلِكَ یَقُولُ الكافِرُ: یالَیتَنی كُنتُ تُراباً))[٩٦]واتە: ( خوای

---

[٩٢] أخرجه: نعیم بن حماد ((الفتن))(١٦٢٥) وقال محققه : اسناده جید، و الداني (السنن)) (٦٧٤).

[٩٣] اخرجه : البخاري (٦٥٣٠)، ومسلم (٢٢٢)، والحاكم (٢٩/١)، وصححه الشیخ الالباني في ((صحیح الجامع)) (٢٥٨٣) : صحیح.

[٩٤] الحاكم (٣٨٦/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي موقوفاً.

[٩٥] الدابة : وهي ما یدب على الأرض، ویشمل جمیع الكائنات عدا الأنس و الجن.

[٩٦] اخرجه : ابن جریر (١٧/٣٠) بإسناد صحیح، كما قال الشیخ الالباني في ((السلسلة الصحیحة)) (١٩٦٦)، وابن ابي الدنیا ((الأهوال)) (٢٢١).

گەورە هەموو دروست کراوان لە مێروو وە باڵندە و ئادەمیزاد کۆدەکاتەوە و یەکەم دادوەری نێوان دڕندە و ئاژەڵەکان دەکات هەتا ئەو کاتەی کە مافی هیچ یەکێك بەسەر ئەوی ترەوە نامێنێت ئەنجا خوای گەورە دەفەرموێت: ببن بەخۆڵ (واتە: هەموو گیانداران جگە لە جنۆکەو مرۆڤ)، ئالە وکاتەدا بێ باوەڕ خۆزگە دەخوازێت کە ئەویش ببێت بە خۆڵ ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((لَتُؤَدُّنَّ الحقوقَ إلى أهلِها حَتى يُقادَ لِلشَاةِ الجَماءِ مِنَ الشَاةِ القَرّناءِ[٩٧]))[٩٨]. واتە: (مافەکان دەگێڕدرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان هەتا تۆڵە و مافی شەکی بێ شاخ دەستێنرێتەوە لەشەکی شاخدار).

## شایەتیدانی ئومەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر ئومەتانی ترەوە

خوای گەورە لەو ڕۆژەدا پرسیار لەپێغەمبەران و نێردراوان دەکات سەبارەت بەئەنجامدانی ئەرکەکانیان، وە پرسیاریش لە ئومەتەکانیان دەکات وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ (الأعراف: ٦)، ئالەو ڕۆژەدا ئومەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبن بەشاهید بەسەر ئومەتەکانی ترەوە کە پێغەمبەرانیان پەیامی خوایان پێ گەیاندون، ئەبی سەعیدی خودری(ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((يَجيءُ نُوحُ وأمّتهُ فَيَقُولَ الله تعالى: هَل بَلّغتَ؟ فَيَقولُ: نَعم أي رَبِ، فَيَقُولُ لأُمَتِهِ: هَل بَلّغَكُم ؟ فَيَقولُونَ: لاَ ماجاء نَا مِن نبي فيقولُ مَنْ يُشهِدُ لَكَ ؟ فيقولُ: محمد (ﷺ) و أمّتُهُ، فَنَشهَدُ أنّهُ قَد بَلّغَ وَهوَ قَولهُ تعالى: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ قُل .... ﴾))[٩٩] واتە: نوح و ئومەتەکەی دێن ( واتە: لەڕۆژی کۆتاییدا )، وخوای گەورە دەفەرموێت:ئایا پەیامی منت پێ گەیاندن ؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، خوای گەورە بە ئومەتەکەی دەفەرموێت پێی گەیاندن؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر پێغەمبەرمان بۆلانەهاتووە، خوای گەورە بەنوح دەفەرموێت

---

[٩٧] الجماء : وهي الشاة المكسورة القرن أو الذي لم يكن له قرنٌ أصلاً كي يدافع به عن نفسه...
و القرناء : هي الشاة الذي جعل الله له قرناً يدافع به عن نفسه.

[٩٨] اخرجه : مسلم (٢٥٨٢).

[٩٩] اخرجه : البخاري (٣٣٣٩).

کـێ شـاهیدیت بـۆدەدات ؟ ئـەویش دەڵێـت موحەمـەد (ﷺ) و ئومەتەکـەی، ئێمـەش شاهیدی دەدەین کە پەیامی خوای گەیاندووە وە ئەوەش فەرموودەکەی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ .... ﴾ (البقرة: ١٤٣).

لەڕیوایەتێکدا لەئەنەسەوە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((يَجيُ النبـي وَمَعَهُ الرَّجلان، ويَجيُ النبـي وَمَعَه الثلاثةُ، فاكثرَ مِن ذَلِكَ وأقلَ، فَيُقالُ لَهُ: هَل بَلّغتَ قومَكَ ؟ فيَقُولُ: نعم، فَيُدعى قَومَهُ فَيُقالَ: هَل بَلّغكُم، فيقولُون:لا، فيُقالُ: مَن يَشهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: مُحمدُ وأمّتهُ، فَتُدعَى أُمةُ محمدٍ، فيُقالُ: هَل بلّغَ هَذا؟ فَيَقُولُونَ: نعم، فَيَقُول: وَمَا عَلمكُم بذلِكَ ؟ فَيقُولونَ: أَخبَرَنَا نَبيُنا بِذلِكَ، انَّ الرُسُلَ قَد بَلّغُوا فَصَدَ قَناهُ، قَالَ: فَذلكم قوله تعالى: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ .... ﴾))[١٠٠] واتە: (پێغەمبەری وادێت دوو پیاوی لەگەڵدایە، وە پێغەمبەری وادێت سیانی لەگەڵدایە، زیاتر لەوە یان کەمتر، پێی دەوترێت پەیامەکەت گەیاند بە قەومەکەت؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، ئەنجا قەومەکەی بانگ دەکرێت و پێیان دەوترێت: ئایا پەیامەکەی خوای پێ گەیاندن؟ ئەوان دەڵێن: نەخێر، بەپێغەمبەرەکە دەوترێت کێ شایەتیت بۆ دەدات؟ ئەویش دەڵێت: موحەمەد و ئومەتەکەی، ئەنجا ئوممەتی محمد بانگ دەکرێت و پێیان دەوترێت ئایا ئەم پێغەمبەرە پەیامەکەی خوای گەیاندووە؟ ئەوانیش دەڵێن بەڵێ، دەفەرموێت (واتە: خوای گەورە) ئێوە چ زانیاریەکتان هەیە لەو بارەیەوە؟ (واتە: پێغەمبەران پەیامەکەیان گەیاندووە بە ئوممەتەکانیان یان نا) ئەوانیش دەڵێن (واتە: ئومەتی محمد) پێغەمبەرەکەمان ئەوەی پێگەیاندین کە پێغەمبەران پەیامەکەیان گەیاندووە ئێمەش بەڕاستمان زانیوە دەفەرموێت: ئائەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ .... ﴾.

---

[١٠٠] اخرجه : ابن ماجة (٤٢٨٤)، وصححه الشيخ الالباني في ((صـحيح سـنن ابـن ماجـة)) (٣٤٥٧)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٢٤٤٨).

# ئومەتەکان شوێن پەرستراوەکانیان دەکەون

ئالەو ڕۆژەدا هەموو پەرستراوان شوێن کەوتوەکانیان بەدوایاندا دەچن واتە بتەکان و خۆر و مانگ و..هتد، وەك ئیبنو مەسعود (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:((ثُمَّ يُنادِ [في رواية:.. يَجمَع اللهُ النّاسَ يوم القيامة، فَيَقُول][101]: أَيُّها الناس أَلَم تَرضَوا مِن رَبِّكُم الَّذي خَلَقَكُم وَرَزَقَكُم، وأمَرَكُم أن تَعبُدُوهُ، وَلا تُشرِكُوا بِهِ شَيئاً، أن يُوَلِّيَ كُلَ أُناسٍ مِنكُم مَن كانُوا يَتَوَلَّونَ، وَيَعبُدُونَ في الدّينِ، أَليسَ ذلكَ عَدلاً مِن رَبِكُم، قالوا بَلى قالَ: فلْيَنطلِق كُلُّ قَومٍ [أُمَةٍ] [102] إلى مَاكانُوا يَعبُدونَ في الدُنيا [فَيَتبعُ مَنْ كانَ يَعبُدُ الشَمسُ الشَمْسَ، وَيَتَبعُ مَن كانَ يَعبُد القَمرُ القَمَر، ويتبعُ مَن كانَ يَعبُدُ الطواغَيتُ الطواغَيتَ] [فيتساقطون في النار] [103] [في رواية: فَيَذهَبُ أصحاب الصليب مَعَ صَليبِهِم][104] ويُمثّلَ لِمَنْ كانَ يَعبدُ عِيسى، شَيطان عيسى، ويُمثَلَ لِمن كانَ يَعبدُ عُزيَراً شَيطانَ عُزَيرٍ][105] [وَيَذهَبُ أهلُ الاوثانَ مَعَ أوثانِهِم (ويَتّبع عَبَدَةُ النَّارُ النّارَ)[106] وأصحَابَ كُلَ آلِهَةٍ مَع الِهِتِهِم][107] [...فَيَتبعُ اولياءَ الشياطينُ الشياطينَ] في رواية [ ولا يبقى أحدٌ كان يعبد صنماً ولا وثناً ولاصورة] [وكل من يعبد من دون الله شيئاً] [ حتى يوردوهم [ويتساقطوا في] جهنم][108] [... ويَبقى مَن يَعبُد اللهَ مِن بَرّ وفاجرٍ و غُبرّاتُ مِن أهلِ الكتابِ، ثُم يُؤتَى بِجَهَنَم تُعرَضُ كأنها سرابُ، فَيُقالُ لليهُودِ: ماكُنتم تَعبُدون؟ فيقُولُونَ: كُنّا نَعبدُ عُزيراً ابن الله، فقَالَ: كَذَبتم، مااتَّخِذَ الله صاحِبةً وَلا وَلَداً،

---

[101] أخرجه: البخاري (٧٤٣٧).

[102] في رواية.

[103] اخرجه : البخاري (٧٤٣٧).

[104] أخرجه: البخاري (٧٤٣٩)، والنسائي (١١٢/٨)، وابن حبان (٧٣٧٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

[105] اخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٩٧٦٣)، والحاكم (٣٧٦/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٢٤٢/١٠)، اخرجه : الطبراني من طرق واحدها رجاله رجال الصحيح غيرابي خالد وهو ثقة، وقال الشيخ الالباني في ((شرح العقيدة الطحاوية)) (ص: ٤٧٥)، وفي ((مختصر العلو)) (ص: ١١٠) (٦٩) حديث صحيح، واخرجه احمد في ((كتاب السنة)) (١٢٠٣) وقال محققه : اسناده حسن.

[106] اخرجه : ابن حبان (٧٤٤٥) وقال محققه : اسناده صحيح.

[107] أخرجه : البخاري (٧٤٣٧).

[108] أخرجه : مسلم (٢٩٦٨)، وابن حبان (٤٦٤٢) وقال محققه : اسناده صحيح على شرط مسلم،وابن ابي عاصم ((السنة)) (٦٤٧)،وقال محققه : اسناده صحيح.

ماتُريدُون؟ قالوا: [عَطِشنارَبّنا فاسقِينَا، فَيُشارُ إِلَيهِم: ألاَ تَرِدُون؟ (إشرَبوا)[١٠٩] فيُحشَرَونَ إلى النَّار كأنَّها سَرابٌ يَحطِمُ بَعضُها بَعضاً، فيَتَساقَطُونَ فيَ النّار][١١٠] ثُمَ يُقالُ للنصَارى: ماكنُتم تَعبُدُونَ ؟ فيقُولونَ: كُنا نَعبدُ المَسيحَ إبنَ اللّٰه، فيُقال: كَذَّبْتم، ما اتخَذَ اللّٰهُ صَاحِبةً وَلا ولداً: ماذا تُرِيدوُنَ ؟ قالوا: [عَطِشنا ربنا فاَسقِنا، فَيُشارُ إِلَيهم ألاّ تَرِدوُن (فإشرَبُوا)[١١١]، فَيحشَرُونَ إلى جهنَّمَ، كأنّها سَرابٌ يَحطِمُ بَعضُها بَعضاً، فيَتَساقَطُونَ في النّار][١١٢]، ويَبقى مُحمداً (ﷺ) و أمَّتَهُ [وفيها منافقِوُها][١١٣] فيأتِيهُم اللّٰهُ في غير الصوُرَةِ التي يَعرفُونَ [و المؤُمِنوُنَ على كَومُ][١١٤] [فيَتمثلُ لَهُم الرَبُّ عَزوجَلِ فيأتِيهم فيَقُولُ][١١٥]، ما يحبِسُكُم وَ قَد ذَهبَ النَاسُ [مالَكُم لاتَنطلِقُونَ كما انطَلَق النّاسُ][١١٦] فَيقولونَ: قَد فارقناهُم[١١٧] وَإنّا سَمِعْنا مُنادِياً يُنادِي: لِيلحَق كُلُّ قَومٍ بما كانُوا يَعبُدونَ [في رواية: نَحنُ عُبادُ اللهِ المؤمِنونِ وعَبدناهُ وَهُوَ رَبُّنا وَهُوَ آتِينا ومُثابُنَا وهذا مَقامُنا][١١٨] وإنا نَنتَظِر رَبّنا [إنَّ لَنا لإلهاً مارأيناهُ بَعد][١١٩] [فَيَقولُ: أنا رَبُّكُم، فَيَقولُونَ: نَعوذُ بِاللهِ مِنكَ (...لانُشرِكُ باللِه شَيئاً) مرّتين أو ثلاثاً حتّى بَعضُهُم لَيكادُ أن يَنقَلِبَ][١٢٠] هذا مَكانُنا حَتى يأتِينا رَبُنا فَاذِا أتانا رَبُّنا عَرَفناهُ فَيأتيهم اللّٰهُ فِي الصُورةِ التِي يَعرفوُن فيَقُول: أنَا رَبُّكم][١٢١] [فَيَقُولُونَ: حَتَى نَنظُرَ إلَيكَ، فيَتَجُلى لَهُم يَضحَكُ][١٢٢] فَلا يكلُمِهُ إلاّ نبي، فيقولُ: هَل بَينِكُم وَ بَينَهُ آيةٌ

[١٠٩] في رواية : البخاري (٧٤٣٩).

[١١٠] أنظر رواية : أحمد (١١/٣)، البخاري (٤٥٨١).

[١١١] في رواية البخاري (٧٤٣٩).

[١١٢] في رواية : أحمد (١٦/٣)، البخاري (٤٥٨١).

[١١٣] أخرجه : البخاري (٧٤٣٧)، وفي رواية البخاري (٦٥٧٣)، احمد (١٠٩٠٦) و قال محققه : إسناده صحيح على شرطهما : ((وتبقى هذه الأمة فيها منافقوها)) .

[١١٤] أخرجه : أحمد (١٤٧٢١) و قال محققه أرناؤوط : حديث صحيح، الحاكم (٥٨٧/٤)، البيهقي ((الشعب)) (٣٧٠)، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٥٦)، و الكوم : المكان المرتفع.

[١١٥] في رواية الحاكم ( ٥٨٧/٤).

[١١٦] وفي رواية اخرى : ((.. الاتتبعون ماكنتم تعبدون)) اخرجه : احمد (( المسند)) (١١١٢٧) وقال محققه ارناؤوط : اسناده حسن.

[١١٧] في رواية : [قد فارقنا الناس في الدنيا أفقر ما كّنا إليهم و لم نصاحبهم] : مسلم (٩٤/١).

[١١٨] في رواية مسلم (٢٩٦٨).

[١١٩] في رواية : الطبراني (٩٧٦٣) والحاكم (٣٧٦/٢).

[١٢٠] في رواية : البخاري (٤٥٨١).

[١٢١] أخرجه : البخاري (٧٤٣٧).

[١٢٢] اخرجه : مسلم (٩٩/١).

فَتعرِفُونَهُ بِها؟[١٢٣] [في رواية: فَيَقُولُون: أنْ عَرَّفَنا نَفسهُ عرِفناهُ][١٢٤] [... فَيَقولُونَ: إنَّ بَيْنَنا وَبَيْنَه عَلامةٌ إذا رَأَيناها عَرفناها، قالَ: فيُقَولُونَ: ماهيَ ؟ فيَقولَونَ: يَكشِفُ عَن سَاقِهِ][١٢٥] فَيَكشفُ عَن ساقٍ [في رواية: فَيَضحَكُ فِيَ وجُوُهِهِم][١٢٦] فَيَسجد لَهُ كلّ مُؤمنٍ، وَ يبَقى مَن كانَ يَسجُدُ لَهُ رياءً و سُمعةً [ونفاقاً الاّ على ظهره طبقٌ واحدٌ]، فَيَذهَبُ يَسجُدُ فَيعَوُدَ ظَهرهُ طِبَقاً واحِداً [كلّما أراد أن يَسجُدَ خرَّ على قَفاهُ] [... ظهُورهُم كَصياصي البَقرِ يُرِيُدُونَ السجُودَ فَلاَ يَستَطيِعُون، وَقَد كانُوا يُدعَونَ إلى السُجُودِ وهُم سَالِمُون][١٢٧] ثُمَ يَقُول: اِرفَعوُا رؤُوسَكُم، فَيَرفَعونَ رؤُوسَهُم وقد تحول في صورته التي رأوه فيها اول مرة فيقول: انا ربكم، فيقولون: انت ربنا][١٢٨])).

**واتە: (.....پاشان جارچی یەك جار دەدات (واتە: بانگیان لێ دەکرێت) (لەریوایەتێکی تردا: خوای گەورە خەڵکان کۆدەکاتەوە و دەفەرموێت:) ئەی خەڵکینە ئایا رازی نابن پەروەردگارتان کە دروستی کردوون، و فەرمانی پێکردوون کە بیپەرستن و بە هیچ جۆرێك شەریکی بۆ بڕیار نەدەن، هەموو یەکێك لەئێوە بەدوای شوێن کەوتووان و ئەوانەی پەرستویانن لە ئایین با شوێنیان بکەون (واتە: لەرۆژی کۆتاییدا) ئایا ئەمە دادپەروەری نی یە لەلایەن پەروەردگاری خۆتانەوە ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ.**

**خوای گەورە دەفەرموێت: دەبا هەموو قەومێك (ئومەتێك) شوێن ئەوانە بکەون کە پەرستویانن لەدونیادا)، ئنجا ئەوەی رۆژی پەرستوە شوێن رۆژ دەکەوێت ئەوەی مانگی پەرستووە شوێن مانگ دەکەوێت و ئەوانەی کە طاغوتەکانیان پەرستوە شوێن طاغوتەکان دەکەون وەخاچ پەرستان شوێن خاچەکەی خۆیان دەکەون، وە ئەوانەی کە**

---

(١٢٣) في رواية : [هل تعرفون ربكم].

(١٢٤) في رواية : مسلم (١/٩٤) (١٨٣).

(١٢٥) أخرجه : الطبراني (٩٧٦٣)، و الحاكم (٢/٣٦٧) صححه على شرطهما ووافقه الذهبي.. الخ.

(١٢٦) أنظر : ((السلسة الصحيحة)) (٧٥٦).

(١٢٧) أخرجه: الطبراني (٩٧٦٣)، والحاكم (٢/٣٧٦)... الخ، وفي رواية ((فلايبقى أحدٌ كان يسجدُ للهِ إلا وقع ساجداً، ولايبقى أحد كان يسجد رياء و سمعة إلاّ وقع على قفاه)). أخرجه : احمد (( المسند)) (١١١٢٧) و قال محققه: اسناده حسن، و اخرجه إبن أبي عاصم ((السنة )) (٦٣٥) و قال محققه الشيخ الألباني : إسناده حسن على شرط مسلم.

(١٢٨) أخرجه : البخاري (٤٩١٩)، و إبن حبان (٧٣٧٧) و قال محققه : إسناده صحيح على شرط مسلم.

عیسایان پەرستووە شەیتانەکەی عیسایان[١٢٩] نیشان دەدرێت و شوێنی دەکەون و ئەوانەی عوزەیریان پەرستوە شەیتانەکەی عوزەیریان نیشان دەدرێت و شوێنی دەکەون، وە لەڕیوایەتێکدا: وە ئەوانەی بتیان پەرستوە شوێن بتەکانیان دەکەون (وە ئەوانەی ئاگریان پەرستوە شوێن ئاگر دەکەون) وەشوێن کەوتووی هەموو پەرستراوێك لەگەڵ پەرستراوەکانیانن، وەلەڕیوایەتێکی تردا: وە لایەنگران و دۆستانی شەیتانەکان شوێن شەیتانەکان دەکەون تا هەموو تێکڕا دەکەونە دۆزەخەوە .......وە تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خوایان پەرستوە لە چاك وخراپ، لەگەڵ کەمێك لە کەسانی خاوەن کتێبەکان (أهل الكتاب)، پاشان دۆزەخ دەهێنرێت و نیشان دەدرێت وەك سەراب و بە جولەکەکان دەوترێت: کێتان پەرستوە؟ ئەوانیش دەڵێن ئێمە عوزەیری کوڕی خوامان پەرستوە پێیان دەڵێت: درۆتان کرد، خوای گەورە نەژنی هەیەو نەمنداڵ، چیتان دەوێت؟ ئەوانیش دەڵێن: تونیمانە پەروەردگار تێر ئاومان بکە، نیشانیان دەدرێت (واتە: دۆزەخ): وپێیان دەوترێت ئایا ناچن ئاو بخۆن؟ (بڕۆن ئاو بخۆنەوە)، ئنجا کۆدەکرێنەوە بۆناو ئاگر کە وەك سەراب لەدوورەوە وێنەی دەریایەکیان دێتە بەرچاو کە شەپۆلەکانی بەسەر یەکدا دەکەوێت پاشان هەموو بەدوای یەکدا دەکەونە ناو ئاگرەوە، پاشان بەگاورەکان دەوترێت کێتان پەرستوە ؟ ئەوانیش دەڵێن: مەسیحی کوڕی خوامان پەرستووە، پێیان دەوترێت: درۆتان کرد، خوای گەورە نەژنی هەیە و نەمنداڵ، چیتان دەوێت ؟ ئەوانیش دەڵێن: تونیمانە پەروەردگار تێر ئاومان بکە، دۆزەخیان نیشان دەدرێت و دەوترێت (بچن بخۆنەوە)، هەموو کۆدەکرێنەوە بۆ دۆزەخ کە وەك سەراب لە دوورەوە وێنەی دەریایەکیان دێتە پێش چاو شەپۆلەکانی هەندێکی بەسەر هەندێکی دەکەوێت، پاشان هەموو بەدوای یەکدا دەکەونە ناو ئاگری دۆزەخەوە، وەموحەمەد و ئومەتەکەی دەمێننەوە، (وە مونافیقەکانیشیان لەگەڵدان) خوای گەورە دێت بۆلایان جیاوازتر لەو وێنەیەی کە ئەوان تیایدا دەیناسنەوە، خاوەن باوەڕانیش لەسەر شوێنێکی بەرزن، خوای گەورە دێت و پێیان دەفەرموێت:: چی ئێوەی لێرە بەند کردووە دوای ئەوەی خەڵکان ڕۆیشتن، بۆ ئێوەش ناڕۆن وەك خەڵکان

---

[١٢٩] ڕوونکردنەوە : مەبەست لەشەیتانی عیسا یاخود شەیتانی عوزەریر ئەو شەیتانەیە کە هەموو ئادەمیەك لەگەڵیدا هەیە کە ئەویش پێی دەوترێت (قرین)وەکو پێغەمبەری خوا دەفەرموێت : ( مامنكم من أحدِ الأ وقد وكل به قرينه من الجن وقرينه من الملائكة ).اخرجة :مسلم (٢٨١٤ ).

ڕۆیشتن؟ ئەوانیش دەڵێن: ( ئێمە هەر لەدونیادا لێیان جیابووینەوە و هاوڕێیەتیمان نەکردن هەرچەندە زۆر پێویستمان پێیان بوو) ( لەم ڕۆژەدا) لێیان جیا بووینەوە، وە ئێمە گوێمان لە جاڕ چیەك بوو کە جاڕی دا با هەموو قەومێك، شوێنی پەرستراوانیان بکەون، ئێمە بەندە خاوەن باوەڕەکانی خواین و پەرستومانەو هەر ئەو پەروەردگارمانەو هەر ئەو دێت بۆلامان و پاداشتمان دەداتەوە و ئەمە جێگەمانە، وەئێمە چاوەڕوانی پەروەردگارمان دەکەین، ئێمە پەروەردگارێکمان هەیە تا ئێستا نەمان بینیوە، دەفەرموێت (واتە: خوای گەورە): من پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: پەنا ئەگرین بەخوا لە تۆ (....... بەهیچ جۆرێ شەریکی بۆ بڕیار نادەین ) ئەمە جێگەمانە هەتا پەروەردگارمان دێت بۆلامان و ئەگەر بێت بۆلامان دەیناسینەوە ئنجا خوای گەورە دێت بۆلایان لەو وێنەیەی کە ئەوان تیایدا دەیناسنەوە، دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم ئەوانیش دەڵێن، هەتا تەماشات دەکەین، وە خۆی نیشان دەدات بۆیان و پێ‌دەکەنێت ( لەڕیوایەتێکدا: پێ‌دەکەنێت لەڕوویاندا) وە پێغەمبەران نەبێت کەس گفتو گۆی لەگەڵدا ناکات لەو ڕۆژەدا، دەفەرموێت (واتە: خوای گەورە) ئایا لەنێوان ئێوەو ئەودا نیشانەیەك هەیە کە پێی بناسنەوە؟ (لەڕیوایەتێکدا: ئایا پەروەردگارتان دەناسنەوە).... ئەوانیش دەڵێن لەنێوان ئێمەو ئەودا نیشانە (واتە: الآیة) هەیە ئەگەر بیبینین دەیناسینەوە دەفەرموێت (واتە: پەروەردگار) ئەو نیشانەیە چی یە؟ ئەوانیش دەڵێن: (یکشف عن ساقِهِ، فیکشف عن ساقٍ) کە ئەو نیشانەیە دەبینین هەموو خاوەن باوەڕێك دەچێت بەسوجدەدا بۆ پەروەردگار، تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە بۆ ڕیایی سوجدەیان بۆ بردووە، هەرکەسێکیان دەچێت سوجدە بەرێت پشتی دەگەڕێتەوە دەبێت بەیەك پارچە (لەڕیوایەتێکدا:........ سەرپشتیان وەك شاخی مانگا وایە دەیانەوێ سوجدە بەرن بەڵام ناتوانن پێشتر کاتێك لەدونیا بانگیان لێ دەکرا کە سوجدە بەرن ئەوان ساغ و سەلامەت بوون ئەوان سوجدەیان نەدەبرد)، پاشان دەفەرموێت: (واتە: خوای گەورە) سەرتان بەرز بکەنەوە ئەنجا سەریان بەرزدەکەنەوە، ( و دەبینن لە شێوەیەکی تردایە جگە لە شێوەی یەکەم جار و دەفەرموێت: من خودای ئێوەم، ئەوانیش هەموو دەڵێن: تۆ خودای ئێمەی). وە لەڕیوایەتێکدا هاتووە کە جولەکەو گاورە بێ باوەڕەکان خوای گەورە دەیانخاتە دۆزەخەوە پێش تەواو بوون لە لێ پرسینەوەی زیندەوەران بەچل

ساڵ بەڵام ئەم ڕیوایەتە (ضعیف)ە و بەم شێوەش هاتووە: ئەبی سەعیدی خودری (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ((الوَیلُ وادٍ في جَهَنَم یَهوی فیهِ الکافِرُ أربَعین خریفاً قَبلَ أن یَفرُغ مِن حِسابِ النّاسِ))[١٣٠].واتە: ((الویل)شیوێکە لە دۆزەخدا کافر فڕێ دەدرێتە ناویەوە و تێ ی دەکەوێت چل ساڵ پێش تەواوبوونی لێ پرسینەوەی خەڵکان بەڵام ئەم ڕیوایەتە (ضعیف)ە بۆ زانیاریت هێناومە).

## حاڵی موسوڵمانان لە گۆڕەپانی مەحشەردا

بانگ بێژێك جاڕ دەدات بۆ خەڵکانی موسوڵمانی ڕاوەستێنراو لەمەحشەر و دەڵێت: هەر کەسێك کارێکی کردووە بۆ غەیری خوا با بچێت داوای پاداشتەکەی لەو کەسە بکات.

ئەبو سەعید کوڕی فوضالە (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (([إذا جَمعَ اللهُ النّاسَ][١٣١] لِیَومٍ لاریبَ فیهِ نادی مُنادٍ: مَنْ کانَ اشرك في عَملٍ عَملَهُ للهِ أحداً، فَلیطلب ثَوابَهُ مِن عِندِ غیرِ اللهِ، فإنَّ اللهَ أغنی الشُرکاءِ عَنِ الشّرك))[١٣٢] واتە: ( کاتێك خوای گەورە خەڵکان کۆدەکاتەوە بۆ ڕۆژێك کە گومانی تێدا نی یە، بانگ بێژێك جاڕ دەدات: هەر کەسێك هاوتای بڕیارداوە لە هەر کارێکدا کە ئەنجامی داوە بۆ خوای گەورە، با داوای پاداشتەکەی لەغەیری خوا بکات چونکە خوای گەورە پێویستی بەهاوتانی یە زۆر زۆر دەوڵەمەندترە لەوەی شەریکی بۆ بڕیار بدرێت)، وە خەڵکانی موسوڵمان لەو ڕۆژەدا هەموویان بەڕیز دەوەستن لە بەردەم خوای خۆیان دا (تبارك وتعالی) وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدۡ جِئۡتُمُونَا كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةِۭۚ أَملَا .... ﴾ (الکهف: ٤٨).

وە پێ دەچێت کە هەموو ئادەمیزادێك لەگەڵ هاوشێوە پیشەی کاری دونیای خۆیدا بوەستێت، وەك ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

[١٣٠] اخرجه: الحاکم (٢/٥٣٤) وصححه ووافقه الذهبي، وضعّفه الشیخ الالباني في ((ضعیف الجامع)) (٦١٤٨).

[١٣١] في روایة ابن ماجة (٤٢٠٣) : ((الاولین والاخرین، یوم القیامة)).

[١٣٢] اخرجه احمد : (٣/٤٦٦) والطبراني في ((الکبیر)) (٢٤/٧٧٨)، والترمذي (٣١٥٤) وقال : حسن غریب، وابن ماجة (٤٢٠٣)، وحسنه الشیخ الالباني في ((صحیح سنن الترمذي)) (٢٥٢١)، وفي ((صحیح سنن ابن ماجة)) (٣٣٨٨)، وفي ((المشکاة)) (٥٣١٨)، وفي ((صحیح الجامع الصغیر)) (٤٨٢)، وابن حبان (٧٣٤٥) وقال الشیخ الارنوؤط في تحقیقه : إسناده حسن.

دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((إنَّ العُلَماءَ إذا حَضَرُوا رَبَّهُم عزوَجَل كانَ مُعاذَ بَن جَبَلٍ بَين أيدِيهم رَتَوةً بِحَجَرٍ))[١٣٣] واتە: (زانایان کاتێك ئامادە دەبن لای خوای خۆیان موعاذی کوڕی جەبەل لەپێشیانەوەیە بەماوەی بەرد هەڵدانێك).

سەبارەت بە ڕوون کردنەوەی ئایەتی: ﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴾ (الصافات ٢٢) ئیمامی عومەر (ﷺ) دەفەرموێت:((امثال الذين هم مثلهم يجيء اصحاب الربامع اصحاب الربا، واصحاب الزنامع اصحاب الزنا، واصحاب الخمر مع اصحاب الخمر أزواجٌ في الجنة وأزواج في النار))[١٣٤] واتە: ( خوای گەورە هەموو کەسێك لەگەڵ هاوشێوەی خۆیدا حەشر دەکات، سوخۆرەکان لەگەڵ سوخۆرەکانی هاوشێوەی خۆیاندا دەبن، و زینا کارەکانی لەگەڵ زینا کارانی هاوشێوەی خۆیاندا دەبن، وە عارەق خۆرەکان لەگەڵ عارەق خۆرەکانی هاوشیوەی خۆیاندا دەبن، وە بەوشێوەیەش دۆزەخیەکان لەگەڵ هاوشێوەکانی خۆیاندا دەبن وە بەهەشتیەکانیش لەگەڵ هاوشێوەی خۆیاندا دەبن).

## حاڵی تاوانباران

**یەکەم: زەکات نەدەرەکان.**

ئەو موسوڵمانانەی سەروەت و سامانەکانیان لەدونیادا کەڵەکە کردووە لە قاسە وبانك و گەنجینەکانیاندا هەڵیان گرتووە و زەکاتیان لیٚ نەداوە ئەوانە بەهەموو ئەو پارە وسامانانەیان سزا دەدرێت لەمەحشەر دا، ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مامِن صاحَبِ ذهبٍ ولاَ فِضَةٍ لايُؤّدي مِنها حقَّها [زَكاتها][١٣٥]، إلاّ إذا كانَ يَوم القيامةِ، صُفّحَت لَهُ صَفائحَ مِن نارٍ فاحُميَ عَليها في نارِجَهَنم، فَيُكوى بِها جنبَهِ وجَبَينه و [و جَبهتُهُ][١٣٦] وظهَرهُ، كُلّمَا بَرَدَت أعيَدت لهُ في يَومٍ كانَ مِقدارهُ

---

[١٣٣] اخرجه : ابو نعيم الاصفهاني في ((حلية الاولياء)) (١/٢٢٨)، وابن سعد (٣/٥٩٠)، والطبراني في ((الكبير)) (٢٠/٤١)، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٥٩١)، وفي ((صحيح الجامع)) (١٦٨٠).

[١٣٤] أخرجه : الحاكم (٣٦٦٢) وصححة علي شرط مسلم، وابن جرير ((التفسير)) (٢٢٤٦٠)، وقال الحافظ في ((المطالب العلية)) (٣٧٠٥) : أخرجه : احمد بن منيع في مسنده باسناد صحيح، وعزاه : السيوطي في ((الدر المنشدر)) (٥/ ٥١٣) الى ابن ابي شيبة و عبد الرزاق والفريابي وعبد بن حميد وابن المنذر و ابن ابي حاتم وابن مردويه والبيهقي.

[١٣٥] في رواية النسائي (٥/٢٩).

[١٣٦] اخرجه : النسائي في : ((التفسير)) (٢/٤٦٤) رقم : (٦٤١) وقال محققه : اسناده صحيح.

خَمسين أَلفَ سَنةٍ، حتى يَقضيَ [اللهُ] بَينَ العبادِ، فيرَى سَبيلَهُ إمّا إلى الجَنَّةِ و إمّا إلى النّار"[١٣٧] قيلَ: يا رسولَ الله ! فالإبلَ ؟ قال: وَلا صَاحبَ إبلٍ [في رواية: يَموتُ... لَم يُؤدِ زكاتها][١٣٨] لايؤدي مِنها حقَها، ومِنْ حقِها حَلَبُها يومَ وردِها [وفي رواية: إطِراقُ فَحلِها و إعَارةُ دلوِها، و منيحتُها، وَحَلَبُها على الماء، وحملُ عليها في سبيل الله][١٣٩] إلاّ إذا كانَ يَومَ القيامةِ بُطِحَ (أي قعَدَ) بِقاعٍ قرقرٍ (أي مستوٍ) [أعظم ما كانتَ و أسمَنَه][١٤٠]، و أوفَرَ ماكانت لا يفقَدَ منها فِصيلاً واحداً تطؤه (أي تسير عَليه) بإخفافِها [في رواية:تخبط وجهه باخفافها] و تعُضّه بأفواهِها، كلَمّا مرَّ عليه أُولاَها رُدَّ عليهِ أخراهَا في يومٍ كانَ مقداره خمسينَ ألف سنةٍ، حتى يقضي [اللهُ] بَين العبادِ فَيرى سَبيلَه إمّا إلى الجَنَّةِ و إمّا إلى النّارّ، قيل يارسول الله ! البَقَر و الغُنم ؟ قال: ولا صَاحَبِ بقرٍ ولا غَنمٍ لايؤدي مِنها حقّها إلاّ إذا كانَ يومَ القيَامةِ بُطِحَ لها بقاعٍ قَرقرٍ لا يفقَدُ مِنها شيئاً [أوفَرَ ما كانتَ و اسمنَهُ][١٤١] لَيس فيَها عقصاءٌ ولا جلْحاءٌ، ولا عَضباءٌ، تَنْطحه بِقُرونِها و تَطؤهُ بأظلافِها كُلّما مَرَّ عَليَه أولاَها رُدَّ عَليه أخرُاها في يومٍ كان مقدارُهُ خمسينَ ألفَ سنةٍ، حتى يقَضيَ [اللّهُ] بين العِبادِ " فَيرى سَبيلهُ إمّا إلى الجنَّة و إمّا إلى النارّ))[١٤٢]، ((ولا صاحبِ كَنزٍ لا يَفعلُ فيه حَقَهُ إلاَ جَاء كَنْزهُ يوم القيامةِ شُجاعاً أَقرَعَ [لَهُ زبيبتان] فاتحاًفاَهُ، فإذا أتاهُ فَرَّ منهُ فيُنادِيهِ [في رواية: يأخذُ بِلهزمَتيهِ و تَقولُ][١٤٣] خُذ كَنزَكَ الّذي خَبأتَهُ [هَذا مالُكَ الذيَ كُنتَ تَبخَلُ به][١٤٤] فانا عَنهُ غنيّ، فإذا رَأى أنّهُ لابُدَ مِنهُ

---

[١٣٧] وقـال الله تعـالى : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ (التوبة: ٣٤ – ٣٥)

[١٣٨] في رواية الترمذي.

[١٣٩] في رواية.

[١٤٠] في رواية النسائي (٥/٢٩).

[١٤١] في رواية النسائي.

[١٤٢] أخرجه : البخاري (٦٩٥٨)، ومسلم (٩٨٧)، واحمد (٨١٨٤) وقال محققة : اسناده صحيح على شرطهما، و النسائي (٥/١٢،٢٧)، و الترمذي (٦١٧) و قال : حسنٌ صحيح، وأبوداود (١٦٥٨)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (١٤٦٠)، و في ((صحيح سنن الترمذي)) (٥٠٣) : صحيح، و إبن حبان (٣٢٥٣) و قال الأرناؤوط في تحقيقه : إسناده صحيح على شرط مسلم.

[١٤٣] اخرجه : النسائي (٥/٣٩)، صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٢٣٠٢،٢٣٠٤).

[١٤٤] في رواية.

سَلَكَ يَدهُ فِي فِيّهِ فيقضِمُها قَضمَ الفَحلِ[١٤٥] [في رواية:حتى يُطوَّقَ عُنقَهُ][١٤٦] ثُمَ تلاَ قَولَه تعالى: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ذُو...﴾ (آل عمران: ١٨٠)، واتە: (هەر خاوەن ئاڵتون و زیوێك كە زەكاتەكەی نەدات، ئەوا لەڕۆژی كۆتاییدا ئەو ئاڵتون وزیوانەی بۆ دەكرێت بەچەند پارچە پلێتێك و ئەنجا سوور دەكرێتەوە لەسەر ئاگری دۆزەخ پاشان لای ڕاست و چەپ و نەوچەوان و چەناگە و پشتی پێ داخ دەكرێت، هەر كاتێك سارد بێتەوە دووبارە بۆی سوور دەكرێتەوە لە ڕۆژێكدا كە ماوەكەی پەنجا هەزار ساڵە، تا خوای گەورە كاری بەندەكانی یەك لادەكاتەوە ئنجا ڕێگەی خۆی نیشان دەدات یان بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی زەكاتی وشتر ؟ فەرمووی: وە هەر خاوەن وشترێك بمرێت و ....... زەكاتەكەی نەدابێت وەماڤ لیٚ نەدابێت، وە لەمافەكانی.. دۆشینیەتی لەڕۆژی هاتنەوەی (لەڕیوایەتێكدا: پەڕینی نێرەكەیەتی)، وە خواستنی دۆڵچەكەیەتی،وە بەخشینیەتی (واتە: بدرێت بەیەكێك كە سوودی لێوەربگرێت و دوایی بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەكەی)، وە دۆشینیەتی لەسەر ئاو، وە بار لێنان یەتی لەسەر پشتی لەپێناوی خوادا، ئەوا ڕۆژی كۆتایی بۆی ڕادەوەستێنرێت (واتە: مەبەست لە وشترەكانە) لەسەر خاكێكی تەختدا، قەڵەوتر دەبێت لەجاران و هەموو وشترێكی لەشیر بڕاوەش لەگەڵیاندایە وهیچیان ون نابێت، دەموچاویان دەخرێتە ژێر سمی وشترەكانیانەوە، وە بەدەمیان گازیان لیٚ دەگرن، هەر جارێك ئەوەڵیان (واتە: یەكەمیان) بەسەریدا تێپەڕێت كۆتاییانی بۆ دەگێڕدرێتەوە لەڕۆژێكدا كە ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵە هەتا خوای گەورە كاری خەڵكان یەك لادەكاتەوە، پاشان ڕێگای نیشان دەدرێت یان بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مانگا و مەڕیش ؟ فەرمووی: ((هەر خاوەن مانگایەك و هەر خاوەن مەڕێك مافەكەی لیٚ نەدات ئەوا لەڕۆژی كۆتاییدا بۆی ڕادەوەستێنرێت لەسەر خاكێكی تەختدا، گۆشتن و قەڵەوتر لە جاران))، هیچ یەكێكیانی لیٚ ون نابێت نەشاخ

---

[١٤٥] وفي رواية : ((... ثم يُتبعُه سائرُ جَسَدِه)) رواه البزار (٨٨٢) و قال : إسناده حسن، و الطبراني ((الكبير)) (١٤٠٨) و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٣/٦٤) رواه البزار و رجاله ثقات.

[١٤٦] أخرجه : ابن ماجة (١٧٨٤)، وصححه الشيخ الألباني في : ((صحيح سنن ابن ماجة)) : (١٤٤٣)، ((صحيح سنن النسائي)) (٢٢٨٩).

خواری تیایەو نەشاخ شکاو و نەگویٚ بڕاو و هەموو بەرشاخیان دەدەن و بەسمی پێیانەوە ژێر پێیان دەخەن، هەر کاتێك یەکەمیان بەسەردا تێپەڕێت کۆتاییەکەیان بۆ دەگێڕدرێتەوە لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا خوای گەورە کاری بەندەکانی یەکلا دەکاتەوە پاشان ڕێگەی نیشان دەدرێت یان بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ، وە هەر خاوەن گەنجینەیەك زەکاتی گەنجینەکەی نەدات، ئەوا گەنجینەکەی دێت لەڕۆژی کۆتاییدا لە شێوەی مارێکی دوو شاخدا دەمی بۆ کردوەتەوە کە نزیك دەبێتەوە خاوەنەکەی لێی ڕادەکات، ئنیجا بانگی لیٚ دەکات (لەڕیوایەتێکدا: هەردوو لاشەویلکەی دەگرێت و پیٚی دەڵێت: بگرە ئەو گەنجینەیەت کە شاردبووتەوە، ئا ئەوە سامانەکەتە کە چروك(بخیل) بووی تیایدا، من پێویستیم پیٚی نی یە، کاتێك کە دەبینێت (واتە:خاوەن گەنجینە و سامانەکە) هیچ چارێکی نی یە دەستی دەخاتە ناو دەمیەوە (واتە: خاوەن سامانەکە خۆی دەستی خۆی دەخاتە ناو دەمی مارەکە)، ئینجا مارەکە دەیخرمێنیٚ وەك وشترە نێرە ( لەڕیوایەتێکدا.. ئینجا هەموو لاشەی بەدوایدا دەخوات) هەتا خۆی دەئاڵێنیٚ لە گەردنیەوە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ)) ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَ... ﴾ (آل عمران: ١٨٠).

وە ئەو کەسانەی کە سامانێکی زیاد لەخۆیان هەیەو پێویستیان پیٚی نی یە وە لە خزمانی خۆیانی دەگرنەوە و بەشیان نادەن بەهەمان شێوە دەبێت بەمار و خۆیان دەئاڵێنن لەگەردنیانەوە، وەك جەریر (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ما مِن ذي رَحمٍ يأتي رَحِمَهُ فَيسَألهُ فضلاً أعطاهُ اللهُ إيّاهُ فَيبخَلُ عليهِ إلاّ أخرِجَ لَهُ يَومَ القيامةِ مِن جَهَنَّم حَيّةٌ يقال لَها شجاعٌ يتَلَمَظُ فيُطوَّقُ بِهِ))[١٤٧] واتە:(هەر خزمێك بچێت بۆلای خزمەکەی و داوای شتێکی پێویستی لیٚ بکات کە خوای گەورە پیٚی بەخشیوە ئەو ڕەزیل بێت و بەشی لیٚ نەدات ئەوا خوای گەورە مارێکی بۆ دەنێرێت لە دۆزەخەوە کە پیٚی دەوترێت (شُجاع) و دەفیشکێنێت و خۆی لە جەستەیەوە

(١٤٧) أخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٢٣٤٣)، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (١٥٤/٨) : إسناده جيد، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٥٤٨).

دەئالێنێت، وە لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((أَيّما رَجلُ أتاهُ إبنُ عَمّهِ يَسألُهُ مِن فضلِه فَمَنَعَهُ، منَعُه اللهُ فَضلَه يَومَ القيامةِ))[١٤٨] واتە: (هەر پیاوێك ئامۆزاکەی بێت بۆلای و داوای شتێکی زیاد لەخۆی لێ بکات و ئەو نەیداتێ ئەو کەسە خوای گەورە میهرەبانی خۆی لێ قەدەغە دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا).

وە ئەو ئافرەتانەی کە زەکاتی زێڕەکانی خۆیان نادەن ئەوا نەزێڕەکانیان دەبن بەئاگر بۆیان لەڕۆژی قیامەتدا، وەك عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە ئەویش لەباپیریەوە (رضي الله عنهم) دەگێڕێتەوە: ((ان إمرأةً من أهل اليمن أتت رسول الله (ﷺ) و [معها] بنتٌ في يدها مسكتان غليظَتان مِنْ ذهبٍ فقال: ((أتؤَدينَ زكاة هذا ؟ )) قالت: لا، قال: ((أيَسُرّكِ أنْ يَسورَكِ اللهُ عزوَجَلَّ بهمِا يَوم القيامةِ سِوارينِ مِنْ نَارٍ))[١٤٩] واتە: (ئافرەتیکی خەڵکی یەمەن هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وەکچێکی لەگەڵدا بوو کە دوو بازنی گەورەی ئاڵتونی لەدەست دابوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا زەکاتی ئەوە دەدەیت؟)) ئەویش وتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((ئایا پێت خۆشە خوای گەورە لە جیاتی ئەو دووانە لە ڕۆژی کۆتاییدا دووبازنی ئاگرینت بکاتە بەدەست)).

**دووەم: دزین بەگشتی و بەتایبەت لە دەستکەوتی جەنگ**

هەرکەسێك هەر شتێك لەدەست کەوت بدزێت ئەوا لەڕۆژی کۆتاییدا بەسەر شانیەوە دەبێت و دەیهێنێت و لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ ﴾ (آل عمران: ١٦١) عودەی کیندی (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يا أيها الناسُ من عَمِلَ مِنكُم لَنا عَمَلاً فكتمهُ مِنهُ مَخيطاً فَما فَوقَهُ فَهوَ غالٍ يأتي بِهِ يَومَ القيامةِ))[١٥٠]. واتە: (ئەی خەڵکینە هەرکەسێك لەئێوە هەر کارێکمان بۆ بکات وهێندەی دەرزیەك یاخود زیاتری لێ بشارێتەوە ئەوکەسە دزە و

---

[١٤٨] اخرجه : الطبراني في ((الأوسط)) رقم (١١٩٥) و، ((الصغير)) (٩٣) و قال الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٨٩٧) : حسن.

[١٤٩] اخرجه : النسائي (٣٨/٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٢٣٤٢).

[١٥٠] اخرجه : مسلم (١٨٨٣)، وابوداود (٣٥٨١)، وابن حبان (٥٠٧٨) وقال المحقق : اسناده صحيح على شرطهما.

بەدزییەکەیەوە دەهێنرێت لەڕۆژی کۆتاییدا). وە گەورەترین جۆرەکانی دزی (غلول) زەوی دزینە لەیەکتری وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((اعظم الغلول عند الله ذراع من الارض تجدون الرجلين جارين في الارض او في الدار فيقتطع احدهما من حظ صاحبه ذراعا))[١٥١]. واتە:((گەورەترین (دزی) لای خوای گەورە گەزێك لەزەوی یە، کە دوو پیاو دراوسێن لە زەویدا یاخود لە خانوودا یەکێکیان گەزێك لە بەشی هاوەڵەکەی بۆ خۆی دادەبڕێت......)) وە (غلول) ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە بەرتیل وەردەگرن وەك بورەیدە (ﷺ) لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مَن استعمَلْناهُ على عملٍ فَرزَقناهُ رِزقاً (أي مَنحناهُ راتِباً) فَما أخَذَهُ بَعدَ ذلِكَ فَهُو غَلول))[١٥٢]واتە: (هەر کەسێك کارێکمان پێ سپاردبێت وە ڕۆزییەکمان بۆ دیاری کردبێت ( واتە: موچەیەکمان دابێتێ) هەرچیەك زیاتر لەدوای ئەوە وەربگرێت ئەوا دزی (غلول)ە).

وەهەر لەو ڕۆژەدا ئەوانەی کە وشترو مەڕو ئەسپ و شتومەکی تریان دزیبێت ئەو شتە دزراوانە دزەکان دەبێت بەسەر شانیانەوە هەڵی گرن لە ڕۆژی کۆتاییدا: ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لا ألفَينَ أحدكُم يجئ يوم القيامةِ على رَقبتِه بعيرُ له رُغاءُ يقولُ: يارسول الله [اغثني]، اقولُ: لا أملِكُ لَكَ مِنَ الله شيئاً قد أبلَغتُكَ، لا الفيَّنَ احدكم يجيء يَومَ القِيامةِ على رَقَبَتِه شاةُ لَها بعارُ يقولُ يارسول الله [اغثني]، اقول: لااملِكَ لَكَ مِنَ اللهِ شيئاً قَد ابلَغتُكَ، لاالفيَّن احدكُم يجيء يَومَ اللهِ القيامةِ على رقبتِهِ فَرسُ له حمحَمةٌ يَقولُ يارسول الله [اغثني]، اقَولُ: لا املِكُ لَكَ مِن اللهِ شيئاً قَد ابلَغتَكَ، لاالفيَّن احدُكُم يَجئى يَومَ القيامةِ على رَقبَتهِ نَفسٌ لها صياحٌ يَقولُ يارسول اللهِ [اغثني]، اقول: لااملِكَ لَكَ مِن اللهِ شيئاً قَد اَبلغتُكَ، لاالفيَّن اَحدُكُم يجيء يَومَ القيامةِ عَلى رَقبَتهِ صامتٌ (أي عروض ـــ ذهب) يقول يارسول الله [اغثني]، اقولُ: لا املِكُ مِنَ اللهِ شيئاً قَد ابلَغتُكَ، لاالفيَّن احَدُكُم يجيء يومَ القيامَةِ على رقبتِه رِقاعُ تخفَقُ يقولُ يارسول الله [اغثني]، اقولُ: لا املِكُ لَكَ مِنَ

---

[١٥١] اخرجه : احمد (١٧٧٩٩) وقال محققه :اسناده حسن، وحسن اسناده ايضا الهيثمي في ((المجمع)) (١٧٥/٤).

[١٥٢] اخرجه : ابوداود (٢٩٤٣)، والحاكم (٤٠٦/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الالباني في ((غاية المرام)) (٤٦٠) حديث صحيح على شرطهما، وفي ((المشكاه)) (٣٧٤٨) : اسناده صحيح. وفي رواية ضعيفة عن جابر بن عبدالله مرفوعاً : ((هدايا العمال [في رواية :الأمراء]غلول)) رواه الطبراني في ((الاوسط)) (٧٨٥٢) وقال محققه: اسناده ضعيف وحسن اسناده ابن حجر الهيثمي في : ((مجمع الزوائد)) (١٥١/٤)، ورواه أحمد (٤٢٤/٥) (٢٣٦٠١) وقال محققه : اسناده ضعيف، و البيهقي (١٣٨/١٠) واوردناه للعلم فقط.

الله شیئاً قد أبلَغتُكَ))[١٥٣]. واتە: (کاری وا نەکەن بگەم بەیەکێ لەئێوە لەڕۆژی کۆتاییدا وشترێك بەسەر شانیەوە بهێنێت و وشترەکە بۆڕە بۆڕی بێت) ئەو کەسە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فریام بکەوە و ڕزگارم بکە، ئەڵێم: هیچ شتێکم پێ ناکرێت لای خوا بۆت، ئەی پێم ڕاگەیاندیت (واتە: لەدونیا)، نەکەن سبەینێ بگەم بەیەکێ لەئێوە لەڕۆژی کۆتاییدا مەڕێك بەسەر شانیەوە بێت وە بباڕێنێت و بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا، فریام بکەوە و ڕزگارم بکە دەڵێم: هیچ شتێکم پێ ناکرێت بۆت لای خوا، پێم ڕاگەیاندیت، نەکەن سبەینێ بگەم بەیەکێ لەئێوە لەڕۆژی کۆتاییدا و ئەسپێك بەسەر شانیەوە بێت و بحیلێنێت و بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام بکەوەو ڕزگارم بکە، دەڵێم هیچ شتێکم پێ ناکرێت بۆت لای خوا پێم ڕاگەیاندیت، نەکەن سبەینێ بگەم بە یەکێك لە ئێوە لەڕۆژی کۆتاییدا و ئادەمیەکی بەهاوار هاوار بەسەر شانەوە بێت هەڵی گرتبێت و بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا !! فریام بکەوەو ڕزگارم بکە دەڵێم: هیچ شتێکم پێ ناکرێت بۆت لای خوا، پێم ڕاگەیاندیت، نەکەن سبەینێ بگەم بەیەکێ لە ئێوە لە ڕۆژی کۆتاییدا بێ دەنگێکی (واتە:شتومەك وکەلو پەل وەك ئاڵتون و شتی تر) ی بەسەر شانەوە هەڵ گرتبێت و بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا !! فریام بکەوەو ڕزگارم بکە دەڵێم هیچ شتێکم پێ ناکرێت بۆت!! پێم ڕاگەیاندیت. نەکەن بگەم بەیەکێ لەئێوە لەڕۆژی کۆتاییدا و پارچە قوماشێکی بەسەر شانەوە بێت و بشەکێتەوە و بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە وڕزگارم بکە، دەڵێم: هیچ شتێکم پێ ناکرێت بۆت لای خوا !! پێم ڕاگەیاندیت).

دزەکان بەگشتی و بەتایبەت ئەو دزانەی کە لەدەست کەوتیان دزیوە لەگەڵ بەرتیل خۆران و هاوشێوەی ئەوان سەر شۆڕی و ڕسوایی لەپێش چاوی خەڵکان توشیان دەبێت لەڕۆژی کۆتاییدا وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((یاایها النَّاسُ ادُّوا الخَیطَ والمخَیطَ فانَّ الغُلولَ یَکونَ علی أهلِهِ عَاراً او شِناراً یَومَ القیامةِ))[١٥٤]. واتە: ئەی خەڵکان

---

[١٥٣] اخرجه: البخاري (٣٠٧٣)، مسلم (١٨٣١)، ابن حبان (٤٨٤٧) وقال المحققه : اسناده صحيح على شرطهما، وأحمد (٩٥٠٣) وقال محققه : اسناده صحيح على شرطهما، و الزيادة له.

[١٥٤] اخرجه : احمد (٣١٨/٥)، والنسائي (٢٦٤/٦)، والترمذي (١٥٦١) وقال حديث حسن، وابن ماجة (٢٨٥٢)، والدارمي (٢٢٩/٢)، والبيهقى (٢٩٢/٦)، وابن حبان (٤٨٥٥) وقال محققه : اسناده حسن، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابي داود)) (٢٧٥٥)، وفي ((الإرواء الغليل)) (١٢٤٠)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٦٦٩).

دەرزی و دەزوش بگێڕنەوە چونكە دزی (غلول) دەبێت بەسەر شوڕی و ڕیسوایی بۆ خاوەنەكانیان لەڕۆژی كۆتاییدا)، وە لە ڕیوایەتێكدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّ أوليائي المتقون يوم القيامة وإنْ كانَ نَسبُ اقربُ من نَسبٍ، يأتي الناس بالاعمال وتأتون بالدنيا تحملونها على رقابكم تقولون: يا محمد، يامحمد، فاقول هكذا و هكذا)) وأعرض في كلا عطِفيهِ))[155]. واتە: ( بەڕاستی لایەنگرانم هەر پارێزكارانن لەڕۆژی كۆتاییدا هەرچەندە نەسەب و نەژادێك نزیكتر بێت لەنەسەب و نەژادێكی تر، خەڵكان بەكاری چاكەوە بێن و ئێوەش دونیاتان بەكوڵەوە بێت لەگەڵ خۆتاندا بیهێنن و بڵێن،، ئەی محمد ئەی محمد، منیش دەڵێم ئاواو ئاوا، واتە: ڕووتان لێ وەردەگێڕم بەلای ڕاست و چەپدا).

### سێیەم: ئەوانەی كە دادپەروەر نەبوون لەنێوان خێزانەكانیدا

ئەم چینە ئەو كەسانەن كە خاوەنی دوو ژن و بەرەو ژووربوون و یەكسانی و دادپەروەریان ئەنجام نەداوە لە نێوان خێزانەكانیاندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَن كانت لَه امرأتانِ [فَلَم يَعَدِل بَينَهما] فَمالَ مَعَ احدهما على الأخرى جاءَ يَومَ القيامةِ واحَدُ شِقيَّةِ ساقِطٌ))[156] واتە:(هەركەسێك دوو هاوسەری هەبێت (دادپەروەر نەبێت لەنێوانیاندا) وە لایەنگری یەكێكیان بێت لەسەر ئەوی تریان واتە: تەنها مەیلی بەلای ئەو خێزانەیەوە بێت و ئەوی تریان پشت گوێ بخات، لەڕۆژی كۆتاییدا دێت و لایەكی جەستەی بەلادا كەوتووە، واتە: دەكرێت بەدووكەرتەوە و لایەكیان بەلادا دەكەوێت).

---

[155] أخرجه : البخاري ((الأدب المفرد)) (٨٩٧)، ابن أبي عاصم ((السنة)) (٢١٢)، و حسنه الشيخ الألباني في : ((صحيح الأدب المفرد)) (٦٨٨)، السلسلة الصحيحة (٧٦٥)، كذلكَ حسن إسناده الشيخ الشعيب الأرناؤوط في تحقيقه لـ ((جامع العلوم و الحكم)) (٣٠٩/٢).

[156] اخرجه : احمد (٤٧١/٢)، وابوداود (٢١٣٣)، والترمذي (١١٤١) وقال : حديث حسن، والنسائي (٦٣/٧)، وابن ماجة (١٩٦٩)، والحاكم (١٨٦/٢) صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وابن حبان (٤٢٠٧) وقال محققه : اسناده صحيح على شرطهما، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٩٢١)، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٦٠٣)، وفي ((المشكاة)) (٣٢٣٦) وقال : اسناده صحيح، وفي ((ارواء الغليل)) (٢٠١٧)، وفي ((غاية المرام)) (٢٢٩)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٢٠٧٧).

**چوارەم: جیاوازی خستنە نێوان خۆشەویستان.**

ئەمەش ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە جیاوازی و ئاڵۆزی دەخەنە نێوان پیاو و هاوسەرەکەیەوە یاخود منداڵەکانیەوە یاخود خزمانی یاخود برایانی موسوڵمانی.

ئەبو ئەیوب (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَن فَرَّقَ بَين والدةٍ وَولدِها، [في رواية: بين الوالد وولده] فَرَّقَ اللهُ بَيْنه وبَينَ أحِبّتهِ يَوم القيامة))[157]، وفي رواية: ((... ألاَ اخبرُكم بشِرارِكم... قال: المفسُدونَ بين الاحبة))[158] واتە: (هەر کەسێك ناکۆکی بخاتە نێوان دایکێك و جگەر گۆشەکەی یاخود نێوان باوکێك وجگەر گۆشەکەی خوای گەورە ناکۆکی دەخاتە نێوان خۆی و خۆشەویستانی و لە یەکیان دوور دەخاتەوە لەڕۆژی کۆتایی، وە ئەو کەسانەی کەئەم کارە ناشیرینە ئەنجام دەدەن خراپترین کەسانی ناو موسوڵمانانن، وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:(.... ئایا پێتان بڵێم خراپترین کەسانتان کێن: فەرمووی:ئەوانەن کە نێوان خۆشەویستان تێك دەدەن و لەیەکیان دوور دەخەنەوە).

**پێنجەم: ئەوانەی کە زانیاری دەشارنەوەو نایگەیەنن**

ئەم جۆرە کەسانە خوای گەورە لغاوی ئاگرین دەخاتە دەمیانەوە، وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن سُئِلَ عَن عِلمٍ فَكَتَمَهُ اَلجَمَهُ اللهُ يَومَ القيامَةِ بِلِجامٍ مِنَّ النّارِ))[159]واتە:( هەر کەسێك پرسیاری لێ بکرێت سەبارەت بە زانست و زانیاری یەك و بیشارێتەوە خوای گەورە لغاوێکی ئاگرین دەکاتە دەمی لەڕۆژی کۆتاییدا).

---

[157] اخرجه : الترمذي (١٢٨٣)، (١٥٦٦) وقال : حديث حسن، احمد (٢٣٥١٣) وقال محققة : حديث حسن (٤١٢/٥)، والطبراني ((الكبير)) (٤٠٨٠)، الحاكم (٥٥/٢) وصححه على شرط مسلم، الدارمي (٢٤٨٢)، الدارقطني (٦٧/٣)، وحسّنه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٢٧٧)، (١٠٣٢: حسن)، وفي ((المشكاة)) (٣٣٦١).

[158] اخرجه : البخاري في ((الادب المفرد)) (٣٢٣)، وحسّنه الشيخ الالباني في ((صحيح الادب الفرد)) (٢٤٦) : حسن.

[159] اخرجه : احمد (٢٦٣/٢)، وابوداود (٣٦٥٨)، وابن ماجة (٢٦٤)، والترمذي (٢٦٤٩) وقال : حديث حسن، الحاكم (١٠٢/١) صححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٩٥) وقال المحقق : اسناده صحيح، وصححه قال الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابي داود)) (٣١٠٦) :، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢١٢)، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٢١٣٥).

**شەشەم: سیخوڕەکان ( جاسوس ).**

ئەو کەسانەی کە گوێیان بۆ گفتوگۆی خەڵکی قولاغ کردووە و جاسوسیان بەسەرەوە کردوون، ئەوانە خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا سزایان دەدات، ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ إستَمَعَ إلى حديث قومٍ وهُم لَهُ كارِهونَ صَبّ في أذنِهِ الأنكَ يومَ القيامـة))[١٦٠]. واتە: ( هەرکەسێك گوێ بگرێت بۆ قسەی کەسانێك کە پێیان ناخۆش بێت ئەو گوێیان لێ بگرێت ئەو کەسە قوڕقوشمی تواوە دەڕژێنرێتە ناو گوێچکەی لەڕۆژی کۆتاییدا).

**حەوتەم: وێنەگران و ئەوانەی خەو بەدرۆ دەگێڕنەوە.**

ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((....مَن تَحَلَّمَ كاذِباً كلِّفَ أَن يَعقِدَ بَينَ شَعيرَتَينِ وَ يُعذَّبُ على ذلكَ))[١٦١]واتە: (هەر کەسێك خەوێکی درۆ بگێڕێتەوە دەبێت دوو دەنکە جۆ بەیەکەوە گرێ بدات و سزا دەدرێت لەسەر ئەو کارە (واتە: بێ گومان ناتوانێت بۆیە سزاش دەدرێت لەسەری))، وە لە ڕیوایەتێکدا: ((إنَّ أصحاب هذهِ الصُوَر يُعذَّ بون يوم القيامة ويقال لَهُم: أحيوًا ما خَلقتُم))[١٦٢]واتە: (خاوەنی ئەو وێنانە سزا دەدرێن لەڕۆژی کۆتاییدا و پێیان دەوترێت: زیندووی بکەنەوە ئەوانەی کە دروستتان کردووە).

**هەشتەم: زۆرداران و هاوتا بۆ خوا بڕیاردەران:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((تَخرُجُ عُنَقٌ مِنَ النّار يَومَ القِيامةِ لها عينانِ تُبصِرانِ وأذُنانِ تَسمَعَانِ، وَلِسانٌ يَنطِقُ، يَقولُ: إنـي وُكِّلتُ بثلاثةٍ: بِكُلِّ جَبّارٍ عَنيدٍ، وَبِكُل مَن دَعا مَعَ اللهِ إلهاً آخَرَ، وبالمصَوّرين))[١٦٣]واتە: (ملێك ئاگر لەڕۆژی کۆتاییدا دێتەدەر، دووچاوی هەیە پێی دەبینێت و دوو گوێی هەیە پێی

---

[١٦٠] أخرجه : البخاري (٧٠٤٢)، وابي داود (٥١٢٤)، والترمذي (١٧٥١) وقال : حديث حسن صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٤٣٢).

[١٦١] اخرجه : احمد (٢١٦/١)، والبخاري (٧٠٤٢)، والترمذي (٢٢٨٣) وقال : حديث صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٧٧٤) .

[١٦٢] اخرجه : النسائي (٢١٦/٨)، وابوداود (٥٠٢٤)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (١٥٦٥).

[١٦٣] اخرجه : احمد (٣٣٦/٢)، والترمذي (٢٥٧٤) وقال : حديث حسن صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٨٣)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٥١٢) وقال : اخرجه احمد بإسناد صحيح على شرطهما.

دەبیستێت و زمانی هەیە قسەی پێدەکات و دەڵێت: من سێ فەرمانم پێکراوە: (واتە: بەرامبەر سێ چین کەبیان گرم و ڕەوانەی دۆزەخیان بکەم): فەرمانم پێ کراوە بەهەموو زۆردارێکی کەلەڕەق، وبەهەموو ئەو کەسانەی کە داوایان لە کەسێك یان لە شتێکی تر کردووە لەگەڵ خوا، وە بە وێنەگران ).

**نۆهەم: نیعمەت گوزاران.**

ئەوانەی کەلەدونیادا زۆر تێرن ئەوانە لە ڕۆژی کۆتاییدا زۆر برسین، عطیەی کوڕی عامر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی:((إنَّ اكثر النَّاسِ شَبَعاً في الدُنيا أطْوَلَهم جُوعاً يَومَ القيامة))[١٦٤]. واتە: ( .... زۆرینەی ئەو کەسانەی کەتێرن لە دونیادا ئەوانە لەڕۆژی کۆتاییدا برسی ترین کەسانێن). وە چەندین کەسان کەلە دونیا پۆشتەن بەلاَم لەڕۆژی کۆتاییدا بێ جل و بەرگ دەبن وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((رُبَّ كاسيةٍ في الدُّنيا عاريةٍ في الآخرة))[١٦٥]. واتە: (ئای چەندین کەسان هەن کە پۆشتەن لەدونیاداو ڕووت و بێ بەرگن لەکۆتاییدا)) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((الاكثَرون هُمَ الاسفَلُونَ [المقِلّون] يَومَ القيامة إلاّ مَن قالَ بالمالِ: هكذا وهكذا او كسَبَهُ مِن طيِّبٍ))[١٦٦] واتە: (خاوەن سامانە زۆرەکان ئەوانە بێ سامان و هەژارەکانن لە ڕۆژی کۆتاییدا تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە پارەیان بەشێوەی ئاوا و ئاوا (واتە: پڕ بەمشت بەڕاست و چەپدا بەخشیویانە لەڕێگەی خوادا) یاخود ئەوانەی کە لەڕێگەیەکی پاکەوە بەدەستیان خستووە)، کەواتە زۆرجار خاوەن سامانەکان پلە نزمەکان دەبن لە ڕۆژی کۆتاییدا، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرمویت: ((لايصيب عبدٌ من الدنيا شيئاً الا نقص من درجاته عند الله وان كان عليه كريماً))[١٦٧]. واتە: (بەندە هەر

---

[١٦٤] اخرجه : ابن ماجة (٣٣٥١)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٧٠٦) حسن، وفي ((صحيح الجامع)) (١٥٧٧): حسن، و في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٥٧٧) حسن، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٣٤٣).

[١٦٥] اخرجه : البخاري (١١٥،٦٢١٨).

[١٦٦] اخرجه: ابن ماجة (٤١٣٠)، وحسنه الشيخ الالباني ((صحيح ابنْ ماجة)) (٣٣٣٢)،و((صحيح الجامع)) (٢٧٨٥).

[١٦٧] أخرجه: هناد (٥٥٥) وقال محققه : اسناده صحيح، ابن ابي شيبة ((المصنف)) (٣٥٧٧١)، وقال المنذرى ((الترغيب)) (٤٧٠٩): اسناده جيّد، وقال الشيخ الألباني ((صحيح الترغيب)) (٣٢٢٠): صحيح، وقال الارناؤو في تخريج ((جامع العلوم)) (١٨٨/٢) :اسناد جيّد.

شتێکی دەست کەوێت لەدونیادا ئەوشتە دەبێتە کەم کردنەوەی پلەکانی لای خوا هەر چەندە ئەو کەسە لای خوای گەورەش بەڕێز بێت).

**دەهەم: دووڕووەکان**

عـەمار (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لەپێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویـەتی: ((مَـن كـانَ ذاوَجهينِ في الدُّنيا كانَ لَه لِسانانِ يَومَ القيامةِ مِنَ النّار))[١٦٨]. واتـە:( هـەر کەسێك دوو ڕووی هەبێت لەدونیادا، ئەوا دوو زمانی ئاگرینی دەبێت لەڕۆژی کۆتاییدا).

**یازدەهەم: داگیرکردنی زەوی**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:((مَن سَرَقَ شبراً مِن الأرضَ أوغلَّهُ جَاءَ يَومَ القيامة يَحمِلهَ [في رواية: يحمِلَ تُرابَها][١٦٩] إلى أسفلِ الأرَضَين))[١٧٠]. واته: (هەر کەسێك بستێك زەوی بدزێت یاخود دایببڕێت، لەڕۆژی کۆتاییدا دێت ئەو زەویەی هەڵ گرتووە، (لەڕیوایەتێکدا: خۆڵەکەی هەڵگرتووە) هەتا هەرە خوارەوەی زەوی). وە لەڕیوایەتێکدا ئەبو سەلمە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن [ظَلَم قَيدَ شِبرِ مِنَ الارض][١٧١]... بغير حقِّهِ خُسِفَ بِهِ [في رواية:طوَّقهُ][١٧٢] يومَ القيامةِ الى سَبعِ أرضين))[١٧٣]. واته: (هەر کەسێك (واتە: بەزوڵم) ئەندازەی بستێك لە زەوی، داگیر کردبێت بەبێ ماف خۆی، ئەوا ڕۆدەچێنرێت و دەکرێتە گەردنی لەڕۆژی کۆتاییدا هەتا دەگەیەنرێتە حەوتەم چینی زەوی هەرە خواروو).

---

[١٦٨] اخرجه : البخاري في ((الادب المفرد)) (١٣١٠)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الادب المفرد)) (٩٨٣) : حسن، وفي ((السلسة الصحيحة)) (٨٩٢)، وقال الحافظ العراقي في تخريجة على ((الاحياء)) (١٥٤/٣) : رواه البخاري في ((الادب)) بسندٍ صحيح.

[١٦٩] في رواية.

[١٧٠] اخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٦٩٢/٢١)، وابن حبان (٥٦٩/١٠) وقال الشيخ الارناؤوط في تحقيقه : اسناده صحيح.

[١٧١] في رواية.

[١٧٢] في رواية.

[١٧٣] اخرجه : البخاري (٢٢٨٨، ٢٢٨٩). وفي رواية عن ابن مسعود(ﷺ) قال : قلت يارسول الله : أيُ الظُلمِ أظلَم؟ قال : ((ذِراعٌ مِنَ الأرضِ ينتقِصها المَرءُ المُسلم مِنْ حَقِّ أخيهِ إلاّ طَوَقَها يومَ القيامةِ إلى الأرض ولا يعلم قعرها الاّ الله الذي خَلَقَها)) : رواه احمد (٣٩٦/١) (٣٧٦٧) وقال محققه : اسناده ضعيف، قال الهيثمي في : مجمع الزوائد (١٧٤/٤) : اسنده حسن، وضعفها الشيخ الالباني في ((ضعيف الترغيب)) (١١٧١) واوردته للعلم فقط.

وەلەڕیوایەتێکی تردا: یەعلای کوڕی مورە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أيّما رَجلٍ ظلِم شِبراً مِنَ الارضِ كَلّفهُ الله ان يُطوِّقَهُ يَومَ القيامة حتى يَفصُلَ بينَ النّاسِ))[١٧٤]. واتە: (هەر پیاوێك بستێك لەزەوی بەستەم داگیربکات خوای گەورە داوای لێ دەکات کە هەڵی بکەنێت تا دەیگەیەنێتە زەوی حەوتەم، ئینجا دەیکاتە تەوقی گەردنیەوە لەڕۆژی کۆتاییدا هەتا خەڵکان لەیەك جیا دەکاتەوە).

**دوازدەهەم: بێ ئاگایان لە یا دی خوای گەورە.**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:((مَن اضطَجع مُضطجعاً لَم يَذكُرِ الله تعالى فيهِ إلاّ كانَ عَليه تِرّةٌ يَومَ القيامةِ، وَمَن قَعَدَ مَقعداً لَم يَذكرَ الله عزَوُجَل فيه إلاّ كانَ عَليه تِرّةٌ (أي نقصٌ وتَبعةٌ)))[١٧٥] وفي رواية ((..... حسرةٌ...))[١٧٦] رواية أخرى:((...وما مِن رجلٍ مشى طريقاً فَلم يذكر الله عزوجل إلاّ كانَ عليه تِرّةٌ...))[١٧٧] واتە:(هەرکەسێك ڕاکشا بێت و پاڵی دابێتەوە لە جێگەیەکدا و یادی خوای تیا نەکردبێت ئەو کارە دەبێت بەتاوان و کەم و کوڕی بەسەریەوە لەڕۆژی کۆتاییدا، وەهەر کەسێ دانیشت بێت لەهەر دانیشتنێکدا و یادی خوای تیا نەکردبێت ئەو کارە دەبێت بەتاوان و کەمو کوڕی بەسەریەوە لەڕۆژی کۆتاییدا، وە لەڕیوایەتێکی تردا....دەبێت بەداخ بۆی لەڕۆژی کۆتاییدا، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر کەسێك بڕوات بە ڕێگەیەکدا و یادی خوای تیا نەکات ئەو کارەدەبێت بە تاوان وکەم وکوڕی بە سەریەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**سیازدەهەم: ئەوانەی کە خۆیان لە منداڵەکانیان بەری دەکەن.**

عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن إنتَفى مِنْ وَلَدِهِ لِيَفضَحَهُ في الدُنيا فَضَحهُ الله يَومَ القيامةِ على رؤوسِ الاشهادِ، قِصاصٌ،

---

[١٧٤] اخرجه : احمد (١٧٣/٤)، وابن حبان (٥١٦٤) وقال المحقق : حديث صحيح، و قال الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٤٠) : اسناده جيد.

[١٧٥] اخرجه : ابوداود (٥٠٥٩)، والحميدي (١١٥٨)، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٨) : اسناده حسن، وفي ((صحيح الترغيب)) (٦٠٧)، واللفظ لأبن ماجة.

[١٧٦] أخرجه : احمد (٤٦٣/٢)، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٦) وقال : اسناده صحيح.

[١٧٧] اخرجه احمد (٤٣٢/٢)، والحاكم (٥٥٠/١) صححه على شرط البخاري وقال الذهبي : صحيح على شرط مسلم، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٩).

بقصاصٍ))[١٧٨]. واتە: (هەر کەسێك خۆی بەری بکات لەمنداڵەکەی بۆ ئەوەی ئابرووی بەرێت لەدونیادا، خوای گەورە ئابرووی دەبات لەپێش چاوی ئامادەبووان لەڕۆژی کۆتاییدا، تۆڵە بەتۆڵە).

**چواردەهەم: ڕیابازان وە حەرام خۆرەکان بەسەر موسوڵمانەوە.**

موعاذ (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مـامِن عبـدٍ يَقومَ في الدُّنيا مقام سُمَعَةً و رياءً، إلاّ سَمَّعَ الله بِهِ عَلى رؤوسِ الخلائِقِ))[١٧٩] وقد ورد بلفظ اخـر: ((مَن سَـمعَّ النّـاسَ بعملِـهِ سَمّـعَ الله بـهِ مسـامِعَ خلقِـهِ يـوم القيامـة وحَقّـرهُ صـغّرهُ))[١٨٠] واتـە: هەربەندەیەك لە دونیا لە جێگەیەکدا بوەستێت بۆ ڕیاو فیز ئەو کەسە خوای گەورە بەو کارەی ئابڕوی دەبات لەپێش زیندووکراوەکان لە ڕۆژی کۆتاییدا، وەلەڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (هـەر کەسێك کارێك بکات بۆ ئەوەی خەڵکان بیبیستنەوە خوای گەورە ئەو کارە ڕیاییەی ئاشکرا دەکات ودەیدات بەگوێی دروست کراوانی خۆیدا لەڕۆژی کۆتاییداو سووکی دەکات)،

وەلەڕیوایـەتێکی تـردا: مسـتەوردی کـوڕی شـداد (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَن أَكَلَ بمسلمٍ أكلةً، اطعَمُه الله بِها أكلةً مِن نـارِ يـوم القيامـةِ، ومَـن أَقامَ بمسلـمٍ مَقَامَ سُمعَةٍ اقامَهُ الله يُومَ القيامةِ مَقامَ رِياءِ وسَمُعَةِ، ومَن اكتِسَى بمُسلمٍ ثَوباً، كسَاهُ الله ثَوباً مِـن نـارِ يَـومِ القيامَـةِ))[١٨١] واتـە: (هـەر کەسێك خواردنێك بخوات لەسەر حیسابی موسوڵمانێك بەناحەق خوای گەورە خواردنێکی لەئاگری پێ دەدات لـە ڕۆژی کۆتاییدا وە هەرکەسێك موسوڵمانێك ڕابگرێت لە جێگەیەکدا بۆ ڕیاو فیز، خـوای گـەورە ئەو کەسە لە جێگە و پلەیەکی ڕیابازی و فیزدا بۆ ئابڕو و چوون دەوەستێنێت لە ڕۆژی

---

[١٧٨] اخرجـه : احمـد (٢٦/٢) (٤٧٩٥) وقـال محققـه: اسـناده حسـن، والطبرانـي في ((الكـبير)) (١٣٤٧٨)، وابـونعيم الاصفهاني في ((الحلية)) (٢١٣/٩)، وقال الشيخ الارناؤوط في تحقيقه لصحيح ابـن حبـان (٤١٩/٩) : اسـناده قـوى، وقال الحافظ العراقي في تخريج ((الاحياء)) (١٧١/٤) : رواه الطبراني ياسناد جيد.

[١٧٩] اخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٢٣٧)، وحسن اسـناده كـل مـن الهيثمـي في ((المجمـع)) (٢٢٣/١٠)، و المنـذري ((الترغيب)) (١/٧٧)، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٢٨).

[١٨٠] اخرجه : احمد (٦٥٠٩)، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلةالصحيحة)) (٢٥٦٦) و((صحيح الترغيب)) (٢٥).

[١٨١] اخرجـه : البخـاري في ((الادب المفـرد)) (٢٤٠)، وابـوداود (٤٨٦٠)، والطبرانـي في ((الكـبير)) (٧٣٥/٢٠)، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٣٤)، و رواه الحاكم (١٢٧/٤) وصححه ووافقه الذهبـي.

کۆتاییدا، وەهەرکەسێك بەرگێگ بەبەردا بکات لەسەر حیسابی موسوڵمانێك بەناحەق خوای گەورە بەرگێکی لەئاگر بەبەردا دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا)، وە لەڕیوایەتێکی تردا: صەفوان (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((مَن سَمَّع سَمّعَ اللهُ بِهِ يَومِ القِيامَةِ، ومَن يُشاقِقِ يَشقُق الله [عليه]يَومَ القيامة))[١٨٢] واتە: (هەر کەسێك کارێك بکات بۆ ڕیابازی بۆ ئەوەی چاکەی کارەکەی خۆی بدات بەگوێی خەڵکاندا، خوای گەورە خراپەی کارەکەی دەدات بەگوێی بونەوەراندا لەڕۆژی کۆتاییدا)، وە هەرکەسێك زیادە ڕەوی بکات و دەرچێت لە فەرمانی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کەسە خوای گەورە باری لەسەر گران دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا.

**پازدەهەم: ئەو سوڵکەرانەی کە پێویستیان بەسواڵ نی یە.**

ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن سألَ و لَهُ مايَغنيهِ جاءَت خموشاً أوكدوحاً اوخدُوشاً في وَجهِهِ يَوم القيامة، قيل يارسول الله وما يُغنيهِ قال: خَمسُونَ دِرهماً أو [قِميتَها مِنَ الذهبِ] ))[١٨٣]. واتە: (هەرکەسێك سواڵ بکات و ئەوەندەی هەبێت کە پێویستی بەسواڵ نەبێت ئەو کەسە سواڵ کردنەکەی دەبێت بە برین و ڕنینەوە بەدەم و چاویدا لەڕۆژی کۆتاییدا، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا چەندی هەبێت پێویستی بەسواڵ کردن نابێت، فەرمووی: (پەنجا درهەم یان نرخەکەی لە ئاڵتون).

**شازدەهەم: بازرگانە درۆزن و خیانەتکارەکان**

ڕیفاعەی کوڕی ڕافیع (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((إِنَّ التُّجار يُبعَثُونَ يَومَ القيامَةِ فُجّاراً، إلاّ مَن اتّقى الله، وَبرَّ وصدق))[١٨٤]. واتە: (بازرگانەکان (واتە: تاجیرەکان) لەڕۆژی کۆتاییدا هەرە تاوان بارەکانن تەنها ئەوانەیان نەبێت کە لە خواترس وڕاست گۆ و چاکەکار بوون).

---

[١٨٢] اخرجه : البخاري (٦٤٩٩)، ومسلم (٢٩٨٧).

[١٨٣] اخرجه : النسائي (٥/٩٧)، وابوداود (٥٢٦)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابي داود)) (٤٣٨)، وفي ((المشكاة)) (١٨٤٧) : اسناده صحيح.

[١٨٤] اخرجه : الدارمي (٢/٢٤٧)، والترمذي (١٢١١) وقال : حديث حسن صحيح، وابن ماجة (٢١٤٦)، والحاكم (٦/٢) صححه ووافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٩٤).

**حەڤدەهەم: ئەوانەی کە پۆشاکی ناوداری دەپۆشن (لباس الشهرة).**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت** ((مَن لَبِسَ ثَوبَ شُهرةٍ في الدُنيا البَسهُ اللهُ ثَوُبَ مَذَّلةٍ يَوم القيامة، ثُمَ الهبَ فيهِ ناراً))(١٨٥). **واتە: (هەر کەسێك لەدونیادا جل و بەرگێکی گران بەها بۆ فیز لەبەربکات خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا جل و بەرگێکی زەلیلی بەبەردا دەکات و پاشان ئاگری تێ بەردەدرێت).**

**هەژدەهەم: غەدرکاران**

**عەبدولڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی:** ((اذا جَمعَ اللهُ الاولينَ والآخرِينَ يَومَ القيامةِ يُرفَعُ لِكُلِ غادرٍ [والغادِرُ هو كما قال رسول الله (ﷺ): إذا إطمأنَّ الرَجُلُ الى رجلٍ ثُمَ قَتَلَه بَعدَما أطمأنَ عليه نُصِبَ لَه لواءُ غَـدرٍ...](١٨٦) [بقِدَرِ غدرِته] عِندَ اَستِهِ فيُقَالُ: [ألاَّ هَذا غَدرةُ] فلانَ بن فلانٍ [ألاَ ولا غادِرَ أَعظَمُ غَدراً مِـن أَمـيرِ عَامـةِ](١٨٧)))(١٨٨). **واتە: لەو کاتەدا کە خوای گەورە یەکەمینەکان و کۆتاییەکان لە ڕۆژی کۆتاییدا کۆدەکاتەوە بۆ هەموو غەدارێك ئاڵایەك بەرزدەکرێتەوە بە پشتیەوە (بەئەندازەی غەدرەکەی) دەوترێت: (ئائەمە ئەو کەسەیە کە غەدری)لە فلانی کوڕی فلان کردووە، (ئاگادار بن کەهیچ غەدارێك غەدرکردنەکەی گەورەتر نی یە لەسەرۆکێکی گشتی)، وەغەدریش ئەوەیە هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوونی دەکاتەوە و دەفەرموێت:((ئەگەر پیاوێك متمانە بەپیاوێك بکات (واتە:لێی ئەمین بێت) ئینجا بیکوژێت دوای ئەوەی کە متمانەی پێ کردووە و لێی ئەمین بووە ئەو کەسە ئاڵایەکی غەدری بۆ دەچەقێندرێت).**

---

(١٨٥) اخرجه: ابوداود (٤٠٣٠)، وابن ماجة (٣٦٠٧)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابوداود)) (٣٣٩٩)، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٩٠٦)، وفي ((المشكاة)) (٤٣٤٦).

(١٨٦) أخرجه : الحاكم (٣٥٣/٤) و صححه ووافقه الدهبي، و إبن ماجة (٢٦٨٨)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح إبن ماجة)) (٢١٧٧)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٤٤١) عن عرم بن الحمق.

(١٨٧)أخرجه: مسلم (١٧٣٨).

(١٨٨) أخرجه: مسلم (٧١/٢) (١٧٣٥)، (١٧٣٨) كتاب الجهاد، وانظر ((السلسلة الصحيحة)) (١٧٦٦).

**نۆزدەهەم: تف کردن ڕووە و قیبلە.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ((مَن تَفَلَ تُجاهَ القِبلَةِ،جاءَ يوم القيامةِ و تَفَلَتُهُ بَينَ عَينيهِ))[١٨٩] و في رواية:[وهي في و جهِهِ]))[١٩٠]. واتە: (هەر کەسێك تف ڕووەو قیبلە بکات لەڕۆژی کۆتاییدا دێ و تفەکەی لەنێوان هەردوو چاویدایە وە لەڕیوایەتێکدا هاتووە: ئەو تفە بەدەم و چاویەوەیەتی)، وە مەبەستیش لەتف کردن ڕووەو قیبلە تەنها لەکاتی ئەنجامدانی نوێژدایە، وەك ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إذا كان أحدكُم يُصَلي فَلا يَبصُقَنَ قِبلَ وجهِهِ فإنَّ اللهَ عزوجل قِبل وجهِهِ إذا صلّى))[١٩١] وفي رواية ((إذا قام أحدكم... في صلاته، يقبلُ الله عليه بوجهِهِ، فلا يَبُزقَنَ احدكم في قبلته، ولا يبزقُنَ عن يمينه، فانَّ كاتب الحَسنات عنْ يَمينِهِ، ولكن لِيَبزقُنَّ عن يساره))[١٩٢] واتە: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد باتف نەکات ڕوو بەقیبلە کاتێك کە وەستاوە لەنوێژدا چونکە خوای گەورە لەڕووی قیبلەیدایە کە نوێژ دەکات، وە لەڕیوایەتێکی تردا: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەستا .... لەنوێژەکەیدا، خوای گەورە ڕوودەکاتە ئەو نوێژ خوێنە هەر یەکێك لەئێوە با تف نەکات بەرەو ڕووی قیبلە، وتف نەکات بەلای ڕاستیدا چونکە نوسەری چاکەکان لای ڕاستیەتی، بەڵام با تف بەلای چەپیدا بکات).

**بیستەم: ئەو ئافرەتانەی شین بۆ مردووان دەکەن و دەیان لاوێننەوە لای خەڵکان تا بیانکەنە گریان.**

هاوەڵی بەڕێز ئەبی مالیکی ئەشعەری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... و النّائِحة إذا لَم تَتُب قَبلَ مَوْتِها يُقامُ يَومَ القيامِةِ فِي سِربال مِن قَطِرانٍ و دِرعٌ مِن جَرَبٍ))[١٩٣]. واتە: (.....ئافرەتی شیوەنکار ئەگەر تەوبە نەکات پێش مردنی،

---

[١٨٩] أخرجه : إبن خزيمة في ((صحيحة)) (٩٢٥)، و أبوداود (٢٨٢٤)، و البيهقي (٧٦/٣)، إبن أبي شيبة (٣٦٥/٢)، و إبن حبان (١٦٣٩) و قال محققه : إسناده صحيح على شرط البخاري، و إبن الجوزي في ((العلل)) (٤١٤/١) (٧٠١)، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسة الصحيحة)) (٢٢٢).

[١٩٠] في رواية إبن حبان.

[١٩١] أخرجه : النسائي (٥١/٢)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٦٩٩).

[١٩٢] اخرجه إبن نصر في ((الصلاة)) (١/٢٤) و إسناده صحيح كما قال : الشيخ الألباني في: ((السلسلة الصحيحة)) (١٠٦٢)، و اخرجه إبن حبان (٢٢٧٠) و قال محققه إسناده حسن.

[١٩٣] أخرجه: مسلم (٩٣٤)، و إبن حبان (٣١٤٣) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

لەڕۆژی کۆتایدا دەوەستێنرێت و شەڕواڵێکی قەتران (واتە: شەڕواڵێکی قیری سوتاوی ئاگری دۆزەخ) و کراسێکی زبری ئاگرینی بەبەردا دەکرێت.

**بیست و یەك هەمین: ئەوانەی هەوڵ دەدەن بۆ خۆش کردنی ئاگری ئاژاوە.**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((وَيلٌ للعرب مِن شرٍ قَد اِقتَرَب، فِتنةٌ عمياءٌ صَمّاءٌ بَكماءٌ، القاعِدُ فيها خيرٌ مِنَ القائِمِ والقائمُ فيهاخيرٌ مِنَ الماشي، والماشي فيها خيرٌ منَ السَاعِي، وَيلٌ للسّاعي فيها يومِ القيامةِ)) [١٩٤] واتە: (هاوار بۆ عەرەب خراپەیەك نزیك بۆتەوە لێیان، فیتنەیەکی کوێرکاری کەڕکاری لاڵ کارە، دانیشتوو تیایدا چاکترە لەوەی بەپێوەیە،و ئەوەی بەپێوەیە چاکترە لەوەی پیادەڕەوە تیایدا، و ئەوەی پیادەڕەوە تیایدا چاکترە لەوەی کە هەوڵ دەدات بۆ خۆش کردنی فیتنەکە، هاوار بۆ ئەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بۆ خۆش کردن و جۆش دانی فیتنە لەڕۆژی کۆتاییدا (واتە: دەبێت چی لیٚ بکرێت و سزا و حاڵی چۆن بێت لەڕۆژی کۆتاییدا) .

## حاڵی پارێزگاران (المتقين)

ئالەو ڕۆژە نارەحەتەدا خاوەن باوەڕان و پیاوچاکانی خوای گەورە ترسی هەرە گەورەی ئەو ڕۆژە غەمباریان ناکات و مەلائیکەکان پێیان دەگەن و مژدەیان دەدەنیٚ کە ئەوانە دوورن لە ئاگری دۆزەخ و بەڵکو گوێشیان لەگرمەگرم و دەنگی دۆزەخ نی یە وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾(الأنبياء: ١٠١ - ١٠٣) وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ (يونس: ٦٢) واتە: ﴿پیاوچاکانی خوای گەورە ترسیان لەسەر نی یەو بەهیچ جۆرێك غەمباری نایان گرێتەوە﴾، وە پێغەمبەر (ﷺ) بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە پیاوچاکانی خوا ئەوانەن کە لەپێناوی خوادا

---

[١٩٤] اخرجه : ابن حبان (٦٧٠٥) وقال محققه : اسناده صحيح على شرط مسلم.

یەکتریان خۆش ویستووە لەدونیادا، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ للهِ عباداً لَيسُوا بأنبياءَ [ولاشُهداءَ] يَغبَطُهمُ الأنبياءُ والشّهداءُ [يَومَ القيامةِ لقرُبهم مِنَ اللهِ] لايَخافُونَ إذا خافَ النّاسُ ولا يَحزَنُونَ إذا حَزَنَ النّاسُ... [قومٌ مِن أَفناءِ النّاسِ مِن نُزّاعِ القَبائِلِ تِصَادَقُوا فِيَ اللهِ و تَحابَوا فَيهِ..هُم أَولياءُ اللهِ الذيَن لا خَوفٌ عَلَيهم ولا هُم يَحزَنُون] ))[١٩٥] واتە: (خوای گەورە هەندێ بەندەی هەیە نەپێغەمبەرانن (وە نەشەهیدانن) پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن (بەنزیك بوونیان لە خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا) ناترسن کاتێك خەڵکان دەترسن وەغەمبارو دڵگران نابن کاتێك کە خەڵکان غەمبارو دڵ گران دەبن....(خەڵکانێکی دوور لەیەك بوون وهەریەکەیان لەهۆزی جیا جیابوون هاوەڵ داریێتیان لەپێناوی خوادا بووە و یەکتریشیان خۆش ویستووە لەپێناوی خوادا ئەوانە پیاو چاکانی خوان کە ترسیان لەسەر نی یە و غەمباریش نابن)، وە خوای گەورە (سبحانه وتعالى) دەفەرموێت :

﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾ (الزخرف: ٦٨). واتە: ﴿ئەی بەندەکانم ئەمرۆ ترس نی یە لەسەر ئێوە وە دڵگرانیش نابن﴾.

وە ئەو پیاو چاکانە کەسانێکی بڕوادار بوون وکاری چاکەیان ئەنجام داوە بۆ خوا وەك خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ ....مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ (البقرة: ٦٢) واتـە: ﴿ هـەر کەسێك باوەڕی بە خـوا و ڕۆژی کۆتـایی هـەبێت و کـرداری چـاکە بکـات ئەوانـە پاداشتیان لای خوایـە، وەنەترسیان لە سەرە وە نەغـەمبار ودڵگران دەبن﴾. وە خـوای گـەورە ئـەو باوەڕدارانـە دەپارێزێـت کـە لـەدونیادا زۆر ترسـاون لـە ناڕەحـەتیـەکانی ڕۆژی کۆتـایی وەك خـوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوۡمًا عَبُوسٗا قَمۡطَرِيرٗا ۝١٠ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا ﴾ (الإنسان: ١٠ – ١١). واتە: ﴿ئەوانەی کەوتویانە بەڕاسـتی ئێمـە لـە سـزای خـوای گەورە دەترسین لە ڕۆژێکی ترش و تاڵ و دژواردا، جا ئەوانە خوا پاراستنی لە شـەڕی ئەو ڕۆژە وە ڕووگەشی وشادمانی پێ داون﴾.

---

[١٩٥] اخرجه : احمد (٤٣/٥)، والنسائي ((الكبرى)) (١١٢٣٦) و البزار (٣٥٩٣)، و ابـو نعيم في ((الحلية)) (٥/١)، و الحاكم (١٧٠/٤) صححه ووافقه الذهبي، و قال المنذري في ((الترغيب)) (١٧٠/٤) : إسناده حسـن، و إبـن حبـان (٥٧٣) و قال محققه : إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٠٢٢-٣٠٢٥).

وە ئەو پیاو چاکانە خوای گەورە چاکەیان لەگەڵدا دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا و پاداشتی چاکەکانیان ون ناکات لەو ڕۆژەدا، وەك قوبەیصە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أهلُ المعرُوفِ في الدُّنيا هُم أهلُ المعروفِ في الآخِرَةِ...))[١٩٦]. واتە: (خاوەن چاکەکان لەدونیادا هەر ئەوان خاوەن چاکەن لە ڕۆژی کۆتاییدا...) (واتە: ئەوان کەسانێکن کە شایستەن چاکەیان لەگەڵدا بکرێت لەڕۆژی کۆتاییدا).

## ئەوانەی لەژێر سێبەری عەرشدا دەبن

ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەفەرموێت: ((الشمس فوق رؤوس الناس يوم القيامة واعمالهم تظلهم و تصبهم))[١٩٧]. واتە: (ڕۆژ لەسەر سەری خەڵکانە لەڕۆژی کۆتاییدا و کردەوەکانیان لەگەڵیاندایە و سێبەریان بەسەرەوە دەکات). لەو ڕۆژەدا خوای گەورە چەندین کۆمەڵ لە موسوڵمانان کۆدەکاتەوە لەژێر سێبەری عەرشی خۆیدا لەوانە:

**یەکەم: حەوت کۆمەڵەکە.**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((سَبعَةٌ يُظِلُّهُم اللّٰه فِي ظِلهِ، يَومَ لاظِلَّ إلاَّظِلَّهُ: إمَامٌ عادِلٌ، وَشَابٌ نشَأَ فِي عِبادَةِ اللّٰهِ تعالى، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللّٰه خالِياً: فَفاضَت عَيناهُ، وَرَجلٌ قلبهُ مُعَلَّقٌ بِالمَسَاجِدِ، وَرَجُلانِ تَحابَّا فِي اللّٰه: اجتَمَعا عَلَيهِ، وَ تَفرَّقا عَلَيه " وَرَجلٌ دَعَتهُ امرَأَةٌ ذاتُ مَنصِبٍ وَ جَمَالٍ [إلى نفسِها] فقال: إنّي أخافُ اللّٰهَ رَبَّ العالمِين، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بصَدَقَةٍ فَأَخفاها: حَتى لا تَعلَمَ شِمالُهُ ما تُنفِقُ يَمِينُهُ))[١٩٨] واتە: (حەوت کۆمەڵ هەن خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی (واتە: سێبەری عەرشی خۆیەوە) لەڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نی یە تەنها سێبەری ئەو نەبێت: پێشەوایەکی دادپەروەر، و گەنجێك کەلەپەرستنی خوای گەورەدا گەورە بوو بێت، و پیاوێك کە یادی خوا دەکات لەچۆڵی یەکدا هەر دووچاوی فرمێسکی لێ دەڕژێتە خوارەوە، و

---

[١٩٦] أخرجه : البخاري في ((الأدب المفرد)) (٢٢١)، وقال الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (١٦٣)، وفي ((الروض)) (١٠٣١) : صحيح لغيره. وفي رواية : ((و الذي نفس محمد بيده ان المعروف و المنكر لَخَليقَتان ينصُبان للنّاسِ يومَ القيامةِ، فامّا المَعروفُ فَيُبشِرُ أصحابَهُ و يُوعِدُهم الخيرَ، و امّا المُنكرُ فيقولُ : إليكم إليكم و مايستطيعون لَهُ الاّ لزوماً)). أخرجه: أحمد (١٩٤٨٧) وقال محققه: رجاله ثقات، و الطيالسي (٥٣٥).

[١٩٧] أخرجه: هناد (٣٣١) وقال محققه : اسناده صحيح.

[١٩٨] أخرجه احمد (٢/٤٣٩)، والبخاري (٦٦٠)، و مسلم (١٠٣١)، والترمذي (٢٣٩١)، والنسائي.

پیاوێك کەدڵی هەڵواسراوە بەمزگەوتەکانەوە (واتە: مزگەوتی زۆر خۆش دەوێت و زۆر هاتو چۆی دەکات) و دوو پیاو کە لەپێناوی خوادا یەکترییان خۆش ویستووە و هەر لەسەر ئەوەش کۆبوونەتەوە و هەر لەسەر ئەوەش جیابونەتەوە، و پیاوێك کە ئافرەتێکی جوانی خاوەن پلەو پایە بانگی لێ دەکات (بۆلای خۆی تا داوێن پیسی لەگەڵدا بکات) ئەویش پێی دەڵێت (واتە: پیاوەکە) من دەترسم لەپەروەردگاری هەموو جیهانیان، و پیاوێك ئەگەر هەر خێرێك (صدقە) بکات دەیشارێتەوە تاوەکو لای چەپی نەزانێت لای ڕاستی چی کردووە بەخێر).

وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إنَّ اللّٰه يَقولُ يَومَ القيامةِ: أينَ المُتحابُونَ بِجَلاَلي اليَومَ اظِلّهُم في ظلي يَومَ لاَ ظِلَّ إلاَّ ظِلّي))[199]. واتە: (خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا دەفەرموێت: ئەوانەی لەسایەی بەرزی مندا یەکتریان خۆشویستووە لەکوێن ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سێبەرم ڕۆژێکە کە هیچ سێبەرێك نی یە تەنها سێبەری من نەبێت).

وە سەبارەت بەمانای (لەژێر سێبەرم)دا: مانای سێبەری عەرشی خوا دەگرێتەوە وەك زانا ابن حجر العسقلاني(رحمه الله) دەفەرموێت: "...والمعنى الراجح هو: تحت ظل عرشه"[200] واتە: (مانای شیاو ئەوەیە: لەژێر سێبەری عەرشدا دەبێت) وە بەڵگەش بۆ بۆچونەکەی ئیبن حەجەر ئەو ڕیوایەتەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ((...إظِلهُم في ظل العرش))[201]. واتە: (.... دەیانخەمە ژێر سێبەری عەرشەوە).

---

[199] اخرجه : مسلم (٢٥٦٦).

[200] انظر: ((فتح الباري)) (٢/١٤٤).

[201] اخرجه : إبن أبي الدنيا، وقال الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٤/١١٦) إسناده صحيح، وفي رواية : ((إنَّ الله تعالى يقولُ : إينَ المُتحابونَ بجَلالي، اليومَ اظِلهم في ظلِّ عَرشيْ يوم لا ظِلَّ إلاَّ ظلّي)) أخرجه احمد (٢/٢٣٧)، مسلم (٢٥٦٦).

**دووەم: چاوپۆشی کردن لە قەرزار وەسوك کردنی قەرزەکەی.**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((مَن أنظَرَ مُعسِراً، أو وَضَعَ لَهُ، اظَلّهُ اللّهُ يَوم القيامة تَحتَ ظَلّ عرشهِ يَومَ لا ظِلَ إلاّ ظِلهُ))[٢٠٢]. واتە: (هەر کەسێك ماوەی دەست کورتێك بدات یاخود هەندێکی بەسەرەوە لابدات (واتە: قەرزەکەی)، خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، لە ڕۆژێکا کە هیچ، سێبەرێك نی یە تەنها سێبەری ئەو نەبێت).

**سێیەم: چاکەو خێرکردن.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((كُلُ أمرِيءٍ فِي ظِل صَدَقَتِهِ حَتى يُقضَى بيَن النّاسِ))[٢٠٣] واتە: (هەموو کەسێك لەژێر سێبەری چاکەکەیدایەتی هەتا دادوەری نێوان خەڵکان یەکلا دەکرێتەوە). لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە موسوڵمانی خێر خوان، خێرو چاکە کردنەکەی لەدونیادا دەبێت بەسێبەر بۆی لەمەحشەردا و سوودی لێ وەدەگرێت، وەك هاوەڵی بەڕێز مورثیدي کوڕی عەبدولاّ (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ ظَلِ المُؤمَنِ يَوم القيامِة صَدَقَتهَ))[٢٠٤]. واتە: (سێبەری خاوەن باوەڕ لە ڕۆژی کۆتاییدا خێرو چاکە کردنەکانیەتی) ، وە هاوەڵی بەڕێز عەوف کوڕی مالیك (ﷺ) دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە دەرەوە گۆچانێکی بەدەستەوە بوو. پیاوێك هێشووە خورمایەکی قەسپی (واتە: خورمایەکی ڕەقی وشکی خراپی) هەڵواسی بوو (واتە: لەمزگەوتدا بۆ خێر) پێغەمبەریش (ﷺ) گۆچانەکەی دەکرد بەناو هێشووە خورماکەدا و دەیفەرموو: ((لَوشَاءَ رَبُ هَذهِ الصَدَقةَ تصدَقَ بأطِيَبَ مِن هذا، إنَ رَبَّ هذهِ الصدَقَة يأكُلُ حُشفاً يَومَ

---

[٢٠٢] أخرجه : مسلم (٣٠٠٦) الترمذي (٥٠٤٤)، الطبراني ((الكبير)) ١٩ /٣٧٩، و إبن حبان (٥٠٤٤) وقال محققه : إسناده صحيح على شرط مسلم، و صححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (١٩٢٥)، وفي ((مختصر العلو)) ((٨٨)، و في ((صحيح الترغيب)) (٨٧٢).

[٢٠٣] أخرجه : احمد (١٤٧/٤)، و أبو يعلى (١٧٦٦)، والحاكم (٤٠٦/١) صححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، و ابن حبان (٣٣١٠) و قال محققه : إسناده صحيح على شرط مسلم، و البيهقي في ((الكبرى)) (١٧٧/٤)، و في ((الصغرى)) (١١٨٨) و قال محققه : رواته ثقات، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (١١٠/٣) : رواه احمد و رجاله ثقات، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٨٦٦).

[٢٠٤] أخرجه: أحمد (٢٣٤٩٠) وقال محققه حديث صحيح، وقال الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (١٩٢٥) : اخرجه احمد بإسناد صحيح.

القيامةِ))[٢٠٥].واتە: (ئەگەر خاوەنی ئەم خێرە ویستی لێ بوایە لەمە چاکتری دەکرد بەخێر، خاوەنی ئەم خێرە قەسپ دەخوات لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**چوارەم: ئەوانەی لە پێناوی خوادا یەکتریان خۆش ویستووە.**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:((إِنَّ اللّٰه تعالى يَقَولُ: [أَينَ] المتحابُونَ بجلالي، اليَومَ اظِلُّهم فِي ظِلِ عرشيِ يوم لا ظِل إلاّ ظلي))[٢٠٦]واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوانەی لەسایەی بەرزی مندا یەکتریان خۆش ویستووە لە کوێن ؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سێبەری عەرشم، ڕۆژێکە کە هیچ سێبەرێك نی یە تەنها سێبەری عەرشی من نەبێت.

**پێنجەم: ئەوەی سێبەر بەسەر سەری موجاهیدێکەوە بکات.**

ئیمامی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن أَظَّـل رَأسَ غـازٍ، أظَّلَـهُ اللّٰهُ يَـومَ القيامـةِ))[٢٠٧]واتە: (هەر کەسێك سێبەر بکات بەسەر موجاهیدێکەوە خوای گەورە سێبەری بەسەرەوە دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا ).

**شەشەم: کەسێکی لەسەر خۆ و زانا و نوێژخوێن.**

سەلمان (ﷺ) دەفەرموێت: (( ان في ظل الله يوم لاظل الا ظله..... ورجلاً نبت بحلم وعلم فان تكلم تكلم به و اذا سكت سكت عليه ورجلاً راعى الشمس لوقت الصلاة))[٢٠٨]. واتە: (ئەوانەی کە لە ژێر سێبەری خوادان لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نی یە تەنها هەر سێبەری خوا هەیە: پیاوێکە ژیانی بە زانایی و لەسەر خۆیی بردووەتە سەر و بەزانست قسەی کردووە وهەربەویش بەلەسەر خۆی و بێ دەنگ بووە. وەپیاوێکی تریش کەبەردەوام چاودێری ڕۆژی کردووە بۆ زانینی کاتی ئەنجامدانی نوێژەکان).

---

[٢٠٥] أخرجه : النسائي (٤٣/٥) و الحاكم (٢٨٥/٢) صححه ووافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٢٣٣٧)، و((الثمر المستطاب)) (٨٢٥/٢).

[٢٠٦] اخرجه : أحمد (٢٣٧/٢، ٣٣٨)، ومسلم (٢٥٦٦)، و إبن حبان (٥٧٤) و قال محققه : إسناده صحيح على شرطهما، و قال الشيخ الألباني في ((مختصر العلو)) (ص: ١٠٥) (٥٦) : حديث صحيح.

[٢٠٧] اخرجه : احمد (٤٨٧/٣)، والحاكم (٨٩/٢) و صححه ووافقه الذهبي، إبن حبان (٤٦٢٨) و قال محققه : رجال ثقات رجال الصحيح، أبو يعلى (٢٥٣)، و قال مُحقِق : المسند (أحمد بن حنبل) رقم (١٢٧) : حديث صحيح.

[٢٠٨] أخرجه: هناد ((الزهد)) (٤٧٤) وقال محققه : اسناده صحيح.

**حەوتەم:خوێنەر و لەبەرکاری سورەتی ( البقرة ) و ( آل عمران ).**

نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ)دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يأتي القرآنُ وأهلُهُ الَّذِينَ يَعمَلُونَ بِـهِ فِـي الـدُّنيا تُقدِمُـهُ سـورةُ البَقَـرةِ و آلِ عِمـرانَ كأنّهمـا... غمَامَتانِ سَوداوانِ، أوكأنّهمـا ظُلـةٌ مِـن طـيرٍ صُـوافٍ...))[٢٠٩]واتە: (قورئان و خاوەنەکانی ئەوانەی کە کاریان پێی کردووە لەدونیادا، دێن و سورەتی (البقرة) و (آل عمران) وەکو.......دوو پەڵە هەوری گەورە وان یاخود وەکو پۆلە باڵندەیەکی زۆرن...) (واتە: سێبەر دەکەن بەسەر ئەو کەسانەی کە سورەتی (البقرة)(آل عمران) یان لەبەرکردوە و کاریان پێ کردووە) .

ئیمانی موجاهید (رحمه الله) لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا﴿ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴾ ( الزمر: ٣٣) دەفەرموێت:((هم الذين يحتجون بالقرآن يوم القيامة قد اتبعوه أو قال قد اتبعوا ما فيه))[٢١٠].واتە: (مەبەستی ئەو کەسانەیە کە لە ڕۆژی کۆتاییدا دێن وقورئانیان خوێندوە و شوێن کەوتووی بوون).

## ئەوانەی لەسەر کورسی ئاڵتون و ئەوانەی لەسەر مینبەری مرواری دانیشتوون

**یەکەم: دادپەروەران.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((الُمقسِطُونَ يَومَ القيامة عَلى مَنابِرَ مِن نُورٍ " عَن يَمـيَنِ الرَّحمـانِ " وَ كِلتَـا يَديـهِ يَمـين، المُقسِـطُونَ [الـذيَن يَعـدِلُونَ في حُكمِهـم و آهلِـيهِم و مَاوُلّوا]))[٢١١]. واتە: ( دادپەروەران لەڕۆژی کۆتاییدا لەسەر چەندین مینبەری نورین لای ڕاستی پەروەردگارەوەن .... ئەوانەن کە دادپەروەر بوون لە نێو فەرمان ڕەوایاندا بەرامبەر (ئەوانەی لەژێر دەستیاندان بوون).

---

[٢٠٩] أخرجه : الترمذي (٢٨٨٣) و قال : حديث غريب، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٣١٣).

[٢١٠] أخرجه: ابن المبارك (الزهد) (٧٥٤) وقال محققه : اسناده صحيح.

[٢١١] أخرجه : احمد (٢/١٦٠) و مسلم (١٨٢٧)، والنسائي (٨/٢٢١)، إبن حبان (٤٤٨٤) و قال محققه : حديث صحيح.

**دووەم: خاوەن باوەڕان (ئیمانداران).**

**عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( يَشْتَدُّ كَرَبُ ذَلَكِ اليَومَ حتى يَلجَم الكَافِرُ العَرقَ، قِيل له: فَأَينَ المؤمِنونَ ؟ قال: ((على كَراسِي مِن ذَهبٍ و تظَلِلُ عَليهُم الغَمَامُ))[٢١٢] **واتە: ( ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە زیاد دەبێت و پەرە دەستێنێت وعارەق تا لغاوەی کافر دەگرێتەوە، پێی وترا: ئەی خاوەن باوەڕان لەکوێن ؟ فەرمووی: ((لەسەر چەندین کورسی ئاڵتونین و هەوریش سێبەر دەکات بە سەریانەوە)).**

**سێیەم: ئەوانەی لە پێناوی خوادا یەکتریان خۆشویستووە.**

**ئەبو دەردا (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((لَيَبعَثَن اللّهُ أقوماً يَومَ القيامة فِي وجُوهُهم النُّور عَلى مَنابِرَ اللُؤلُؤ يَغبَطهُم النَّاسُ... هُم المُتحابونَ فِي اللّه مِن قَبائِلَ شَتى وَبِلادٍ شَتّى يَجتَمِعُونَ على ذِكر اللّهِ))[٢١٣] **واتە: (خوای گەورە کەسانێك زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا دەم و چاویان پڕ نورە و لەسەر چەندەها مینبەری مروارین، خەڵکان خۆزگەیان پێ دەخوازن و ........ ئەوانەن کە یەکترییان خۆش ویستووە لە پێناوی خوادا، وە لە چەندین هۆز و وڵاتی جیاجیان بوون و کۆدەبونەوە لەسەر یادی خوا ).**

**چوارەم: پیاو چاکانی خوای گەورە ( أولياء الله تعالى ):**

**ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((إنَّ لِلّهِ عِباداً لَيسُوا بِأَنبِياء [ولاشُهداء] يَغبِطُهم النَّبِيُّونَ و الشُهَداءَ [يَومَ القيامةِ لِقُربَهم مِنَ اللّهِ و مجلِسَهم مِنه... قَومٌ مِن افناءِ النّاسِ مِن نزَّاعِ القَبائِلِ تَصادَقُوا فِي اللّهِ وَ تحابُوا فيهِ يَضَعُ اللّهُ لَهمُ يَومَ القيامِةِ مَنابِرَ مِنَ نورٍ فَيُجلِسَهُم، يَخافُ النّاسُ، ولا يَخافُونَ هُم أولياءُ اللّه الذينَ لاَ خوفٌ

---

[٢١٢] أخرجه : البيهقي في : ((البعث و النشور))(١٤٠)، وأبو نعيم في : ((الحلية)) (٨ /١٢٦)، و إبن حبان (٧٤١٩) و قال محققه إسناده حسن، و الدينوري في : ((المجالسة)) (٢٠٣٧) و قال محققه : إسناده جيد، و قال الحافظ في : ((الفتح)) (١١/ ٤٨٠) : أخرجه البيهقي بسند حسن، و قال السيوطي في ((تمهيد الفرش)) (ص: ١٢٧ ): حديث صحيح، وأنظر ((موارد الضمان)) (٢٥٨٧).

[٢١٣] أخرجه : الطبراني ((الكبير)) (١٢٦٨٦)، و حسن إسناده كل من المنذري في: ((الترغيب)) (٤٤٤٦)، و الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (١٠/ ٧٧)، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٠٢٥).

علَـیهِم ولاَهُــم یَحزنــون][٢١٤]))[٢١٥]. واتـە: خـوای گـەورە چـەندەها بەندەی هەیـە کـە پێغەمبەران نین (وە شەهیدانیش نین)پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن (لەڕۆژی کۆتاییدا لەبەر نزیکی دانیشتنیان لە خوای گەورە وە.........کەسانێکن لەئەم لاو ئەو لای خەڵکانن لەچەندین هۆزی جیا جیان، هاوەڵدارێتی یەکتریان کردووە لە پێناوی خوادا و هەر لەپێناوی ئەویشدا یەکتریان خۆشویستووە، خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا چەندەها مینبەری نوریان بۆ دادەنێت و دایان دەنیشێنێت لەسەری، خەڵکی دەترسن و ئەوان ناترسن، ئەوان پیاو چاکانی خوان کەترسیان لەسەر نی یە و غەمباریش نابن).

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەباسکردنی یەکێك لە سیفەتەکانی پیاو چاکان بۆ ئەوەی بیان ناسین بۆمان ڕوون دەکاتەوە ودەفەرموێت: ((أَوَلياءَ اللّهِ الّذينَ إذا رؤُوا ذُكِرَ اَللّهُ تعالى [لرؤُيَتهم] ))[٢١٦] واتە: (پیاو چاکانی خوا کەسانێکن گەر ببینرێن یادی خوا بە بەبیری خەڵکان دەهێننەوە ( بەبینینیان) ).

**پێنجەم: ئەوانەی کۆچیان کردووە لەبەر خوا:**

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ﷺ) دەیگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: ((للمهاجرين منابر من ذهب يجلسون عليها يوم القيامة قد امنوا مـن الفـزع))[٢١٧] واتە: (کۆچکاران مینبەری نوریان هەیە لە ڕۆژی کۆتاییدا لە سەری دادەنیشن و هێور ودوورن لە ترس و تۆقینی ئەو ڕۆژە).

---

[٢١٤] في رواية الحاكم.

[٢١٥] اخرجه : احمد (٥/٣٤٣) (٢٢٧٨٢) وقال محققه : اسناده صحيح، وأبو نعيم في ((الحلية الأولياء)) (١/٥)، والحاكم (٤/١٧٠) صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وقال المنذري في ((الترغيب)) (٤/١٧٠) : إسناده حسن، و إبن حبان (٥٧٣) و قال محققه : إسناده صحيح، وابو يعلى (٦١١٠)، و قال الشيخ الألباني في ((فقه السيرة)) (ص: ١٦١) : حديث حسن، واخرجه الحاكم و هو صحيح الإسناد، وانظر: ((صحيح الترغيب)) (٣٠٢٧).

[٢١٦] اخرجه : الطبراني ((الكبير)) (١٢٣٢٥)، وقال الهيثمي في : ((المجمع)) (١٠/٧٨) : رواه الطبراني و رجاله ثقات، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٢٥٥٧)، و (٢٥٨٧)، و((السلسلة الصحيحة)) (١٧٣٣)، (١٦٤٦).

[٢١٧] اخرجه : عبدالرزاق (١٥٨٢)، ابن حبان (١٥٨٢)، والبراز (١٧٥٣)، و الحاكم (٤/٧٦)، وصححه الشيخ الالبانى في ((الصحيحة )) ( ٣٥٨٤ ).

# ئەوانەی پۆشاکی باوەڕ و ڕێز و سوندسیان لەبەردەکرێت

**یەکەم: ئەوەی دڵ نەوایی برایەکی بکات کە تووشی موصیبەت هاتووە.**

موحەمەدی کوڕی عەمرو کوڕی حەزم (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مامِن مُؤمِنٍ يُعَزّى أَخَاهُ بِمُصِيبةٍ إلاّ كسَاهُ اللّهُ سُبحانَهُ مِن حُلَلِ الكَرامَةِ يَومَ القيامَةِ))[٢١٨]. واتە:(هەر خاوەن باوەڕێك دڵ نەوایی برایەکی بداتەوە کە تووشی موصیبەتێك بووە ئەو کەسە خوای گەورە لەپۆشاکەکانی ڕێزی بە بەردا دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا ).

**دووەم: ئەوانەی واز لە پۆشاك ( جل وبەرگ )ی گران بەها دێنن لەبەرخوا.**

موعاذی کوڕی ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن تَرك اللِبّاسَ تَواضُعاً لِلّه وَ هُوَ يَقدِرُ عَليهِ دَعاهُ اللّهُ يَومَ القيامةِ على رؤُوسِ الخلائِقِ حتّى يخَيِّرَهُ مِن أي حُلَلِ الإيمانِ شاءَ يَلبَسُها))[٢١٩].

واتە: (هەرکەس ئارەزووی لە پۆشاکێکی گران بەها هەبێت و بتوانێت بیکڕێت، بەڵام وازی لێ بهێنێت لەبەر خۆبەکەم زانینی بۆخوا ئەو کەسە خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا لەپێش چاوی زیندووەکان بانگی دەکات تا بەویستی خۆی هەڵبژێرێت لەبەرگەکانی باوەڕ ئەوەی کە خۆی بیەوێت تا بەبەری خۆیدا بکات).

**سێیەم: ئەوەی کفنێك بۆ برایەکی موسوڵمانی بکات:**

ئەبی ئومامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن غسَلَ مُسلِماً فليغتسل... وَمَن كَفَّنه، كَسَاهُ اللّهُ مِن السُندسِ [وإستَبرَق الجنَةِ]))[٢٢٠] واتە:(هەر

---

[٢١٨] أخرجه : إبن ماجة (١٦٠١)، قال الإمام النووي في ((الأذكار)) (ص: ١٣٥) : إسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن إبن ماجة)) (١٣٠١)، وفي ((إرواء الغليل)) (٧٦٤).

[٢١٩] أخرجه : احمد (٤٣٨/٣) رقم (١٥٦٣١) و قال محققه : إسناده حسن، و الترمذي (٢٤٨١) و قال : حديث حسن، وأبو نعيم في ((الحلية)) (٤٨/٨)، والطبراني في ((الكبير)) (٣٨٦/٢٠)، و الحاكم (١٨٣/٤) و صححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧١٨).

کەسێك موسوڵمانێکی مردوو بشۆرێت با ئەو کەسەش خۆی بشۆرێت...وەهەر کەسێك کفنێکی بۆ بکات خوای گەورە لە سوندس وحەریری بەهەشتی بەبەردا دەکات).

**چوارەم: ئەو کەسەی منداڵەکەی فێری قورئان دەکات.**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویێت:**(( ان القرآن يلقي صاحبه يوم القيامة حين ينشق عنه قبره كالرجل الشاحب فيقول له هل تعرفني ؟ فيقول: ما اعرفك ؟ فيقول: أنا صاحبك القرآن الذي اظمأتك في الهواجر واسهرت لبيلك وان كل تاجر من وراء تجارته وانك اليوم من وراء كل تجارة فيعطى الملك بيمنه و الخلد بشماله و يوضع على رأسه تاج الوقار ويُكسى والداهُ حلتين لايقوم لهما الدنيا فيقولان: ربنا بم كينا هذا؟ فيقول: باخذ و لدكما القرآن))[٢٢١]. **واتە: (بڕوادار لە ڕۆژی کۆتاییدا کاتێك گۆڕەکەی درز دەبات بەسەریەوە و لە گۆڕەکە دێتەدەر قورئان وەك پیاوێکی ماندوو پێی دەگات و دەڵێت من دەناسی ؟ بڕوادارەکەش دەڵێت: نەخێر نات ناسم دەڵێت: من قورئانی هاوڕێی تۆم کە لە ڕۆژە گەرمەکاندا تونیم کردیت و بێدارم کردیت لە شەوەکاندا و هەموو بازرگانێك بە دوای بازرگانیەکەی خۆیەتی ئەمڕۆش تۆ دەگەیت بە هەموو بازرگانیەکانت، پاشان موڵك دەدرێتە دەستی ڕاستی و مانەوەی هەتا هەتایی دەدرێتە دەستی چەپی و تاجی بەهاوسەنگینی دەکرێتە سەری، و باوك و دایکی ئەو کەسەش دوو پۆشاکیان دەدرێتی کە هەموو پۆشاکەکانی خەڵکی دونیا ناگاتە بەهای ئەو دوو پۆشاکە، وە ئەو دایك و باوکە دەڵێن: ئەم پۆشاکەمان لەبەر چی دەست کەوت ؟ پێ یان دەوترێت: لەبەر ئەوەی کە منداڵەکەتان فێری قورئان کرد.**

---

[٢٢٠] أخرجه: الطبراني في ((الكبير) (٨٠٧٧)، والبيهقي في ((الصغرى)) (٩٥٦) و قال محققه: رواته ثقات، وقال المنذري في ((الترغيب)) (١٣٤/٦) : رواته رواة الصحيح، والحاكم (٣٥٤/١) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٣٩٥/٣)، وقال الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص ٥١) : صحيح.

[٢٢١] اخرجه: احمد ((المسند)) (٣٤٨/٥)، وابن ماجة ((السنن)) (٣٧٨١)، والدارمي ((السنن)) (٤٥٠/٢)، والحاكم (٥٦٨/١) وصححه ووافقه الذهبي، وابن ابي شيبة ((المصنف)) (٤٩٢/١٠)، وقال الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٤٨)، و((صحيح الترغيب)) (١٤٣٤)، وفي ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٥٩) الحديث يحتمل التحسين، وقال ذلك ايضاً الشيخ الأرناؤوط في تحقيقه لـ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٩٤/١)، وأخرجه: أحمد (٢٢٩٥٠) وقال محققه : اسناده حسن في الشواهد.

# ئەوانەی خوای گەورە تەماشایان ناکات و گفتوگۆیان لەگەڵدا ناکات و نایان بەخشێت و سزایەکی سەختیان دەدات

**یەکەم: ئەوانەی وتەکانی خوا دەشارنەوە و بەنرخێکی کەم دەیفرۆشن و پارەی پێ پەیدا دەکەن.**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (البقرة: ١٧٤). **واتە: ﴿ئەوانەی ئایەتەکانی خوا دەشارنەوە کە دایبەزاندووە لە کتێبەکەیدا وە بەنرخێکی کەم دەیفرۆشن ئەوانە ئاگر دەکەنە ناو سکیانەوە و لەڕۆژی کۆتاییدا خوای گەورە گفتوگۆیان لەگەڵدا ناکات و نایان بەخشێت و سزایەکی پڕ ئازاریان بۆ ئامادە دەکات﴾.**

**دووەم: ئەوانەی مامەڵە بەسوێندی درۆ دەکەن و دەیبەنە سەر:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾(آل عمران: ٧٧) **واتە: ﴿ئەوانەی بەڵێن و سوێند خواردنەکانیان دەفرۆشن و نرخێکی کەمی پێ پەیدا دەکەن ئەوانە تەنها ئاگر دەکەنە ناو سکیانەوە و بێ بەشن لە ڕۆژی کۆتاییدا و خوای گەورە لەو ڕۆژەدا گفتوگۆیان لەگەڵدا ناکات و تەماشایان ناکات و نایان بەخشێت و سزایەکی پڕ ئازاریان بۆ ئامادە دەکات﴾. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە ئیبنو ئەبو ئەوفا (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:** ((إنَّ رَجُلاً أقامَ سِلعة له فحلفَ بالله لقد أعطى فيها مالم يعطه بها، فنزلت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا .... ﴾( آل عمران: ٧٧) **واتە: پیاوێك كاڵایەكی لەگەڵ خۆی هێنایە بازاڕ تا بیفرۆشێت و سوێندی خوارد بەخوا کە نرخێکی پێدراوە**

کەلەڕاستیدا ئەوەندەی پێنەدابوو پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا .... ﴾( آل عمران: ٧٧)[٢٢٢].

**سێیەم: ئەوەی جل وبەرگەکەی دەخشێنێ بەسەر زەویدا بەفیزو خۆ بەزل زانینەوە.**

ئەبی ذەرِ (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((ثلاثـة لا يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ ولا يَنظرُ إليهِم يومَ القيامةِ ولا يُزَكِّيهِم: المسبِل...))[٢٢٣]واتە: (سیان هەن کە خوای گەورە گفتوگۆیان لەگەڵدا ناکات و تەماشایان ناکات و پاکیشیان ناکاتەوە لە تاوانەکانیان: ئەوەی جل و بەرگەکەی بەسەر زەویدا دەخشێنێ و شۆڕی کردۆتەوە بۆ فیز و خۆبەزل زانین.......)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا عەبدوڵای کوڕی عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((الإسبالُ في الإزار و القميصِ و العمامةِ من جَرَّ منها شيئاً خُيَلاء لَم يَنظر اللّه إلَيهِ يَومَ القيامةِ))[٢٢٤]. واتە: (الاسبال) لەپەشتە ماڵ و کراس و جامانەدایە هەر کەسێ هەر یەك لەوانە شۆڕ بکات یاخود بی خشێنێت بۆ فیز، خوای گەورە تەماشای ناکات لە ڕۆژی کۆتاییدا.

**چوارەم: منەتکار و ئەوەی کە کاڵاکەی بەسوێندی درۆ دەفرۆشێت:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ثَلاثَةٌ لا يُكَلِمَهُم اللهُ ولاَ يَنظُر إليَهم يومَ القيامةِ ولا يُزَكِّيهِم... المنان و المنفق سلعته بالحِلفِ الكاذِبِ))[٢٢٥]. واتە: (سیان هەن کە خوای گەورە گفتوگۆیان لەگەڵدا ناکات و تەماشایان ناکات و پاکیشیان ناکاتەوە لە تاوانەکانیان لەڕۆژی کۆتاییدا کەسێك جل و بەرگەکەی بەسەر زەویدا بخشێنێ و شۆڕی بکات (بۆفیزو خۆ بەزل زانین ) وە منەتکار وە ئەوەی کاڵاکەی بەسوێندی درۆ سەرف دەکات و دەفرۆشێت).

---

[٢٢٢] أخرجه: الحاكم (٢/٨)، وصححه و وافقه الذهبي.

[٢٢٣] أخرجه : مسلم (١٠٦)، وأبوداود (٤٠٨٧).

[٢٢٤] أخرجه : أبي داود (٤٠٩٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٣٤٤٩)، وفي ((المشكاة)) (٤٣٣٢)، و((صحيح الجامع)) (٢٧٧٠).

[٢٢٥] اخرجه : مسلم (١٠٦)، و أبوداود (٤٠٨٧)، والترمذي (١٢١٠) و قال : حديث حسن، صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٩٦٧)، وفي ((صحيح سنن النسائي)) (٤١٥٢)، و إبن حبان (٤٩٠٧) و قال محققه، إسناده صحيح على شرطهما.

**پێنجەم: ئەوانەی پشتیان ڕێك ناکەنەوە لەنوێژەکانیاندا لەنێوان رکوع و سجوددا.**

ئەبی هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لا یَنظُر اللّهُ یومَ القیامةِ إلى العبدِ لا یُقیمُ صُلبَهُ بَینَ رَکوُعِهِ وَ سَجُودِهِ))[٢٢٦] واتە: (خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا تەماشای ئەو بەندەیە ناکات کە پشتی ڕێك ناکاتەوە لە نێوان ڕکوع و سوجدەکەیدا لە نوێژدا).

**شەشەم: ئازاردانی دایك و باوك و ئەوانەی مەی خواردن تەرك ناکەن وئەوانەی منەت کارن:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((ثلاثة لا یَنظر اللّه إلیهم یَومَ القیامةِ: العاقَ لوالدیهِ، و مُدمِنُ الخَمرِ، و المَنّانُ بِما أعطَى))[٢٢٧] واتە: (سیان هەن کە خوای گەورە تەماشایان ناکات لەڕۆژی کۆتاییدا: ئەوەی ئازاری دایك و باوکی دەدات و ئەوەی مەی خواردنەوە تەرك ناکات و ئەوەی منەت دەکات بەوەی کە دەیبەخشێت).

**حەوتەم: پیرێکی زیناکار و سەرۆکێکی درۆزن و هەژارێکی خۆبەزل زان.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((ثلاثةٌ لا یَنظُر اللّهُ إلیهم یَومَ القیامةِ: الشَّیخُ الزّانی، و الإمامُ الکذّابُ، و العائِلُ المزَهوّ [ في روایة: العائلُ المُستکبر][٢٢٨] ))[٢٢٩] واتە: (سیان هەن خوای گەورە تەماشایان ناکات لەڕۆژی کۆتاییدا: پیرێکی زیناکار، سەرۆکێکی درۆزن، وە هەژارێکی خۆبەزل زان).

---

[٢٢٦] أخرجه : أحمد (٢٢/٤) و قال الحافظ العراقي في تخریج ((الأحیاء)) (٤٧/١) : ورواه احمد بإسناد صحیح، وقد ورد بلفظ آخر : ((لاینظر الله إلى صلاة رجل لایقیم صلبه بین رکوعه و سجوده)) أخرجه : احمد (٥٢٥/٢) رقم (١٠٧٩٩) وقال محققه الأرناؤوط : حدیث حسن.

[٢٢٧] أخرجه : احمد (١٣٤/٢)، و النسائي (٨٠/٥)، والحاکم (١٤٦/٤) و صححه ووافقه الذهبي، وصححه الشیخ الألباني في : ((صحیح سنن النسائي)) برقم (٢٤٠٢)، وابن حبان (٧٣٤٠) و قال محققه. إسناده صحیح.

[٢٢٨] في روایة.

[٢٢٩] أخرجه : احمد (٤٣٣/٢)، ومسلم (١٠٧)، و النسائي (٨٦/٥)، إبن حبان (٤٤١٣) و قال محققه : إسناده صحیح علی شرط مسلم. و صححه الشیخ الألباني في ((صحیح سنن النسائي)) (٤١٥٣). و((صحیح الجامع)) (٣٠٦٩).

**هەشتەم: ئەوەی دەچێتە لای ئافرەتێك یان پیاوێك لەدواوە:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((لا یَنظُر اللّٰهُ إلى رَجُلٍ أتى رَجُلاً أو إمرأةً في الدُبر))[٢٣٠] واتە: (خوای گەورە تەماشای پیاوێك ناکات کەچوو بێتە لای پیاوێك یان ئافرەتێك لەدواوە).

**نۆیەم: ئەو ئافرەتەی کەچاکەی مێردەکەی لەبەرچاو نی یە و سوپاسیشی ناکات:**

عەبدڵای کوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لا یَنظُر اللّٰـهُ إلى إمرأةٍ لاتَشكُر لِزوجَها وهيَ لا تستَغني عَنه))[٢٣١]واتە: (خوای گەورە تەماشای ئافرەتێك ناکات کە سوپاسی مێردەکەی ناکات لەکاتێکدا کە بێ ئەو ناژی و ناتوانێت دەست بەرداری بێت).

**دەیەم: ئەوانەی داوێن پیسی کەسەکانیان قبوڵ دەکەن و ئەو ئافرەتانەی کە لاسایی پیاو دەکەنەوە:**

عەبدوڵای کوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ثلاثة لا يَنظَر اللّٰهُ إليَهم يَومَ القيامةِ، العاق لوالديهِ، و المرأةُ المتَرَجِلةُ المتُشبِهةُ بالرِّجالِ، و الديوُث))[٢٣٢]واتە: (سیان هەن خوای گەورە تەماشایان ناکات لەڕۆژی کۆتاییدا: ئازاردەری دایك وباوك، و ئەو ئافرەتەی کە خۆی دەشوبهێنێن بەپیاو وە ئەوەی داوێن پیسی کەسەکانی دەزانێت و گوێی پێ نادات).

**یازدەهەم: ئەوەی ئاوی زیاد لەخۆی نابەخشێت، وە ئەوەی پەیمان بەسەرۆکەکەی دەدات و مل کەچی دەکات تەنها لەبەر دونیا وە ئەوەی سوێند بەدرۆ دەخوات دوای کاتی عەسر:**

ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((ثلاثَةُ لايَنظر اللّٰه إليهم يَوم القيامَةِ و لا يَزكيهم وَلَهُم عَذابٌ أَليمٌ: رجلٌ كان له فضَلَ ماءٍ بالطريق فَمَنَعهُ

---

[٢٣٠] أخرجه : الترمذي (١١٦٥)، و أبوداود (٢١٦٢) و إبن ماجة (١٩٢٣)، و إبن حبان (٤٢٠٣) و قال محققه : إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن إبن ماجة)) (١٥٦٠)، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٤٣١/١)، و في ((لمشكاة)) (٣١٩٤).

[٢٣١] أخرجه : النسائي في ((الصغرى))(٨٤/١)، و السنن الكبرى رقم (٩١٣٥)، والحاكم (١٩٠/٢) صححه ووافقه الذهبي، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٠٩/٤) : رواه البزار و أحمد إسناده رجاله رجال الصحيح، و قال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٨٩) : إسناده صحيح.

[٢٣٢] أخرجه : احمد (١٣٤/٢)، و النسائي (٣٥٧/١)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٦٧٤)، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٠٧١)، و في ((صحيح سنن النسائي)) (٢٤٠٢).

مِن إبن السَبيلِ [فيَقولُ اللّٰهُ: اليومَ أمنَعُكَ فَضلي كماَ مَنعتَ، فضلَ مَالَم تَعمل يَداكَ][٢٣٣] وَرَجُلٌ بَايَعَ إماماًلا يُبايعُهُ إلاّ لُدنيا، فَإن اَعطاهُ مِنها رضيَّ، و إنْ لَم يُعطِهِ مِنها سَخِطَ، ورَجلٌ أقامَ سِلَعَتهُ بَعدَ العصرِ فَقالَ: و اللّٰهِ الّذي لاَ إلهَ غَيرهُ لَقد اَعطَيتُ بِها كَذا و كَذا فَصَّدَقهُ رَجلٌ، ثُمَ قرأ: إنّ الّذين يشترون بعهد الله و أيمانهم ثمناً قليلاً... ))[٢٣٤] **واتە:(سیان هەن خوای گەورە تەماشایان ناکات لە ڕۆژی کۆتاییدا وە پاکیان ناکاتەوە لەتاوانەکانیان وسزایەکی سەختیان دەدات :پیاوێك کە ئاوی زیاد لە پێویستی خۆی هەیە لەڕێگەیەکدا و لەڕێبواری قەدەغەکردووە (خوای گەورە پێی دەفەرموێت:ئەمڕۆ بەخشینی خۆمت لێ قەدەغە دەکەم وەك چۆن بەخشینی ئەوەی خۆت کە بەدەستت نەتکردبوو قەدەغەت کرد) (واتە: ئەو کەسە، ئەو کانیەی خوای گەورە هەڵی قوڵاندووە و ئادەمی دەستی نەبووە لە هەڵکەندنیدا ئاوەکەی لە ڕێبوار و خەڵکی قەدەغە کردووە)، و پیاوێك پەیمانی مل کەچی دەدات بەسەرۆکێك، تەنها پەیمانەکەشی لەبەر دونیایە،ئەگەر پارەی پێ ببەخشێت لێی ڕازی دەبێت و ئەگەر پارەی پێ نەدات لێی بەتوڕەیە، وپیاوێك کە کالاًیەك دادەنێت دوای عەسرو درۆ دەکات ودەڵێت، سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نی یە تەنها ئەو نەبێت ئەوەندە و ئەوەندەم پێ‌داوە، پیاوەکەش بەڕاستی دەزانێت (واتە: کڕیار) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾( آل عمران: ٧٧).

**دوانزەهەم: ئەو حوکمڕانەی گوێ نادات بەکارو باری ژێر دەستەکانی.**

**(ابن مریم الازدی) (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی:** ((مَن وَلاّه اللّٰهُ شَيئاً مِن اُمُورِ الُمسمِينَ، فاحتَجَبَ دُوَنَ حاجَتِهم و خُلَتِهم وَ فقرِهِم، إحتَجَبَ اللّٰهُ

---

[٢٣٣] رواية البخاري (٢٣١٩).

[٢٣٤] أخرجه : مسلم (١٠٨)، و الترمذي (١٥٩٥) و قال : حسن صحيح، و إبن ماجة (٢٢٠٧)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٢٧٩)، و في ((صحيح سنن إبن ماجة)) (١٧٩٢) : صحيح، وفي ((المشكاة)) (٢٢٠٠).

دوَنَ حاجَتِهِ وَ خُلَتِهِ وَ فَقرِهِ يَومَ القيامَةِ))[٢٣٥]. واتە: (هەر کەسێك خوای گەورە بیکات بە سەرپەرشتیاری شتێك لە کاروباری موسوڵمانان و ئەو سەرپەرشتیارە خۆی نیشانی گەلەکەی نەدات تا هەژاران و ئەوانەی پێویستیان پێیەتی دەنگیان بگاتە لای بۆ جێ بەجێ کردنی کاروبارەکانیان ئەوا خوای گەورە خۆی نیشانی ئەو سەرپەرشتیارە نادات لە ڕۆژی کۆتاییدا و پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ ناکات).

## ئەوانەی خوای گەورە لێ یان نابورێت و هیچیان لێ وەرناگرێت وازیان لێ ناهێنێت

**یەکەم: ئەوانەی تاوانبارێك دەشارنەوە بۆ دوورخستنەوەی لەتۆڵە سەندنەوە (القصاص).**

ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:((...مَن قَتَلَ عَمَداً فَقُودُ يَدِهِ، فَمَن حَال بَينُه و بَينهَ، فَعَلَيه لَعنَةُ اللّهِ و الملائكةِ و النّاسِ أجمَعين لا يُقبَلُ مِنهُ صَرَفٌ ولا عَدلٌ))[٢٣٦]. واتە: (هەر کەسێك کەسێك بەئەنقەست بکوژێت دەکوژرێتەوە، وە هەر کەسێك ئەو تاوانبارە داڵدە بدات و نەهێڵێت بەسزای خۆی بگەیەنرێت و تۆڵەی لێ بکرێتەوە، ئەو کەسە لەعنەتی خوا و مەلائیکەتەکان و سەرجەم خەڵکانی لێ بێت و خوای گەورە کاری چاکەی وای لێ وەرناگرێت کە ببێتە هۆی سڕینەوەی ئەو تاوانەی یاخود خوا لێی ببورێت و بیخاتە بەهەشت).

**دووەم: منەتکارو ئازاردەری باوك و دایك و بێباوەڕ بەقەزاو قەدەری خوای گەورە.**

ئەبو ئومامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ثلاثة لا يُقبَلُ مِنهُم يَومَ القيامَةِ صَرَفٌ ولا عَدلٌ: عاقٌ و مَنّانٌ و مُكذّبٍ بِالقَدرِ))[٢٣٧] واتە: (سیان هەن لەڕۆژی کۆتاییدا کارەکانیان لێ وەرناگیرێت: کەسێك زۆر ئازاری دایك و باوکی بدات و منەتکار و بەدرۆخەرەوەی قەزاو قەدەر).

---

[٢٣٥] أخرجه : أبو داود (٢٩٤٨)، والترمذي (١٣٣٢) وقال : حديث غريب، والحاكم (٤/٩٣) و قال إسناده صحيح ووافقه الذهبي، وقال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢/٢٠٦) : إسناده صحيح.

[٢٣٦] أخرجه : النسائي (٨/٣٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٤٤٥٦).

[٢٣٧] أخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٧٥٤٧)، وحسنه الشيخ الباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٤/٣٩١)، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٠٦٥).

**سێیەم: ئەوەی ئاژاوە بنێتەوە لەشاری مەدینەدا و ئەو کەسەی کە خۆی بەری بکات لەباوکی.**

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالب (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((المدينَةُ حَرامٌ ما بينَ عيرٍ إلى ثورٍ مَن احدثَ حدثاً، أَو آوى مُحدِثاً، فَعَليه لعَنَة اللّٰهِ و الملائِكةِ و النّاسِ اجمَعين، لا يَقبلَ اللّٰهُ مِنهُ يَومَ القيامةِ صَرَفاً ولا عَدلاً، ومَن إدّعى إلى غَيرِ أبيهِ أو تولّى غيَر مُواليهِ فَعَلَيهِ لَعَنَةُ اللّٰهِ و الملائِكةِ و النّاسِ أَجمَعين لا يقبَلُ اللّٰهُ مِنهُ يَومَ القيامةِ صَرَفاً وَلا عدلاً))[٢٣٨]. واتە: (لە چیای عیرەوە تا چیای (ثور) لە مەدینە حەرامە هەرکەسێك ئاژاوەیەکی تیادروست بکات یان ئاژاوەچیەك دالّدە بدات ئەو کەسە نەفرینی خواو مەلائیکەتەکان و سەرجەم خەڵکانیان لێ بێت وە خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا نایان بەخشێت وە هیچ چاکە یەکیان لێ وەرناگرێت، وە ئەو کەسانەی کە خۆیان لەباوکیان بەری دەکەن و یاخود ئەوانەی سەر بەکەسانێکن خۆیان سەر بەو کەسانە نازانن، ئەوا نەفریتی خواو مەلائیکەکان و سەرجەم خەڵکانیان لێ بێت، خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا نایان بەخشێت وە هیچ چاکەیەکیان لێ وەرناگرێت).

لە ڕیوایەتێکی تردا بەحەسەنی بەصریان (رحمه الله) وت: ئاژاوە چیەکان کێن؟ وتی: ((أصحاب الفتن واهل الأهواء كلهم يحدثون))[٢٣٩]. واتە: (پیاوە ئاژاوەچیەکان وتاقم و کۆمەڵە گومڕاکان هەموو ئاژاوەدەنێنەوە).

---

[٢٣٨] أخرجه : احمد (٨١/١)، و البخاري (٣١٧٢)، ومسلم (١٣٧٠)، والترمذي (٢١٢٧) و قال : حسن صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٧٢٧).

[٢٣٩] أخرجه: الهروي في ((ذم الكلام))(١٣٥٧).

# بەیەك گەیشتنی خوای گەورە لەگەڵ بەندەکانی

ئەو کەسەی دەیەوێت و پێی خۆشە بگات بەخوای خۆی پێویستە لەسەری کاری چاکە زۆر ئەنجام بدات و پێویستە کارە چاکەکانی بەو شێوەیەش بێت کەداوای لیٚ کراوە وەتەنها لەپێناوی خوادا بێت و هیچ کەسێکی تر نەکات بە هاوەڵی خوا لەکارەکانیدا: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ﴾ (الكهف: ١١٠)، وە خاوەن باوەڕان کاتێك بەخوای خۆیان دەگەن سەرەتا سڵاو لەخوای خۆیان دەکەن و دەڵێن: (السلام) واتە: هەمان سڵاوی نێوان موسوڵمانان بەکاردێنن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَحِيَّتُهُمۡ يَوۡمَ يَلۡقَوۡنَهُۥ سَلَٰمٞۚ وَأَعَدَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَرِيمٗا ﴾ (الأحزاب: ٤٤).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەندین جۆر لەموسوڵمانانی بۆباس کردووین کە دەگەن بەخوای گەورە لەوانە:

**یەکەم: ئەو موسوڵمانەی کە پێی خۆشە بگات بەخوا، خوای گەورەش پێی خۆشە کە پێی بگات:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((مَن أَحَبَّ لِقاء اللّٰه، أحبَّ اللّٰهُ لقاءهُ، وَمن كَرِهَ لِقاءَ اللّٰه كـرهَ الله لِقـاءَهُ))[٢٤٠]. واتە: (هەرکەسێك پێی خۆش بێت بگات بە خوای گەورە، خوای گەورەش پێی خۆشە ئەو کەسە بگات پێی، وە هەر کەسێك پێی ناخۆش بێت بگات بەخوا خوای گەورەش پێی ناخۆشە ئەو کەسە پێی بگات)، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەیەکێك لەپاڕانەوەکانیدا داوا دەکات لە خوای گەورە کە شەیدای گەیشتنی ئەوی پێ ببەخشێت، هەروەها ئێمەشی فێرکردووە کە هەمان دوعا دووبارە بکەینەوە بۆ ئەوەی شیرینی بەخوا گەیشتنمان بە

---

[٢٤٠] اخرجه : الطبراني في ((الكبير)) (٩١٩/١٩)، و النسائي (١٠/٤) و الترمذي (١٠٦٦) و قال : حديث حسن، و إبن حبان (٣٠١٠) و قال محققه : صحيح على شرطهما، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٢١/٢) : إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٨٥١)، و ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٣٠-١٧٣٢-١٧٣٣-١٧٣٤).

دڵدا بچێت وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت لە دوعاکەیدا: ((اللّٰهمَ بِعلمِكَ الغيبَ و قُدرَتِكَ على الخَلقِ...و اسالك الشوق الي لقاءكَ في غير فتنةٍ مُظِلّة وَلا ضَرّاءٍ مُضرّةٍ...))[٢٤١].

**دووەم: هەرکەسێك ئەنصارەکانی نیشتەجێ بووی شاری مەدینەی خۆش بوێت، خوای گەورەش ئەوی خۆش دەوێت لەو ڕۆژەدا کە پێی دەگات:**

حارثی کوڕی زیاد (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((من أحبَّ الأنصارَ أحبَّهُ الله يومَ يلقاهُ، وَمَن أبغضَ الأنصارَ أبغَضَهُ الله يَومَ يلقاهُ))[٢٤٢]واتە: هەر کەسێك ئەنصاری خۆش بوێت خوای گەورەش ئەوی خۆش دەوێت لەو ڕۆژەدا کە پێی دەگات، وە هەرکەسێك ڕقی لە ئەنصاری بێت وە بیان بوغزێنێت خوای گەورەش دەیبوغزێنێت لەو ڕۆژەدا کە پێی دەگات ).

**سێیەم: هەرکەسێك ڕێز لەسەرۆکێکی موسوڵمانی دادپەروەر بگرێت لەدونیادا خوای گەورەش ڕێزی لێ دەگرێت لەڕۆژی کۆتاییدا:**

ئەبو بەکر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن أكرَمَ سُلطانَ الله تَباركَ وَتَعالى في الدنيا، أكرمَهُ يَومَ القيامةِ، وَمَن أهانَ سُلطانَ اللهِ تباركَ وَتَعالى في الدُنيا أهانَهُ اللهُ يَوم القيامةِ))[٢٤٣]. واتە: (هەر کەسێك ڕێز لەسەرۆکێکی موسوڵمانی دادپەروەر بگرێت لەدونیادا، خوای گەورە ڕێزی لێ دەگرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا، وەهەر کەسێك سوکایەتی بکات بەسەرۆکێکی موسوڵمانانی دادپەروەر لەدونیادا ئەو کەسە خوای گەورە سوك و ڕیسوای دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا .

---

[٢٤١] أخرجه : احمد (٤/٢٦٤)، والنسائي (٣/٥٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الكلم الطيب)) (١٠٥)، وفي ((صحيح الجامع)) (١٣٠١)، و ((صحيح سنن النسائي)) (١٢٣٧).

[٢٤٢] اخرجه: احمد (٤/٢٢١)، والطبراني في ((الكبير)) (٣٣٥٨)، وابن حبان (٧٢٧٣) وقال محققه : اسناده صحيح.

[٢٤٣] اخرجه : احمد (٥/٤٢)،٢٠٤٣٣) و قال محققه: اسناده ضعيف،و الترمذي (٢٢٢٤) وقال : حسن غريب، مختصراً، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٥/٢١٥) : رواه أحمد ورجاله ثقات، وابن أبي عاصم في ((السنة)) (٢/٩٩)، وحسنه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٥/٣٧٦)، (٢٢٩٧) : وظلال الجنة (٢٥)، وصححه في (صحيح الترمذي) (١٨١٢).

**چوارەم: هەرکەسێك پلەو ڕێزی خوا چۆن بێت لای ئەو خوای گەورەش ئاوا پلەو ڕێزی بۆ دادەنێت لەڕۆژی کۆتاییدا:**

ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن أرادَ أن يَعلَمَ مَالَهُ [ في رواية: مَنزِلَتَه] عند الله عزوجَل فَليَنظرُ مَا لِلـه عزوجـل [ في روايـة: فليَنظُـر كيـفَ منزِلةُ اللهِ عندَهُ فـإنَّ الله يَنـزِلُ العبـدُ مِنـهُ حيـثُ أنزَلَـهُ مِـن نفسـهِ] ))[٢٤٤]واتە: (هەر کەسێك دەیەوێت کە بزانێت چی هەیە (لەڕیوایەتێکدا: پلەی چۆنە) لای خوای گەورە با تەماشا بکات پلەی خوا چۆنە لای ئەو، چونکە خوای گەورە هەمان پلە دادەنێت بۆ ئەو بەندەیە کە ئەو بەندەیە بۆخوای داناوە).

**پێنجەم: خەڵکان بە پێ پەتی و بەڕووتی دەگەن بە خوای گەورە:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّكُم مُلاقوا اللهِ حُفاةً عُراةً غُـرلاً))[٢٤٥]واتە: (ئێوە دەگەن بەخوای خۆتان ڕووتن و پێ پەتین).

**شەشەم: هەموو موسوڵمانێك تەنها خۆی دەگات بەخوای گەورە و کەسی لەگەڵدا نی یە.**

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴾ (مریم: ٩٥) واتە: ﴿هەموو یەك لەوانە بە تەنها دێنە بەردەم خودای گەورە﴾.

**حەوتەم :ئەوانەی دەگەن بە خوای گەورە، وە خوای گەورە لێیان بەتوڕەیە ئەمانەن:**

**١-پیاوێك کەناوی (پاشای پاشایان) یاخود (شاهەنشاه)ی لەخۆی ناوە:**

((أغيظُ رَجلٍ على اللهِ يومَ القيامةِ و أخبَثهُ وَ أغيظَه عليه: رجلٌ تُسَمّى بِمَلك الأملاك، لا مَلِكَ إلاّ الله))[٢٤٦].واتە: (ئەو پیاوەی خوای گەورە زۆر زیاتر لێی بەڕق و تووڕەیە لە ڕۆژی کۆتاییدا وە زۆرلای چەپەڵە پیاوێکە کەناوی پاشای هەموو موڵکەکانی لەخۆی ناوە، هیچ پاشایەك نی یە تەنها خوا نەبێت).

---

[٢٤٤] اخرجه : ابونعيم في ((الحلية)) (١٧٦/٦)، والحاكم (٤٩٤/١)، البيهقي ((الشعب)) (٥٢٨)، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣١٠)

[٢٤٥] اخرجه : البخاري (٦٥٢٤)، ومسلم (٢٨٦٠).

[٢٤٦] أحمد (٣١٥/٢)، و مسلم ((كتاب الأدب)) (٢٥٩/٢)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٠٨١)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٩١٥).

**٢- چەپەڵترین ناو لای خوای گەورە:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((أخنعُ إسمِ عندالله يومَ القيامةِ رجلٌ تُسمّى بملك الأملاك))[٢٤٧]. واتە: (چەپەڵترین ناو لای خوا لە ڕۆژی کۆتاییدا پیاوێکە ناوی پاشای هەموو سامانەکانی لەخۆناوە).

**٣- ئەوەی بەفیزەوە بەسەر زەویدا دەڕوات و خۆی بەزل دەزانێت:**

ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مامِن رَجُلٍ يَتَعاظُم في نَفسِهِ: وَ يَختالُ في مَشيَتِهِ، إلاّ لَقِيَ اللهَ وَهيَ عَليهِ غَضبان))[٢٤٨] واتە: (هەر کەسێك خۆی بەزل بزانێت وە فیز بکات لەڕۆیشتنەکەیدا ئەو کەسە دەگات بەخوای گەورە و زۆر لێی بەتوڕەیە).

**٤- ئەوانەی سوێندی درۆ دەخۆن بۆ زەوت کردنی ماڵی موسوڵمانان:**

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((مَن حَلَفَ على يمين وَهوَ فيها فاجرٌ يَقتطع بها مالُ أمريٍ مُسلِمٍ، لَقِيَّ اللهَ وَ هَوِ عَليه غَضبان))[٢٤٩]واتە: (هەر کەسێك سوێند بخوات وەتیایدا درۆ بکات بۆ ئەوەی سامانی پیاوێکی موسوڵمانی پێ زەوت بکات، دەگات بەخوا، خوای گەورەش لێی بەتووڕەیە).

**٥- هەرکەسێك یارمەتی دەربێت بۆ دوژمنایەتی و ستەم لە نێوان خەڵکیدا توڕەبوونی خوای بۆ مسۆگەرە:**

ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن أعان على خصُومةٍ بظُلمٍ فَقَد بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَّ اللّهِ))[٢٥٠]واتە: (هەر کەسێك یارمەتی کەسێك

---

[٢٤٧]أخرجه : احمد (٢/٢٤٤)، ومسلم (٢١٤٣)، و حميدي (١١٢٧)، و الحاكم (٤/٢٧٤)، و الترمذي (٢٨٣٨) و قال : حديث حسن صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٢٧٣)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٩١٥)، و اللفظ للترمذي.

[٢٤٨] أخرجه : أحمد (٢/١١٨)، و البخاري في ((الأدب المفرد)) (٥٤٩)، و الحاكم (١/٦٠) صححه على شرط الشيخين و قال الذهبي صحيح على شرط مسلم و اللفظ للحاكم، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (٤٢٧)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٥٤٣).

[٢٤٩] أخرجه : البخاري (٢٢٥٤)، (٦٦٧٧) مسلم (١٣٨)، وأبوداود (٣٢٢٧)، الترمذي (٤٠٨٢)، و إبن ماجة (٢٣٢٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن إبن ماجة)) (١٨٨٢).

[٢٥٠] أخرجه : أبو داود (٣٥٩٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح أبي داود)) (٣٠٦٦).

بدات لە دەمەقاڵەیەکی ناڕەوا وستەمدا وەدوژمنایەتی بنێتەوە ئەو کەسە تووڕە بوونی خوای بۆ مسۆگەرە.

**٦- هەرکەسێك دەست بکێشێتەوە لە پەیمانێکی مل کەچی کە داویەتی لە ڕۆژی کۆتاییدا هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نابێت:**

ئیبنو عومەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە کە فەرموویەتی: ((مَن خَلَعَ یداً مِن طاعةٍ لَقَي اللهَ یَومَ القیامةِ وَ لا حُجَةَ لَهُ))[٢٥١] واتە: هەرکەسێك دەست بکێشێتەوە لەگوێ ڕایەڵی کردنێکدا (واتە: ئەو پەیمانەی کە یەکێك دەیدات بەسەرۆکی موسوڵمانان پاشان پەشیمان دەبێتەوە و دەست دەکێشێتەوە لەوپەیمانە و بەرهەڵستی دەوەستێتەوە) ئەو کەسە دەگات بە خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا وەهیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نابێت ).

لە ڕیوایەتێکی تردا: نافیع (ﷺ) دەفەرموێت: کاتێك خەڵکانی مەدینە دەستیان کێشایەوە لە بەڵێن و پەیمانی ملکەچیان بۆ یەزیدی کوڕی موعاویە (رحمه الله).

عبدولای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) کوڕانی بنەماڵە و خزمانی خۆی کۆکردەوە سەرەتا شایەتمانی هێناو پاشان وتی: ئێمە بەڵێن و پەیمانی مل کەچ بوونی خۆمان لەسەر بەڵێنی خوا و پێغەمبەر (ﷺ)دا بەو پیاوە (واتە: یەزید) وەمن لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) دەیفەرموو: ((ان الغادر ینصبُ له لواء یوم القیامة یُقال: هذا غدرةُ فلان، وان من أعظم الغدر.الاّ ان یکون الاشراك بالله تعالی، ان یبایع رجلٌ رجلاً علی بیع الله و رسوله (أي: علی شرط ما امر الله به و رسوله من بیعة الامام) ثم ینکث بیعته)) ثم قال ابن عمر ﷺ فلا یخلعن احد منکم یزید ولایُشرفن احدٌ منکم في هذا الامر فیکون صلیم (أي: قطیعةٌ) بیني وبینه))[٢٥٢]. واتە: (ئەوەی غەدربکات وە پەیمانی خۆی نەباتە سەر لە ڕۆژی کۆتاییدا ئاڵایەکی ئابڕوچوونی بۆ بەرز دەکرێتەوە و دەوترێت: ئەمە ئەو کەسەیە کە غەدری لە فلأنە کەس کردووە، گەورەترین غەدریش لە دوای هاوتا بۆ خوا دانان ئەوەیە کەسێك بەڵێنی ملکەچ بوون لەسەر بەڵێنی خواو پێغەمبەر (ﷺ) (واتە: لەسەر ئەو مەرجەی کە خواو پێغەمبەر (ﷺ) دیاریان کردووە بۆملکەچ بوونی سەرکردەکان) بداتە کەسێکی

---

[٢٥١] أخرجه : أحمد (٩٧/٢)، و مسلم (١٨٥١).

[٢٥٢] اخرجه: أحمد (٥٠٨٨) وقال محققه : اسناده صحیح علی شرطهما، ومسلم (١٧٣٥)، والبیهقي (١٥٩/٧).

تر، پاشان بەڵێنەکەی هەڵ بوە شێنێتەوە و نەیباتە سەر.ئەنجا عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) بە بنەماڵەکەی خۆی وت: لەبەر ئەوە هیچ کەس لە ئێوە بەڵێنەکەی خۆی هەڵنەوەشێنێتەوەو سەر بۆ ئەو کارە بەرزنەکاتەوە و هەر کەسێکیش وابکات ئەم کارەی دەبێتە هۆی پچڕاندنی هەموو پەیوەندیەکی لەگەڵ من).

**٧- ئەوانەی زۆر توندن لەدەمەقاڵە و شەڕی بەناهەقدا:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّ أبغض الرّجال الى الله ألألد الخصم))[٢٥٣] واتە: (ئەو پیاوەی کە خوای گەورە لە هەموو پیاوان زیاتر لێی بەتووڕەیە ئەو کەسەیە کەزۆر توندو تیژە لەکاتی شەڕو دەمەقاڵەدا بە ناحەق بۆ سەرخستنی ستەم و گومڕایی).

**٨- ئەو کەسانەی خراپە ئەنجام دەدەن لە حەرەمی مەکەدا و ئەو کەسانەی کە ڕێچکەیەکی نەفامی زیندوودەکەنەوە لە ئیسلامدا، وەئەوەی یەکێك دەکوژێت بەناحەق:**

ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:((أَبغَضُ النّاسِ إلى اللّٰهِ ثلاثةٌ: مُلحدٌ في الحَرم، وَ مُبتَغٍ فِي الإسلامِ سُنةً الجاهلية، و مَطلَبِ دَمَ اْمرِيءٍ بِغيرِ حَقٍ لِيُهرِيقَ دَمهُ))[٢٥٤] واتە: (ئەو کەسانەی خوای گەورە زۆر لێیان بەتووڕەیە لە ناوخەڵکاندا سیانن: ئەو کەسەی خراپەکاری لەحەرەمی مەککە و مەدینەدا بەر پادەکات وە ئەوەی کە دەیەوێت ڕێچکەیەکی نەفامی لەئیسلامدا بەرپا بکات، وە کەسێکیش دوای یەکێك بکەوێت بەناحەق بۆ ئەوەی خوێنی بڕژێت).

**٩- ئەوانەی بەسوێندی درۆ شتەکانیان سەرف دەکەن، و هەژارێکی خۆبەزل زان، و پیرێکی زیناکار، و سەرۆکێکی ستەمکار:**

ئەبوهورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أَربعةٌ يُبغِضُهم اللّٰهُ عزَوَجَلَ: البَيّاعُ الحَلاّفُ، و الفَقيرُ المختَالُ، و الشّيَخ الزانيُّ، و الإِمامُ الجائِرُ [والمكثر

---

[٢٥٣] اخرجه: البخاري في ((المظالم)) (رقم :٢٤٥٧)، و((التفسير)) (رقم: ٤٥٢٣)، و((الأحكام)) (رقم: ٧١٨٨)، ورواه مسلم في ((العلم ))(رقم ٢٢٦٨)، والنسائي في ((القضاة)) (٢٤٨/٨)، والترمذي في ((التفسير)) (رقم ٢٩٧٦)، وأحمد في ((المسند))(٢٠٥/٦).

[٢٥٤] أخرجه : البخاري (٦٨٨٢)، و احمد (٣٥١/٤)، و الطبراني في ((الكبير)) (٤٩٨/٢٢)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٤٠).

البخيل]))[٢٥٥] واتە: (چوار هەن خوای گەورە زۆر دەیان بوغزێنێت: فرۆشیاری زۆر سوێند خۆر، وەهەژارێکی فیز زل، وە پیرێکی زیناکار، وەسەرۆکێکی ستەمکار و دەوڵەمەندێکی چروك).

**١٠- ئەوەی پێغەمبەرێك بکوژێت یان بەدەستی پێغەمبەرێك کوژرابێت، وئەوکەسەی ڕێگەی ڕاست لە خەڵکان دەشێوێنێت، وە پەیکەرتاشەکان:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((اشِتدَّ غَضَبُ اللّٰهِ عَلى رَجُلٍ قَتَلهُ رَسُول اللّٰهِ (ﷺ) [فِي سَبِيل الله] وفي رواية: [على من دمي وجه رسول الله]))[٢٥٦] و في رواية: ((أَشدُّ النّاسِ عَذاباً يَومَ القيامَةِ مَن قَتَلَ نَبيًّا أو قَتَلَهُ نبي أو رَجَلٌ يُضلُ النَّاسَ بغيرِ عِلمٍ أَو مُصَّورٌ يُصورّ التَماثيلَ))[٢٥٧] واتە: (تووڕەبوونی خوا زۆر بەتین بووە لەسەر پیاوێك کە پێغەمبەری خوا ئەوی کوشت بێت (لەپێناوی خوادا) (وەلەڕیوایەتێکی تردا وە:لەسەر ئەو کەسەی کەدەم و چاوی پێغەمبەری خوای (ﷺ) خوێناوی کردبێت).وەلەڕیوایەتێکی تردا (سەخت ترین سزا لەڕۆژی کۆتاییدا لە ناوخەڵکی دا بۆ ئەو کەسەیە کە پێغەمبەرێکی کوشتبێت یاخود بەدەستی پێغەمبەرێك کوژرابێت وە ئەو کەسەی کە سەر لە خەڵکان دەشێوێنێت بەبێ زانست، یاخود ئەو کەسە کەوێنە دەکێشێت و پەیکەر دەتاشێت).

**هەشتەم: ڕۆژووەوان بەدڵ خۆشی و کامەرانیەوە بەخوای خۆی دەگات.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:: ((... للصائِم فَرحَتان، إِذا أفطَرَ فرِحَ بفطرهِ، و إذا لِقِيَّ اللّٰهُ فَرِحَ بصَومِهِ [فَجزاهُ]))[٢٥٨] واتە: .......بۆ ڕۆژووەوان دوو دڵ خۆشی هەیە:

---

[٢٥٥] أخرجه :أحمد (٢١٣٥٦) وقال محققه: حديث صحيح، و النسائي (٨٦/٥)، و قال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٣٦٣) : إسناده صحيح على شرط مسلم، و في ((صحيح الجامع)) (٨٨٠)، و((صحيح سنن النسائي)) (٢٤١٤) والزيادة لأحمد..

[٢٥٦] أخرجه : أحمد (٢٦٠٩)، و البخاري (٤٠٧٤)، و الطبراني في ((الكبير)) (١١٦٣٥)، و الحاكم (٢٧٥/٤) صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٦٠).

[٢٥٧] أخرجه:أحمد (٣٨٦٨) وقال محققه : اسناده حسن، والبزار (١٦٠٣)، والطبراني (الكبير) (١٠٤٩٧)،وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٠٠٠) .

[٢٥٨] البخاري (١٩٠٤)، مسلم (١١٥١)، الترمذي (٧٦٦) و قال : حسن صحيح و النسائي (١٦٢/٤)، و ابن حبان (٣٤٢٣) و قال محققه : إسناده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٦١٣)، و((صحيح سنن النسائي)) (٢٠٩٣-٢٠٩٥).

ئەگەر ڕۆژووەکەی شکاند دڵ خۆشە بەڕۆژوو شکاندنەکەی، وە ئەگەر گەیشت بەخوا دڵ خۆش دەبێت بەڕۆژووەکەی (کەپاداشتی دەداتەوە).

**نۆیەم: ئەوەی کە بەگەڕوگولی دەگات بەخوا.**

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... لا يقتطع أحدٌ مالاً بيمين إلاَّ لَقِيَّ الله وَهو أجذم)) [٢٥٩] و في رواية: ((وهو معرض عنه))[٢٦٠] واتە: (هەرکەسێك سامانێك زەوت بکات بەسوێندێك (واتە: سوێندی درۆ و ناحەق) بەگەڕوگولی دەگات بە خوای گەورە)، وە لەڕیوایەتێکی تردا: (.....دەگات بە خوای گەورە و لەو ڕۆژەدا، خوای گەورەش ڕووی تێ ناکات).

**دەیەم: ئەوانەی کە دەگەن بە خوای گەورە و پارچە گۆشتێك بەدەم و چاویانەوە نی یە.**

ئیبنو عومەر (ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لا تَزالُ المَسألَةَ بِأحدِكُم حَتى يَلقى اللّه تَعالى وَ لَيس فِي وَجهِهِ مُزعَةُ لَحمٍ))[٢٦١] واتە: (یەکێك لەئێوە بەردەوام دەبێت وەواز ناهێنێت لە سواڵ کردن تا دەگات بە خوای گەورە، پارچە گۆشتێك بەدەم و چاویەوە نامێنێت).

**یازدەهەم: ئەوانەی کە خوای گەورە داوای گێڕانەوەی مافەکانیان بۆ دەکات:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((قَالَ اللّهُ تعالى: ثَلاثةٌ أنَا خَصمُهُم يومَ القِيامَةِ، رَجلٌ أعطى بِي ثم غَدَرَ، وَ رَجُلٌ بَاعَ حُراً فأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَ رَجُلٌ استَأجَرَ أجِيراً فَا ستَوفى مِنهُ وَلَم يُعطِهِ أجرَهُ))[٢٦٢]. واتە: (خوای گەورە فەرموویەتی: سیان هەن لەڕۆژی کۆتاییدا خۆم داوالیٚ کراویانم وداوای ئەو مافانەیان لیٚ دەکەم کە زەوتیان کردووە، پیاوێك سوێند بە من دەخوات بۆ یەکێك کە نایکوژێت یاخود دزی لیٚ ناکات یاخود خراپەی بەرامبەر ناکات یاخود ماف پێشێل ناکات ] پاشان درۆی لەگەڵدا دەکات و ئەوە دەقۆزێتەوە و بە هەلی دەزانێت کە ئەو پیاوەی

---

[٢٥٩] أخرجه : أبوداود (٣٢٤٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٧٨٠) .

[٢٦٠] أخرجه : أبوداود (٣٢٤٥)، وصححه الشيخ الألباني في : ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٧٨١).

[٢٦١] أخرجه : مسلم (١٠٤٠)، و النسائي (٥/٩٤)، و قال الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٧٢٠).

[٢٦٢] أخرجه : احمد (٢/٣٥٨)، و البخاري (٢٢٢٧) و إبن ماجة (٢٤٤٢)، و إبن حبان (٧٣٣٩) و قال محققه : إسناده حسن، و أنظر ((المشكاة)) (٢٠٨٥)، و((الأرواء ))(١٤٨٩).

هەڵ خەڵەتاندووە و خراپەکاریەکەی لەگەڵ ئەنجام داوە، پیاوێك ئازادێك بفرۆشێت و نرخەکەشی بخوات، وپیاوێکی تر کرێکارێك بەکرێ دەگرێت و کارەکەی پێ ئەنجام دەدات و پاشان کرێ کەی ناداتێ ومافەکەی دەخوات).

**دوانزەهەم: ئەوانەی پێشوازیان لێ دەکرێت:**

ضەحاکی کوڕی قەیس (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( اذا اتى الرجل القوم فقالوا له: مرحباً فمرحباً به يوم القيامة يوم يلقى ربه واذا اتى الرجل القوم فقالوا له قحطاً فقحطا له [يوم يلقى بـه] يـوم القيامـة)) [٢٦٣]. واتە: (گەر پیاوێك چووە لای خەڵکی و پێی وترا: پێشوازیت لێ بێت، ئەو کەسە پێشوازی لێ دەکرێت لەو ڕۆژەی کە دەگات بە خوا لە ڕۆژی کۆتاییدا، وە گەر پیاوێك چووە لای خەڵکان و پێی وترا: پێشوازیت لێ نەبێت ئەی وشکی قات و قڕ، ئەو کەسە هەمان قسەی پێ دەوترێت لەو ڕۆژەی کە دەگات بە خوا لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**سیانزەهەم: ئەوانەی گوناهەکانیان دەپۆشرێت.**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( لايستر عبدٌ عبداً في الدنيا الاّ سترهُ الله يوم القيامة)) [٢٦٤] واتە: (هەر کەسێك هەڵە و گوناهی کەسێکی تر بپۆشێت خوای گەورە هەڵە و گوناهەکانی ئەو کەسە دەپۆشێت لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**چواردەهەم: ئەوانەی نارەحەتیەکانی قیامەتیان لەسەر ئاسان دەکرێت:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەت: ((من نفسّ عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفسّ الله عنه كربة من كرب يوم القيامة... ومن يسّر على معسرٍ الله عليه في الدنيا و الآخرة......)) [٢٦٥].واتە: (هەر کەسێك ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی دونیا بەسەر براوادارێکەوە لا ببات خوای گەورەش ناخۆشییەك لە ناخۆشیەکانی قیامەت بەسەر ئەوکەسەوە لادەبات....وە هەر کەسێك کار ئاسانی بکات بۆ قەرزارێکی دەستەنگ خوای گەورە کارئاسانی بۆ ئەو کەسە دەکات لە دونیا و قیامەتدا.

---

(٢٦٣) أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٨١٣٦)، وفي ((الأوسط)) (٢٥١٤) وقال محققه: اسناده حسن، و الحاكم (٣/٥٢٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١١٨٩) و((صحيح الجامع)) (٢٦٦).

(٢٦٤) أخرجه: مسلم (٢٥٩٠).

(٢٦٥) أخرجه: مسلم (٢٦٩٩)، وابوداود (٤٩٤٦).

## ئەوانەی کە دەکەن بە خوای گەورە و خوالێیان ڕازی یە وە ئەوانەی کەدەکەن بە خوای گەورە و خوا لێیان ناڕازی وتوڕەیە

**یەکەم: ئەوانەی وشەیەك دەڵێن و خوا لێیان ڕازی دەبێت وەئەوانەی کەتەنها یەك وشە دەڵێن و خوا لەخۆیان ناڕازی دەکەن:**

بیلالی کوڕی حارث (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((إنَّ أَحَدَكُم لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِن رِّضوانِ اللّهِ تعالى ما تَظُنُ اَن تُبلُغَ مَا بَلغَت فَيَكتُبَ اللّهُ لَهُ بِها رِّضُوانُه إلى يَومِ القيامَةِ، و إنَّ أَحدَكُم لَيَتَكلّمُ بالكَلِمةِ مِنْ سَخَطِ اللهِ تعالى ما تَظنّ أنْ تَبلُغَ ما بَلَغتَ فَيَكتُبَ اللهُ لَه بها سَخطَهُ إلى يوم القيامة))[٢٦٦] واتە: (یەکێك لەئێوە لە ئاخاوتنێکدا وشەیەك دەڵێت کە خوا پێی ڕازی یە، وگومان نابات کە بگات بەو جێگەیەی کە پێی گەیشتووە، خوای گەورە ڕازی بوونی خۆی بۆ ئەو کەسە دەنوسێت تا ڕۆژی کۆتایی، ویەکێك لەئێوە لە ئاخاوتنێکی دا وشەیەك دەڵێت کە خوا پێی ناخۆشە وە گومان نابات کە بگات بەو جێگەیەی کە پێی گەیشتووە، خوای گەورە تووڕە بوونی خۆی بۆ ئەو کەسە دەنوسێت تا ڕۆژی کۆتایی).

**دووەم: ڕازی بوونی باوك:**

عەبدولای کوڕی عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((رِّضى الرَّبِ فِي رِّضى الوالِد، و سَخَطُ الرَّبُ فِي سَخطِ الوالِد))[٢٦٧]واتە: (ڕازی بوونی پەروەردگار لەڕازی بوونی باوکدایە، و ناڕازی بوونی پەروەردگار لەناڕازی بوونی باوکدایە).

---

[٢٦٦] أخرجه: أحمد (٣/٤٩٦)، والحميدي (٩١١)، و مالك (٢/٢٥١)، والترمذي (٢٣١٩) و قال : حسن صحيح، وابن ماجة (٣٩٦٩)، والطبراني في ((الكبير)) (١١٢٩)، والحاكم (١/٤٠) و صححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٢٨٠) وقال محققه : إسناده حسن، وصححه الشيخ الألبانى في ((السلسلة الصحيحة)) (٨٨٨).

[٢٦٧] أخرجه: الترمذي (١٨٩٩)، والبخاري في ((الأدب المفرد)) (٢)، وإبن حبان (٢٠٢٦) والحاكم، (٤/١٥٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٥١٦)، وفي ((صحيح الأدب المفرد)) (٢)، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٥٠٦).

**سێیەم: ڕازی بوونی خوای گەورە بۆ ئەو کەسانەیە کەباوك و دایکیان لێیان ڕازی یە:**

وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((رِّضِا الرَّبُّ فِي رُضا الوَالِدَيْن،و سُخطُهُ في سُخطِهِما))[٢٦٨] واتە: ڕازی بوونی خوا لەڕازی بوونی باوك و دایکدایە، وەتووڕە بوونی خوا لەتووڕە بوونی هەردووکیانە).

**چوارەم: ئەوانەی بەیانی و ئێوارە سێ جار دەڵێن: ڕازین بەخوا کە پەروەردگارمان بێت و بە ئیسلام کە ئاینمان بێت و بە ( محمد ﷺ ) کە پێغەمبەرمان بێت:**

ثوبان (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَن قال إذا أصبحَ و إذا أمسى [ ثلاث مرات]: رَضِينا بِاللّهِ رَباً، و بالإسلامِ ديناً، و بمحَمدٍ نبيّاً، إلاّ كانَ حقاً على اللهِ أَن يُرضيهُ يَومَ القِيامَةِ))[٢٦٩]واتە: (هەرکەسێك بەیانی و ئێوارەی بەسەردا هاتوو وتی: ڕازیم بە (الله) کە پەروەردگارم بێت، و بەئیسلام کە ئایینم بێت، و بە محمد (ﷺ)کە پێغەمبەرم بێت ئەو کەسە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی کە ڕازی بکات لەڕۆژی کۆتاییدا).

**پێنجەم: ڕق خواردنەوە:**

ئیبنو عومەر (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوەکە فەرموویەتی: ((... و مَن كُظَمَ غَيَضاً وَ لَوُ شَاءَ أَن يَمضيَهُ لأَمَضاهُ مَلأَ اللهُ قَلَبَهُ رِضيً يَومَ القِيامَةِ))[٢٧٠] واتە: (......هەرکەسێك ڕقێك بخواتەوە لە بەر خوا ئەگەر بیەوێت بیباتە سەر دەتوانێت بیباتە سەر، خوای گەورە دڵی پڕ دەکات لەڕازی بوون لە ڕۆژی کۆتاییدا).

---

[٢٦٨] أخرجه : الطبراني عن إبن عمرو، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٥٠٧).وهكذا يكون الجزاء من جنس العمل كما ورد في الحديث، عن انس بن مالك (ﷺ) مرفوعا : ((مَن لقيَ أخاهُ المُسلِمَ بما يُحِبُ اللهُ لِيَسُرَّهُ بِذَلِكَ، سَرَّهُ اللهُ عزّوجَل يوم القيامة)). (رواه الطبراني في ((المعجم الصغير)) (١١٧٨)، قال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (١٩٣/٨) اسناده حسن، وضعفه الشيخ الألباني في: ((السلسلة الضعيفة)) (١٢٨٦) وقال : منكر.

[٢٦٩] أخرجه: احمد (٣٣٧/٤) (١٨٩٦٧) وقال محققه: صحيح لغيره، والزيادة له، والنسائي في ((عمل اليوم و الليلة)) برقم (٤)، وابن السني برقم (٦٨)، وأبوداود (٤١٨/٤) أو رقم (٥٠٧٢)، والترمذي (٣٣٨٩) و قال حديث حسن غريب، وإبن ماجة (٣٨٧٠)، والحاكم (٥١٨/١) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الشيخ شعيب الأرنؤوط في تحقيقه لإبن حبان (١٤٥/٣) : سنده حسن في الشواهد، وحسّنه إبن باز في ((تحفة الأخيار)) (ص: ٣٩)، وضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف الجامع)) (٥٧٤٦)، و((السلسلة الضعيفة)) (٥٠٢٠).

[٢٧٠] أخرجه : إبن أبي الدنيا في ((قضاء الحوائج)) (٣٦)، و الطبراني في ((الكبير)) (١٣٦٤٦)، و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٧٦)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٠٦).

**شەشەم: ئەوانەی قەرزەکانیان بەجوانی دەدەنەوە.**

عائیشە (رضي الله عنها) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:(( أولئك خيار عباد الله عند الله يوم القيامة الموفون المطَيبون)) [٢٧١]. واتە: (ئەوانەی قەرزەکانیان بە تەواوی و ڕازی بوونی خۆیان دەدەنەوە ئەو کەسانە چاکترین بەندەکانی خوان لای خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**حەوتەم:: ڕەوانبێژێکی زۆر لە خۆکار و فیز زل:**

عەبدوڵای کوڕی عەمر (ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إِنَّ اللهَ يُبغضُ البَلِيغَ مِنَّ الرِجالِ الذي يَتَخلّلُ بِلِسانِه كَما تَتَخللُ البَقرةُ [بِلسانها][٢٧٢]))[٢٧٣]واتە: (خوای گەورە ئەو ڕەوان بێژانە دەبوغزێنێت کە بەزمانیان کاوێژ دەکەن هەروەکو مانگا بە (زمانی) کاوێژ دەکات)، (مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوکەسانە دەگرێتەوە کە خۆ بەزل زان و ڕەوان بێژن و ناحەق دەڕازێننەوە بەقسەی جوان بۆ ئەوەی خەڵکانی پێ لەخشتەبەرن).

**هەشتەم :داردەستە ستەمکارەکان:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يُوشِكُ إن طَالت بِكَ مُدةٌ اَن تَرى قَوْماً في أَيديهم مِثلُ أَذنابِ البَقرِ يَغدُونَ فِي غَضَبِ اللهِ و يَرُوحُونَ فِيَ سَخَطِ الله)) [٢٧٤]واتە: (نزیکە گەر تەمەنت درێژ بێت کەسانێك ببینیت قامچیان بەدەستەوەیە وەك کلکی مانگا کە بەیانیان دەردەچن خوا لێیان تووڕەیە لەسەر ئەو کارەیان، و کە ئێواران دەگەڕێنەوە بە خەشم و قینی خواوە دەگەڕێنەوە) (واتە: خوا لێیان ناڕازی یە).

---

[٢٧١] أخرجه: أحمد : (٢٦٣١٢) وقال محققه : اسناده حسن.، وعبد حميد (١٤٩٩)، والبزار (١٣١٠)، و الحاكم (٣٢/٢) وصححه، والبيهقي (الكبرى) (٢٠/٦)، و قال الهيثمي في (مجمع الزوائد) (٣٩/٤) واسناده أحمد صحيح.

[٢٧٢] في رواية.

[٢٧٣] أخرجه : إبن أبي الدنيا في ((قضاء الحوائج)) (٣٦)، و الطبراني في ((الكبير)) (١٣٦٤٦)، و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٧٦)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٩٠٦).

[٢٧٤] أخرجه : مسلم (٩/ ١٧) (ص: ١٩٠)، والنووي ((شرح مسلم)) رقم (٧١٢٤).

# خراپترین خەڵکان لای خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا

**یەکەم: ئەوانەی نهێنی ژن و مێردایەتی لای کەسانی تر دەدرکێنن.**

وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّ مِن أشَرِّ النّاسِ عِندَ اللهِ يَومَ القيامَةِ: الرَّجلُ يُفضي إلى إمرَأتِهِ و تُفضي إليْهِ ثُمَّ يَنشُرُ سِرَّها))[٢٧٥]. واتە: (یەکێك لە خراپترینی خەڵکان لای خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا: پیاوێکە دەچێتە لای خێزانەکەی و لەگەڵ یەکدا دەبن پاشان نهێنی یەکەی بڵاودەکاتەوە).

**دووەم: ئەوانەی مزگەوت بەسەر گۆڕی پیاو چاکەوە دروست دەکەن:**

عائشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت [ئوم سەلەمە وئوم حەبیبە باسی کەنیسەیەکیان دەگێڕایەوە کە بینیبوویان لە وڵاتی حەبەشە پێی دەوترا (ماریە) و باسی جوانی و وێنەکانی ناویان دەگێڕایەوە ...... پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((إنَّ أولئِكَ إذا ماتَ فِيهم الرَجُلُ الصالِحُ بَنوا عَلى قَبرِهِ مَسجِداً، ثُمَ صَوَّرُوا فيْهِ تُلكَ الصُوَرِ أولئِكَ شِرارُ الخلقِ عِندَ اللهِ [يَومَ القيامةِ]))[٢٧٦] واتە: (ئەوانە کەسانێکن گەر پیاو چاکێك لەناویاندا بمردایە مزگەوتێکیان بەسەر گۆڕەکەیەوە دروست دەکرد پاشان ئەو وێنانەیان تیا دەکێشا ئەوانە خراپترین خەڵکانن لای خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا).

**سێهەم :دوو ڕوو.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:((مِن شَرِّ النّاسِ عند اللهِ يَومَ القيامةِ ذا الوَجهين))[٢٧٧] واتە:( خراپترینی خەڵکان لای خوا لەڕۆژی کۆتاییدا دوو ڕووەکانن).

---

[٢٧٥] أخرجه : مسلم (٣٥٢٧).

[٢٧٦] اخرجه : البخاري (١٣٤١)، ومسلم (٥٢٨)، والنسائي (٤١/٢)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٢٠١٠).

[٢٧٧] اخرجه : الترمذي (٢٠٢٥) وقال : حسن صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٦٤٨)، وفي ((صحيح الجامع)) (٢٩١٦).

**چوارەم: خراپەکار.**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّ شَرّ النَّاسِ منزلةً عِندَ الله يَومَ القيامةِ مَن تركَهُ الناسُ اتقاءَ فُحشِهِ وفي رواية [...إنما يُكرمون اتقاء شَرّهم]))[٢٧٨] واتە: (خراپترین کەسان لە ڕۆژی کۆتایی لای خوای گەورە ئەوانەن کە خەڵکان بەجێیان هێشتوون و خۆیان لێ بە دوور گرتوون بۆ خۆپاراستن لە خراپەکانیان) یاخود ڕێزمان لێ گرتوون تا پارێزراوین لە خراپەیان.**

**پێنجەم: نیعمەت گوزاران کە بێ دڵی خۆیان ناکەن.**

**فاتیمەی زەهرا (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((شِرارُ أُمَتِي الَّذينَ غَذُّوا بالنَّعيم الَّذينَ يأكلونَ ألوان الطَعام، وَيَلبسُونَ الوانَ الثِياب، وَيَتَشدَقونَ في الكَلامِ))[٢٧٩]، ((... فَأولئِكَ شِرارُ اَمَتي))[٢٨٠] واتە:((خراپترین کەسانی ئومەتەکەم نیعمەت گوزارانن کە هەمە جۆرە خۆراك دەخۆن و هەمە جۆرە پۆشاك لەبەر دەکەن و لەگەڵ خەڵك بەخۆبەزلزانینەوە دەدوێن و گاڵتە یان پێ دەکەن)) (ئەوانە خراپترین کەسانی ئومەتەکەی منن) .**

**شەشەم: ئەوانەی کەچەنە بازو فیز زلن.**

**ئەبو هورەیرە (ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((شِرارُ أُمَتي الثَرثارُونَ والمُتِشَدقِونَ وَالمُتَفَيهقون))[٢٨١] واتە: (خراپترینی ئومەتی من: زۆر بلێ و چەنەبازەکانن، و ئەوانەی کە دەمیان پڕدەکەن لە فوو بۆ ئەوەی قسەکانیان زل و ڕەوانبێژو ڕازاوەتر بێت لە دەر بڕیندا، وە خۆبەزل زانەکان).**

---

[٢٧٨] اخرجه : الحميدي (٢٤٩)، والبخاري (٦٠٥٤)، ومسلم (٢٥٩١)، واحمد (٣٨/٦)، (٢٤٧٩٨) وقال محققه: حديث صحيح والزياده له وابوداود (٤٧٩١)، والترمذي (١٩٩٦)، والبيهقي (٢٤٥/١٠).

[٢٧٩] اخرجه : الامام احمد في ((الزهد)) (ص: ٩٩)، والطبراني في ((الكبير)) (٧٥١٢، ٧٥١٣)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (٣٧٠٥)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٥١٤/٤) .

[٢٨٠] في رواية الطبراني (٧٥١٢).

[٢٨١] أخرجه : البخاري في ((الادب المفرد)) (١٣٠٨)، والطبراني في ((الكبير)) (٧٥١٣)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الادب المفرد)) (٩٨٢)، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٧٠٤).

**حەوتەم: ئەوانەی کە داوا دەکەن لەبەر خوا تا یارمەتیان بدرێت بەلاَم هیچیان پێ نادرێت.**

ئیبنو عەباس (ﷺ) لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((... ألا أخبِرُكُم بِشِرِّ النَّاسِ مَنزِلَةً ؟ قُلنا: نَعم يارَسول الله، قالَ: الَّذي يَسألُ بالله العَظيم، ولايُعطي بِهِ))[٢٨٢] واتە: (ئایا پێتان ڕابگەیەنم خراپترینی خەڵکان لەپلەدا کێن ؟ئێمە هەموو وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟ ئەویش فەرمووی: (کەسێك داوا دەکات و دەڵێت لەبەر خوا یارمەتیەکم بدەن ئەمە یەکەمیانە، وەدووەمیان ئەو کەسەیە کە ئەمەی بەرامبەر وترا هیچ نەبەخشێت).

**هەشتەم :ئەوانەی خەڵکی گومڕادەکەن.**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿........أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا مِّن........﴾ (هود: ١٨ -١٩). حەسەنی بەصری (رحمه الله) دەفەرموێت: " شرار عباد الله الذين ينتقون شرار المسائل يعمون بها عباد الله"[٢٨٣] واتە: (خراپترین بەندەکانی خوا ئەوانەن کە خراپترین ڕێچکە وباسەکان هەڵدەبژێرن تا بەندەکانی خوای پێ گومڕاو کوێر بکەن).

**نۆیەم: ئەوانەی خەڵکانیان توشی ئازار و مەینەتی و بەندیخانە کردبێت:**

کەعبی کوڕی مالیك (ﷺ) دەفەرموێت: ((ان اعظم الناس عند الله خطيئة يوم القيامة المثلث، قالوا له: و ما المثلث ؟ قال الذي يسعى باخيه الى امامه فيهلك نفسه ويهلك اخاه و يهلك امامه))[٢٨٤] واتە: (گەورەترین تاوانبار لەناو خەڵکاندا لای خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا، ئەوانەن کەسێ لایان توشی لە ناو چوون کردووە ! پرسیاریان لێ کرد و وتیان: ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانەن کە برایانی خۆیان بەگرت دەدەن لای پێشەواکانیان، بەم کارەش خۆیان تووشی لە ناو چوون دەکەن وە برایانی خۆشیان توشی لە ناوچوون دەکەن وە پێشەواکانیشان تووشی لە ناوچوون دەکەن).

---

[٢٨٢] اخرجه : النسائي (١/٣٥٨)، والدارمي (٢/٢٠١)، وابن حبان (١٥٩٣)، واحمد (١/٢٣٧)، وصححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٢٥)، وفي ((المشكاة)) (١٩٤١)، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٧٠٨).

[٢٨٣] أخرجه: الخطيب البغداي (صحيح الفقية والمتفقة) (٣٨٧) وقال محققه : اسناده حسن، وراه الاجري ((أخلاق العلماء)) (ص: ١١٠) وقال محققه : اسناده صحيح.

[٢٨٤] أخرجه: هناد (١٢١٨) وقال محققه : اسناده صحيح.

# لێ پێچینەوە

لەو ڕۆژەدا خەڵکی هەموو بەڕیز وەستاون لەبەردەم خوای خۆیان وەك چۆن یەکەم جار دروستی کردوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَعُرِضُوا عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴾ (الكهف: ٤٨) . ئالەوێدا هەموو ئومەتەکان بەسەر چۆکدا کەوتوون لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾(الجاثية: ٢٨).

کاتێك قیامەت هاتە پێش کردەوەکانیان پێنیشان دەدرێت و دەخرێتە پێش چاویان و بەراورد دەکرێت لەگەڵ (اللوح المحفوظ)دا و پێیان دەڵێن ﴿ هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ (الجاثية: ٢٩) . ئیبنو عەباس (رضي الله عنه) سەبارەت بە ڕوون کردنەوەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: ((.... لما خلق الله الخلق وكّلَ بالخلق حفظةً يحفظون عليهم أعمالهم، فلما قامت القيامة عُرِضَتْ عَليهِم أعمالهم وقيلَ: (هذا كتابنا ينطق عليكم بالحق انا كنا نستنسخ ماكنتم تعملون) عُرِضَ بِالكِتابَينِ فَكانوا سَواء (قال ابن عباس): أَلَستُم عرباً هل تكونُ النسخة الامن كتاب))[1] واتە:(......کاتێك کە خوای گەورە دروست کراوانی خۆی دروست کرد چەند مەلائیکەتێکی پارێزگاری بۆ تەرخان کردن کە کردەوەکانیان بژمێرن و بیپارێزن (واتە: ئەو مەلائیکانەی کەچاکە و خراپەی مرۆڤ دەنووسن)، لە قیامەتدا هەردوو نوسراوەکە بەراورد دەکرێت وەك یەك دەردەچن (واتە: نوسراوی نامەی کردەوەکان لەگەڵ (لوح المحفوظ)دا پاشان ئیبنو عەباس (رضي الله عنه) فەرمووی: ئایا ئێوە عەرەب نین نازانن کە لەبەرگرتنەوە (استنساخ) هەر لەبەر کتێبێك دەبێت. ڕۆژی قیامەت ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکان پشت گوێیان خستووە و لێی بێ ئاگابوون وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴾ (الأنبياء: ١) ئەو

[1] أخرجه: الحاكم (٤٥٤/٢) وقال: هذا حديث صحيح الاسناد ولم يخرجاه ووافقه الذهبي، وقد ورد نحوه مرفوعاً، أخرجه: ابن أبي عاصم ((السنة)) (١٠٦) وقال محققه الشيخ الالباني: اسناده حسن، و أخرجه الدينوري في: ((المجالسة)) (٨٣/٤) و قال محققه: سنده صحيح، و الفريابي ((القدر)) (ص:٣٤) وقال محققه: سنده حسن، والاجري ((الشريعة ))(٣٧٧) وقال محققه: صحيح.

ڕۆژە لێ پێچینەوە تیایدا بەشێوەیەك خێرا دەبێت کەمرۆڤ دەرکی پێناکات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾ ( النور: ٣٩)، ئالەو ڕۆژە مەزنەدا ئادەمیزادە ستەمکارەکان پاساو و عوزر هێنانەوەیان سوودیان پێناگەیەنێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾ (الروم: ٥٧ ) بەتایبەت ئەو کەسانەی کە تەمەنیان گەیشتووەتە سەروو شەست ساڵ ئەوانە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نابێت کە پاساوی کارە خراپەکانیانی پێ بکەن .وەك ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ عمَّرَه الله ستينَ سنةً فقد أعذرَ اللهُ إليه في العُمر))[٢]. واتە: (هەرکەسێك خوای گەورە تەمەنی بگەیەنێتە شەست ساڵ ئەو کەسە خوای گەورە هیچ پاساو وعوزرێکی بۆ نەهێشتوەتەوە لەتەمەندا).

لەو ڕۆژە ترسناکەدا هیچ نەفسێك ناتوانێت هیچ بکات بۆ یەکێکی تر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ (البقرة: ٤٨) هەر لەو ڕۆژەش دا ئادەمیزادان فێڵ و شاردنەوەیان بۆ ناکرێت و بۆشیان ناچێتە سەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ لَا يُغْنِى عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ (الطور: ٤٦).

لەو ڕۆژەدا خزمایەتی و کەسایەتی هیچ سودێك ناگەیەنێت بەکەس و لەیەکتر جیا دەکرێنەوە و دادەبڕێن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ ۚ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾(الممتحنة: ٣)، هەر لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەر(ﷺ) بەڕاشکاوانە ئاشکرای کرد بۆ خزمانی وئاگاداری کردن کە هیچی بۆ ناکرێت لای خوای گەورە بۆیان و بڕیاری خوای پێ ناگۆڕێت، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((یامَعشَرَ قُرَيش [انقذُوا انفسَكُم مِن النّارِ][٣]

---

[٢] اخرجه: البخاري (٦٤١٩)، وابن حبان (٢٩٧٩) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما .

[٣] اخرجه: الترمذي (٣١٨٥)، وابن حبان (٦٤٦) وقال محققه: إسناده صحيح .

لاأُغني عَنكُم من الله شيئاً، يا بَني عَبد المطلِب [انقذُوا أنفسَكُم مِن النّارِ][٤] لاأُغني عَنكُم مِنَ اللهِ شَيئاً، يا عَباسُ بن عبدالمطلِب، لاأُغني عنكَ مِنَ الله شَيئاً، ياصَفِيَة عمة رَسول الله لاأُغني عَنكِ مِنَ الله شَيئاً، يا فاطِمَةَ بِنتَ مُحمدٍ [انقذي نَفسَكِ مِن النّارِ][٥] سَلِيني ما شِئتِ من مَالي لاأُغني عَنكِ مِن اللهِ شَيئاً))[٦] واتە: ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش (خۆتان ڕزگار کەن لەئاگر )، هیچم پێناکرێت بۆتان لای خوا (واتە: بڕیاری خوام پێ ناگۆڕدرێت)، ئەی کوڕانی عبدالمطلب (خۆتان ڕزگار کەن لەئاگر)، هیچم پێناکرێت بۆتان لای خوا، ئەی عەباسی کوڕی عبدالمطلب هیچم پێناکرێت بۆت لای خوا، ئەی صەفیەی پوری پێغەمبەری خوا هیچم پێناکرێت بۆت لای خوا، ئەی فاطمەی کچی پێغەمبەر(خۆت ڕزگار کە لەئاگر )، چیت دەوێت لەماڵم داوام لێ بکە هیچم پێ ناکرێت بۆت لای خوا .

# ئەوانەی لێ پێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێت

پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە چینێکی تایبەت هەیە لە ئومەتەکەیدا لێ پرسینەوەیان لەسەر نی یە لە ڕۆژی کۆتاییدا و ژمارەشیان حەفتا هەزار کەسە، وەك لە فەرموودەکەی عمرانی کوڕی حەصین و سەهلی کوڕی سەعەد دا هاتووە دەگێڕێنەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أوَّل زُمرَةٍ تَدخلُ الجَنَّة مِن أُمَتي سَبعُونَ الفاً بِغيرِ حِسابٍ وَلا عذابٍ ... قِيل: وَمَن هُم ؟ قال: هُم الذين لايَكتَوُونَ، ولاَ يَستَرقُون، ولاَ يَتَطيرون وَعَلى رَبهِم يَتَوَكَلُون))[٧]. واتە: (یەکەم کۆمەڵ لە ئوممەتەکەم دەچنە ناو بەهەشتەوە حەفتا هەزار کەسن بەبێ لێ پێچینەوە وبەبێ سزا...وترا: ئەوانە کێن ؟ فەرمووی: ئەوانەن کە داخیان بەکار نەهێناوە و، داوا ناکەن کە دوعایان بەسەردا بخوێندرێت و هیچ شتێك بەشووم نازانن و پشتیان بەخوای خۆیان بەستووە)، وە لەوانەشە بەتایبەتی کۆچ کارە هەژارەکان بن کە جیهاد یان کردووە و لە پێناوی خوادا وەك لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر (ﷺ) کە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە

---

[٤] في رواية .

[٥] في رواية .

[٦] اخرجه: البخاري (٢٧٥٣)، ومسلم (٢٠٦)، والنسائي (٢٤٨/٦)، والبيهقي (٢٨٠/٦) .

[٧] اخرجه: البخاري (٣٣٢٧)، ومسلم (٣٧١، ٢٨٣٤) .

(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أَوَّلُ زُمرَةٍ تَدخُلُ الجَنَّةَ مِن أُمَتي ... الُمهاجِرون يأتُونَ يَومَ القيامَةِ الى بابِ الجَنَّةِ وَيَستَفتِحُوُن، فَيَقُولُ لَهُم الخَزَنَةُ: أَوَقَد حوسِبتُم؟ فَيقَوُلَونَ: بِأيِّ شَيءٍ نُحاسَبُ، وإنَّما كانت أَسيافُناَ عَلى عَواتِقِنا في سَبيلِ اللهِ حتّى مِتنا على ذلِك، قالَ فَيُفتَحُ لَهُم فيقيلونَ فيه أربَعينَ عاماً قَبلَ اَن يدخُلها النّاسُ))[8] واتە: (یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشت لە ئومەتەکەمدا...... کۆچ کەرەکانن لەڕۆژی کۆتاییدا بۆلای دەرگای بەهەشت دێن و داوای چونە ژوورەوە دەکەن و دەرگاوانی بەهەشتیش پێیان دەڵێن: ئایا لێ پێچینەوەتان تەواو بوو ؟ ئەوانیش دەڵێن: لەسەر چ شتێك لێ پێچینەوەمان لەگەڵدا بکرێت، ئێمە شمشێرەکانمان بەسەر شانمانەوە بوو لەپێناوی خوادا تێدەکۆشاین و دەجەنگاین هەتا مردین، دەفەرموێت: ئەوانە دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکرێتەوە دەچنە ژوورەوە چل ساڵ دەحەسێنەوە تیایدا پێش ئەوەی خەڵکان بچنە ناوییەوە).

هەروەها ئەوانەی ئارامیان گرتووە لەسەر هەژاری و نەخۆشی و ترس لەپێناوی خوادا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾ (الزمر: ١٠)، وە لەوانەش کە لێ پێچینەوەیان لەگەڵدا ناکرێت ئەو کەسانەن کە خوای گەورە بۆیان پێدەکەنێت لەجێگەیەکدا، وەك لە فەرموودەکەی نوعەیمدا (ﷺ) هاتووە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((فإذا ضَحِكَ رَبُّكَ الى عبدٍ في مَوُطنٍ فلاَ حِسابَ عليهِ))[9] واتە: (ئەگەر خوای گەورە پێبکەنێت بۆ بەندەیەك لەجێگەیەکدا لێ پێچینەوەی لەگەڵدا ناکرێت).

---

[8] اخرجه: الحاكم (٧٠/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الالباني على شرط مسلم في ((السلسلة الصحيحة)) (٨٥٣).

[9] اخرجه: احمد (٢٨٧/٥)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح الجامع)) (١١٠٧).

## یەکەم ئومەت کە لێ پێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لەرۆژی کۆتاییدا

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویێت: ((نَحنُ آخرُ الأُمَم [مِن اَهل الدُنيا] [١٠] وَ اَوَّلُ مَن يُحاسَبُ [يومَ القيامَةِ المَقضيّ لَهُم قَبلَ الخَلائِقِ] [١١] يُقال: أينَ الأمَة الامِّيةَ وَنَبيُّها))[١٢] واتە: (ئێمە کۆتاهەمین ئومەتین (لە ناو کەسانی دونیادا)، ویەکەمینین کە لێ پێچنەوەمان لەگەڵدا دەکرێت (لەرۆژی کۆتاییدا وە لێ پێچینەوەمان تەواو دەبێت پێش هەموو دروست کراوان) دەوترێت:کوا ئەو ئومەتەی کەخۆیان وپێغەمبەرەکەیان نەخوێندەوار بوون ؟)

## جۆرەکانی لێ پێچینەوە

ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((تُحشَرُ هذهِ الأُمَة عَلى ثلاثَةِ اَصنافٍ: صِنفٌ يَدخُلُونَ الجَنَّة بِغيرِ حِساب، وصِنفٌ يُحاسَبُونَ حَساباً يَسيراً، ثُمَ يَدخُلُونَ الجَنَّة، وصِنفُ يَجيئونَ على جُنُوبِهم أمثالَ الجِبالِ الرّاسِياتِ ذُنُوباً، فَيَسألُ اللهُ عَنهُم، وَهُوَ أعلَمُ بِهِم فَيَقوُلُونَ: هؤلاءِ عَبيدٌ مِن عِبادِكَ، فَيقولُ: حَطّوها عَنهُم واجعَلوها على اليَهودِ والنّصارى وأدخِلوهُم الجَنَّةَ بِرَحمَتي))[١٣] واتە: ئەم ئومەتە کۆدەبنەوە وبەسێ کۆمەڵ جیادەکرێنەوە: کۆمەڵێك دەچنە بەهەشت بەبێ لێ پێچینەوە، وەکۆمەڵێك لێ پێچینەوەیەکی ئاسان وسوکیان لەگەڵدا دەکرێت پاشان دەچنە

---

[١٠] في رواية النسائي (٣/٨٣) .

[١١] اخرجه: النسائي (١٣٦٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح النسائي)) (١٢٩٥)، و((صحيح الجامع)) (٦٧٥٠)، وعن القاسم بن ابي بزة (رحمه الله) قال: (إن أول خلق الله عز و جل يحاسب يوم القيامة الدواب و الهوام حتى يقضي بينهما حتى لا يذهب شيء بضلامه، ثم يجعلها ترابا، ثم يبعث الثقلين الجن و الإنس فيحاسبهم فذلك يومئذ يتمنى الكافر (يا ليتني كنت ترابا).) أخرجه: ابن ابي الدنيا في: ((الأهوال)) رقم (٢٢٤) و صحح إسناده محقق كتاب ((المجالسه)) للدينوري برقم (٣١٠٣) .

[١٢] اخرجه: ابن ماجة (٤٢٩٠)، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٦٢)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٧٤) والامة الامّية هي امة محمد (ﷺ)، عن ابن عمر (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((إنّا أمّةٌ أمّيَةٌ لانكتُبُ، ولا نحتسبُ)) أخرجه: مسلم (٢٥٠٨)، و أنظر: ((صحيح الجامع)) (٢٢٨٢) .

[١٣] اخرجه: الحاكم (١/٥٨) و صححهُ على شرطهما ووافقة الذهبي .

بەهەشت، وکۆمەڵێك دێن لەلایانەوە نموونەی چیا بەرزەکان تاوانیان هەیە، خوای گەورە لێ پێچینەوەیان لەبارەوە دەکات و خۆی زاناترە بەسەریاندا دەڵێن: ئەوانە چەند بەندەیەکن لەبەندەکانت،خوای گەورە دەفەرموێت:دایان گرن لەسەریان و بیانخەنە سەر جوولەکە و گاورەکان وبیانخەنە ناو بەهەشتەوە بەمیهرەبانی خۆم .لە ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەدا عەوفی کوڕی عوتبەی کوڕی عەبدولای کوڕی مەسعود (ﷺ) فەرموویەتی: ((بالعفو تنجون وبالرحمة تدخلون الجنة و بالاعمال تقتسمون المنازل))[١٤] واتە: (بەلێبوردنی خوا ڕزگارتان دەبێت (واتە:لە دۆزەخ) و بەبەزەیی خوا دەچنە بەهەشت، و بەکردەوەکانتان پلەکانی بەهەشتتان دەست دەکەوێت).

## لێ پێچینەوەی (ئاسان)

لێ پێچینەوەی ئاسان ئەوەیە کە عائشە دایکی بڕواداران (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) لەدوعاکانیدا فەرموویەتی: ((اللّٰهُمَّ حاسِبني حِساباً يَسيراً، قالت: قلت: يارسول اله ما الحِسابُ اليَسيرُ ؟ قالَ: أن يُنظرَ في سَيئاتِهِ وَيَتجاوز لَهُ عَنها، إنَّهُ مَن نُوقِشَ الحِسَابَ يَومَئِذٍ هَلك [... في رواية مَن حُوسِبَ عُذِّب][١٥]))[١٦]. واتە: (خوایە لێ پێچینەوەم لەگەڵدا بکە بەلێ پێچینەوەیەکی ئاسان وتم(واتە:عائشە) ئەی پێغەمبەری خوا لێ پێچینەوەی ئاسان چی یە ؟ فەرمووی: ئەوەیە کە تەماشای خراپەکانی بکرێت و چاوی لێ بپۆشرێت،چونکە هەرکەسێ گفتو گۆی لێ پێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت (واتە: لەکارەکانی بکۆڵرێتەوە) لەو ڕۆژەدا لەناو دەچێت ( لە ڕیوایەتێکدا:....هەرکەسێ حیسابی لەگەڵدا بکرێت سزا دەدرێت )) .

عەبدولای کوڕی عەباس (ﷺ) دەفەرموێت: ((من قرأ القرآن واتبع مافيه هداه الله من الضلاله و وقاه يوم القيامة سوء الحساب، و ذلك بان الله تعالى يقول ﴿.....فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا

---

[١٤] أخرجه: الاصبهاني ((سير السلف)) (٣/٨٦١)، وابو نعيم ((الحلية)) (٤/٢٤٦).

[١٥] أخرجه: البخاري (٤٩٣٩)، ومسلم (٢٨٧٦) .

[١٦] اخرجه: احمد (٦/٤٨)، والترمذي (٢٤٢٦) وقال: حديث حسن صحيح، وابن حبان (٧٣٧٢) وقال محققه: إسناده حسن، والحاكم (١/٢٥٥) وصححه ووافقه الذهبي، وقال الحافظ ابن كثير في ((تفسير القرآن العظيم)) (٤/٤٨٩): صحيح، وصححه الشيخ الالباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٧٧)، وفي ((المشكاة)) (٥٥٦٢).

يَضِـلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴾ (طه: ١٢٣)))[١٧] واتە: هەر کەسێك قورئان بخوێنێت و ئەوەی تیایدا داواکراوە جێبەجێی بکات خوای گەورە (واتە: لە دونیاد) دووری دەخاتەوە لە گومڕایی، و هیدایەتی دەدات و ڕێنموی دەکات، وە لە ڕۆژی کۆتاییدا:لە لێ پێچینەوەی گران و ناخۆش ڕزگاری دەبێت).

هەروەها حەسەنی بەصری (رحمه الله) دەفەرموێت: ((ان المؤمن قوام على نفسه يحاسب نفسه لله عزوجل، وانما خف الحساب يوم القيامة على قوم حاسبوا انفسهم في الدنيا، وانما شق الحساب يوم القيامة على قوم اخذ وا هذا الأمر من غير محاسبة))[١٨] .واتە: (بڕوادار ئاگای لە خۆیەتی و بەردەوام لە خۆی دەپێچێتەوە لە پێناوی خوادا، و لێ پێچینەوەش لەسەر ئەو کەسانە ئاسان دەبێت لە ڕۆژی کۆتاییدا کە لەدونیادا لێ پێچینەوەیان لەگەڵ نەفسی خۆیاندا کردووە، وە لێ پێچینەوەی ڕۆژی کۆتایی گران دەبێت لەسەر ئەو کەسانەی کە لە دونیادا لێ پێچینەوەیان لەگەڵ نەفسی خۆیاندا نەکردووە.

## ئەو بنچینانەی لێ پێچنەوەی بەندەکانی لەسەر ئەنجام دەدرێت

هەندێك لەو بنچینانەی کە خوای گەورە لێ پێچنەوەی بەندەکانی لەسەر ئەنجام دەدات:

**یەکەم: دادگەری تەواو (العدل التام):**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ (النساء: ٤٠ ) واتە: ﴿ بەڕاستی خوا بەقەدەر تۆزقاڵێك ستەم لە مرۆڤ ناکات، خۆ ئەگەر چاکەیەك هەبێت ئەوا چەند بەرامبەری دەکات و لەلایەن خۆیەوە پاداشتی گەورە و بێ سنووری پێ دەبەخشێت﴾. وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ......وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾ (النساء: ٧٧ ) واتە: ﴿بەقەدەر تاڵی ناوکە خورمایەك ستەمتان لێ ناکرێت﴾ وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت:

---

[١٧] أخرجه عبد الرزاق (٣٨٢/٣)، والخطيب البغدادي ((صحيح الفقية والمتفقة)) (٧٢) وقال محققه: اسناده صحيح .

[١٨] أخرجه: ابو نعيم ((حلية)) (١٣١/٢)، وابن الجوزي ((وصفة الصفوة)) (٢٣٣/٣) .

﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴾ (الزلزلة: ٧ – ٨) واتە: ﴿لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بەئەندازەی مثقالە زەڕەیەك چاکەو خراپەی کاری بەندەکانی لێ ون نابێت و لێ پێچینەوەیان لەگەڵ دەکات و پاداشت و سزاشیان لەسەر دەداتەوە وئەوەش ئەوپەڕی دادگەری تەواوە﴾ .

**دووەم: کەس تاوانی کەس هەڵناگرێت:**

هەموو کەسێك تەنها بەرپرسیارە لەو کارانەی کە خۆی ئەنجامی داوە کەس تاوانی کەس هەڵناگرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ .......وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ....... ﴾ (الأنعام: ١٦٤) .

**سێیەم: ئەوانەی خەڵکانیان گومڕا کردووە و کاری خراپیان پێ نیشان داون بەئەندازەی گوناهی ئەوان گوناهیان بۆ دەنوسرێت و لێ ی بەرپرسیارن:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ۖ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ (العنكبوت: ١٣) واتە: ﴿سوێند بە خوا سەر ئەنجام قورسایی گوناهی خۆیان و ئەو کەسانەش کە گومڕایان کردوون دێتە سەرقورسایی گوناهەکانیان، لە ڕۆژی قیامەتیشدا پرسیاریان لێدەکرێت لەو درۆو دەلەسە و تەڵەکەبازییەی کە هەڵیاندەبەست﴾ .

**چوارەم: ئاگادارکردنەوەی خەڵکان لەکردەوەکانیان:**

خەڵکان لەو ڕۆژەدا خوای گەورە کردەوەکانیان لا ئاشکرا دەکات و کارە خراپەکانیان پێڕاگەدەیەنێت کە ئەنجامیان داوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ .......إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ (المائدة: ٤٨ ).

**پێنجەم: هیچ کارێکی بەندە وەرناگیرێت تەنها ئەو کارانەی نەبێت کە لەپێناوی خوادا ئەنجامی داوە:**

مەحمودی کوڕی لوبەید (رضي الله عنه)بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((... يَقول الله عَزَوَجَل لاصحاب ذلك (أي: الشرك الاصغر الرِّيَاء) يَومَ القِيامَة إذا جازى الناس: إذهبوا الى الَّذين كنتم تُراوُنَ في الدُنيا، فانظروا هَل تَجِدون عِندَهم

جَزاء))[١٩] واتە: (....خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا کاتێك پاداشتی خەڵکان دەداتەوە بەخاوەنی ئەو کارانە (واتە: ئەوکارانەی کە بۆ خوا ئەنجام نەدراوە) دەفەرموێت: بڕۆن بۆلای ئەوانەی کە ئێوە ڕیابازیتان بۆ کردوون لەدونیادا ببینن ئایا پاداشتتان لایان دەست دەکەوێت ؟ ) .

**شەشەم: زیاد کردنی چاکەکان:**

خوای گەورە لەو ڕۆژەدا کارەکان گەشە پێدەدات و زیادیان دەکات تا دەیانگەیەنێتە یەك بەحەوسەد ولەوەیش زیاتر وەك دەفەرموێت: ﴿ ......... فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ ......... ﴾( البقرة: ٢٤٥) واتە:﴿ کارەکانیان بۆ زیاد دەکات وگەشەی پێدەدات بەگەشەکردنێکی زۆر﴾، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ (البقرة: ٢٦١) واتە: ﴿نمونەی ئەوانەی کە ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن لە ڕێگەی خوادا وەك نمونەی دەنکە تۆوێك وایە کە بڕوێت و حەوت گوڵی گرتبێت، وە هەر گوڵێك سەد دەنکە تۆوی تێدا بێت خوای گەورەش بۆ هەر کەسێك بیەوێت پاداشتی چەند بەرامبەری دەداتەوە و ئەوخوایە فراوانگیر و زانایە﴾. کەوا بوو خەڵکان هەموو لێ پێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت جگە لەوانەی کە باس کراون لە پێشەوە.

## یەکەم شتێك کە ئادەمیزاد حیسابی لەسەر دەکرێت لەڕۆژی کۆتاییدا

ئەبو هورەیرە (ﷺ)دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:(( إنَّ أوَّلَ ما يُحاسَبُ بِهِ العَبدُ يوم القِيامَةِ مِن عَمَلِهِ صَلاتُه، فإنْ صَلُحَت [صَلَحَ سَائِرُ عَمِلِهِ] (في رواية) فَقد أفلَحَ و أنجَحَ، و إنْ فَسَدَت [فَسَدَ سَائِرُ عَمَلِهِ] (وفي رواية) فَقَد خَابَ وَ خَسِر، فَإن انتَقَصَ

---

[١٩] اخرجه: احمد (٥/٤٢٨) وقال الهيثمي في: مجمع الزوائد (١٠٢/١): رواه احمد ورجاله رجال الصحيح، وقال الشيخ الالباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٥١): إسناده جيّد . وانظرالموضوع بتوسع في ((القيامة الكبرى)) للاشقر (ص: ٢٠٣)

مِن فَرِيضتِهِ شَيءٌ، قال الرَّبُ تَبارَكَ و تعالى: أنظُروا هَل لِعَبدي مِن تَطَوُّع، فَيُكمَلُ بها مَا إنتَقَصَ مِن الفَرِيضَةِ ثُمَّ يَكوُنُ سَائِرُ عَمَلِهِ على ذلِكَ، ثُمَّ الزَّكاةُ مِثلَ ذلكَ، ثُمَ تُؤخَذُ الأَعمالُ على حَسَبِ ذلِك))[٢٠] وفي رواية: ((الصلاةُ ثلاثة أثلاثٍ: الطَهورُ ثلثٌ، و الرّكوعُ ثُلثٌ، و السجوُد ثلثٌ، فمن أدّاها بحقّها قُبِلَت مِنهَ و قُبِلَ مِنهَ سائِرُ عملهِ و من رُدّت عليه صَلاتُه رُدَّ عليه سائر عَمَلِهِ))[٢١]. واتە: (یەکەم شتێك کە لێ پێچینەوەی بەندەکانی لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا لەکارەکانیدا نوێژەکەیەتی، ئەگەر چاك بێت (کارەکانی تریشی بۆ چاك دەکرێت) وسەر فراز و سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر خراپ بێت (کارەکانی تریشی بۆ خراپ دەکرێت) وسەرشۆڕ و ڕیسواش دەکرێت، ئەگەر هەندێك لەنوێژە فەرزەکانی کەم و کوڕی تێدا کردبێت، پەروەردگار دەفەرموێت: بڕوانن ئایا ئەم بەندەیەم نوێژی سوننەتی کردووە؟ (واتە: سوننەتی ڕەواتبی نوێژەکان) گەر کردبێتی کەم و کوڕی نوێژە فەرزەکانی پێ تەواو دەکرێت، ئینجا زەکاتیش هەر بەو شێوەیە، ئینجا سەرجەم کارەکانی تر هەر بەوشێوەیە وەردەگیرێن. کەواتە ئەوانە ناگرێتەوە کە نوێژیان هەر نەکردووە بەڵکو مەبەست لەم فەرموودەیە ئەو موسوڵمانە نوێژ خوێنانەیە کە بەپەلە وکەم و کوڕی نوێژەکانیان ئەنجام داوە وەك دواخستنی نوێژەکان و گوێ نەدان بەدەست نوێژ و بەڕکوع و بەسوجدە و ڕوکنەکانی تری نوێژ، هەرکەسێك نوێژەکانی ڕێك وپێك نەبێت لێی وەرناگیرێت وکارەکانی تریشی لێ وەرناگیرێت .

لە ڕیوایەتێکی تردا ( نوێژ سێ بەشە دەست نوێژ بەشێکە، ڕکوع بەشێکە، سجود بەشێکە، هەرکەسێك ماف خۆی پێ بدات لێی وەردەگیرێت و کارەکانی تریشی لێ وەردەگیرێت، وهەر کەس نوێژەکەی لێ وەرنەگیرێت (واتە: لێی قبوڵ نەکرێت) کارەکانی تریشی لێ وەرناگیرێت ) .کەواتە: پێویستە نوێژەکانمان بە تەواوی ئەنجام

---

[٢٠] أخرجه: أحمد (١١٢/٥)، و النسائي (٢٣٢/١)، وأبي داود (٨٦٦)، و إبن ماجة (١٤٥٢)، و الطبراني في ((الكبير)) (١٢٥٥) مختصرا، و الحاكم (٢٦٣/١)، وصححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (١٣٣٠)، وفي ((صحيح سنن أبي داود)) (٨١٠)، وفي ((صحيح سنن إبن ماجة)) (١١٧٢)، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٤١٣)، وفي ((صحيح الجامع)) (٢٥٧١) .

[٢١] أخرجه: البزار (١٧٧/١) ( ٣٤٩) و إسناده حسن،كما قال الهيثمي في (( مجمع الزوائد)) (١٤٧/٢)، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٥٣٧) .

بدەین و هیچی لێ کەم نەکەینەوە، عەبدولاَی کوڕی عومەر (ﷺ) دەفەرمویَت: " لَيُدعنَّ اناسٌ يوم القيامة المنقوصين، قيل: يا ابا عبد الحمن وما المنقوصون؟ قال: ينقصُ احدهم صلاته في وضوئه والتفاتِه"[٢٢] واتە: (کەسانێك لە ڕۆژی کۆتاییدا پێیان دەوترێت کەم تەرخەم و ناتەواوەکان. وتیان: باوکی عەبدوڕەحمان ئایا ناتەواوەکان کێن؟ فەرمووی: ئەوانەن کە نوێژەکانیان کەم دەکەنەوە بەهۆی کەم کردنەوەی دەست نوێژەکانیان یاخود ئاوڕدانەوەیان لە نوێژەکانیاندا.

## یەکەمین تاوان کە حوکمی لەسەر دەدرێت

گەورەترین تاوان کەزۆر گەورەیە لای خوا هاوبەشی دانانە بۆ خوای گەورە دوای ئەویش کوشتنی موسوڵمانێکی بێ تاوانە بەبێ هیچ هۆیەك، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((أَوَّلَ ما يُقضى بَينَ النَّاسِ في الدماء))[٢٣] واتە: )یەکەم شتێك کە حوکمی لەسەر دەدرێت لەنێوان خەڵکاندا لەسەر خوێن ڕشتنە).

## یەکەم شکات کارێك لەڕۆژی کۆتاییدا

عوقبەی کوڕی عامر (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أَوَّلُ خَصمَينِ يَومَ القِيامَةِ جاران))[٢٤] واتە: (یەکەم دوو کەسێك دەمەقاڵەیان دەبێت لەڕۆژی کۆتاییدا دوو دراوسێن)، وە لەڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عومەر (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((كم مِن جارٍ مُتَعلِقٌ بِجارِهِ يَومَ القيامَةِ، يَقُولُ: يارَبِّ هذَا أَغلَقَ بابَهُ دونِي، فَمَنَعَ مَعرُوفَهُ))[٢٥]. واتە: چەندین دراوسێ یەخەی دراوسێکەی خۆی دەگرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا و پێی دەڵێ: پەروەردگار ئائەمە دەرگاکەی بەڕوومدا داخستبوو وەلەچاکەکانی منی بێ بەش کردبوو.

---

[٢٢] أخرجه: عبد الرزاق (٣٧٤٢) .

[٢٣] أخرجه: أحمد (٦٥٣٣)، والبخاري (٦٥٣٣)، ومسلم (١٦٨٧)، والترمذي (١٤١٤)، والنسائي (٨٣/٧)، وابن ماجة (٢٦١٥)، والبزار (٢٦٨/١)، وأبو يعلى (٢٤١/٢)،و إبن أبي شيبة (١٠٠/١٤)، والقضاعي (٢١١).

[٢٤] أخرجه: أحمد (١٥١/٤) (١٧٣٧٢)وقال محققه: حديث حسن، والطبراني في ((الكبير)) (٨٣٦/١٧)، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٤٩/١٠): رواه أحمد بإسناد حسن، و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٢٥٦٣)، و في ((المشكاة)) (٥٠٠٠)، و حسن إسناده أيضا الشيخ الأرناؤوط في تخريجه لـ((جامع العلوم)) (٣٥٠/١) .

[٢٥] أخرجه: البخاري في ((الأدب المفرد)) (١١١)، و حَسّنه الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (٨١)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٢٦١٦) .

## یەکەم کەس لەناو موسوڵمانانندا کە لێ پێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لەڕۆژی کۆتاییدا و دەخرێتە ناو دۆزەخەوە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّ اللّٰه تبارك وَ تعالى، إذا كانَ يَومَ القِيامَةِ يَنـزِلُ إلى العِباد لِيَقضيَ بَيْنَهم، وَ كُلُّ أُمَّةٍ جاثِيَةٌ فأوَّلُ النّاسِ [في رواية: يَقضى يَومَ القِيامَةِ][٢٦] مَن يُدعى بِـه: رَجلٌ جمع القران، و رَجُلٌ قُتلَ في سَبيلِ اللهِ، و رَجلٌ كَثيرُ المالِ، فَيَقولُ الله عزَ وَ جَلَ: أَلَم أُعَلمكَ ما أَنزَلتُ على رسولي ؟ قالَ: بَلى يا رَبِّ، قال: فَما عَمِلت فيما عَلِمت ؟ قـال: [تَعلَّمْـتُ العِلـمَ و علَّمتُهُ وَ قَرأْتُ فِيكَ القرانَ][٢٧]. آناءِ اللَيّلِ وَ آناءَ النَّهارِ فيقولُ الله عـز وجـل: كـذبتَ، وتقـولُ الملائكة: كذبتَ، و يَقُولُ اللّٰهُ تبارك وَ تعالى: [تَعلَّمتَ لِيُقَـالَ عَـالِمٌ، و قَـرأتَ القُـرآنَ لِيُقـالَ هُـوَ قَاريءٌ وقَد قَيل، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ على وَ جهِهِ حتّى أُلقي فيَّ النـارِ، و رَجُـلٌ وَ سَّـعَ اللّٰـهُ عَليـهِ وَ أعطاهُ مِن أصنافِ المالِ كُلِهِ فأَتى بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعِمَهُ فَعرَفَها][٢٨] فَيَقولُ اللّٰهُ عزوَّجَل: أَلَم أُوسِّعَ عَليكَ حتَّى لَم أَدَعْكَ تَحتَاجُ إلى أَحد ؟ قالَ: بَلى يارَبِّ، قالَ فماذا عَملتَ فيما آتَيتُكَ؟ قَالَ: كنُتُ أَصِـلُ الرَّحِمَ، و اَتَصَدَّقُ [ما تَركتُ مِن سَبيلٍ تُحبُّ اَن يُنفَقَ فيها إلاّ أنفقتُ فيها لَـكَ][٢٩]، فَيقُـولُ اللّٰـهُ لهُ: كَذبتَ و تَقُول الملاَئِكةُ: كذبتَ [لكِنَّكَ فَعَلَت لِيُقَالَ: هُوَ جوادٌ، فَقَد قيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَيُسـحَبُ على وَجهِهِ حتّى أُلقيَ فيّ النّارِ]، وَ يُؤتي بالذي قُتِلَ في سبيلِ اللّٰهِ، فَيقُولُ اللّٰـهُ لَـهُ: فيَمـا ذِا قُتِلـتَ؟ فيَقُولُ: أَي رَبِّ أُمِرتُ بِالجهادِ في سَبيلِكَ فقَاتَلتُ حَتىَّ قُتِلـتُ، فيَقُـولَ اللّٰـهُ لَـهُ: كَـذبتَ و تَقـولُ المَلاَئِكة: كَذبتَ، و يَقوَل اللهُ: بَل أردَتَ اَن يُقَالَ فُلانٌ جَريءٌ فَقَد قيـلَ ذَلِـكَ ... يـا أَبـا هُريـرة: أُولئِكَ الثَلاثَةَ أوَّلُ خَلقِ اللهِ تُسَعَرُ بِهِم النَّارُ يـومَ القيامَـةِ))[٣٠]. **واتـە: (خـوای گـەورە لـە ڕۆژی کۆتاییدا دادەبەزێت بۆلای بەندەکانی تا لێ پێچینەوە و دادوەرییان لەنێواندا بکات، و هەموو ئومەتان لەوێدا بەچۆکدا هاتوون و لەسەر چۆك وەستاون، یەکەم کـەس لـەناو**

---

[٢٦] أخرجه: مسلم (١٩٠٥)، وأنظر: ((صحيح الجامع)) (٢٠١٤) .

[٢٧] في رواية: مسلم (١٩٠٥) .

[٢٨] في رواية: مسلم و النسائي .

[٢٩] في رواية: النسائي (٢٤/٦) .

[٣٠] أخرجه: مسلم (١٩٠٥)، و الترمذي (٢٣٨٢)، والنسـائي (٢٣/٦)، و إبـن حبـان (٤٠٨) و قـال محققـه: إسناده صحيح، و الحاكم (٤١٨/١) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٢٠) .

خەڵکاندا (لەرپیوایەتێکدا: کە دادوەریان لەگەڵدا دەکرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا) و بانگیان لێ دەکرێت: پیاوێکە قورئانی کۆکردۆتەوە،وپیاوێکە کوژراوە لەپێناوی خوادا،و پیاوێکە پارەداربووە، خوای گەورە دەفەرموێت (واتە:بەزانا قورئان خوێنەکە): ئایا فێرم نەکردیت ئەوەی کە ناردبوومە خوارەوە بۆسەر نێردراوەکەم ؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، دەفەرموێت:کاری چیت کرد بەوەی کەزانیت ؟ ئەویش دەڵێت (زانست فێر بووم و خەڵکانی تریشم فێر کرد وە لەپێناوی تۆدا قورئانم خوێند) لە درێــژایی شــەو و ڕۆژدا، خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: درۆت کــرد!! ومەلائیکەتەکانیش پێی دەڵێن: درۆت کرد !!،وخوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: زانست فێر بوویت بۆ ئەوەی پێت بڵێن زانایت، و قورئانت خوێندەوە بۆ ئەوەی پێت بوترێت قورئان خوێنە، و پێشت وترا(واتە: خەڵکان لەدونیادا پێیان وتیت تۆ زانا و قورئان خوێنیت)، ئینجا فەرمان دەکرێت کە ڕابکێشرێت لەسەر دەم و چاوی تا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە.

وە پیاوی دووەمیان خوای پەروەردگار دەروی خێری لێ کردوەتەوە و لەهەموو جۆرەکانی سامانی پێی بەخشیوە، دەیهێنێت و نیعمەتەکانی خۆی نیشان دەداتەوە تادەیناسێتەوە، خوای پەروەدگار پێی دەفەرموێت: ئایا دەرووم لێ نەکردبویتەوە هەتا وام لێ کردیت کە پێویستیت بەکەس نەبێت ؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، پێی دەفەرموێت: چیت کرد لەوەی کە پێم بەخشیت ؟ ئەویش دەڵێت، منیش خزمانم پێ بەسەر کردەوە ولێم کرد بەخێر (هیچ ڕێگەیەکم جێنەهێشت کە تۆ پێت خۆش بێت تیایدا سەرف بکرێت لە هەموو ئەو ڕێگایانەدا بەخشیم لەپێناوی تۆدا)، خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێت: درۆت کرد !! ومەلائیکەتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد ئەنجا پێی دەوترێت: (بەڵام تۆ بۆیە وات کرد بۆ ئەوەی پێت بوترێت خێرەومەندە، وەپێشت وترا (واتە: لەدونیادا)، ئینجا فەرمان دەکرێت کە لەسەر دەم و چاو ڕابکێشرێت تا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە)، وە سێ یەمیان ئەو کەسەیە کە کوژراوە لەپێناوی خوادا دەهێنرێت و خوای گەورە پێی دەفەرموێت: لەچیدا کوژرایت؟ ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار فەرمانت بەجیهاد کردن دا لەپێناوتدا منیش جەنگام لە پێناوی تۆدا تا کوژرام، خوای گەورە پێی دەفەرموێت درۆت کرد

و مەلائیکەتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بەڵکو ویستت کە پێت بوترێت فلان کەس چاونەترسە و پێشت وترا، ئینجا فەرمان دەکرێت کە ڕابکێشرێت لەسەر دەم وچاو تا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە (ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئەبو هورەیرەی فەرموو): ئەی ئەبو هورەیرە ئەو سیانە یەکەم دروستکراوانی خوان کە ئاگری دۆزەخیان پێ گەرم دەکرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا) .

لە پاش ئەوان لە هەموو تاقم و کۆمەڵێك گەورە تاوانبارانیان لە پێشدا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴾ (مريم: ٦٩) (أبي الاحوص) دەفەرموێت: "يبدأ بالأكابر فالأكابر جرماً"[٣١]. واتە: "سەرەتا گەورە تاوانبارەکان لە پێشدا یەك بەدوای یەکدا فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە".

## ئەو چوار کەسەی کە بەڵگەی خۆیان دەڵێن لەڕۆژی کۆتاییدا

ئەسوەدی کوڕی سەریع (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أَربَعةٌ يَحتجُونَ يَوم القيامةِ: رجلٌ أصَمُّ (لايَسمع)، وَرَجلٌ معتوهٌ (أحمَقُ)، وَرَجلٌ هَرِمٌ، ورجلٌ مات في الفترةِ [و المَوْلُودُ][٣٢]، فأمّا الأصمّ فيَقولُ: يَاربِ لقَد جَاء الإسلامُ و مَا أَسمَعُ شَيئاً، و أمّا الأَحمَقُ فيَقُولُ: رّبِ قَد جَاءَ الإِسلامُ و الصبيانُ يَحذفُونَني بالبَعرِ، و أمّا الهَرِمَ فيقُولُ: رَبٌ لقَد جَاءَ الإِسلامُ وَما أعقل، و أمَّا الذِي في الفترَةِ: فَيقُولُ: رَبٌ ما أتاني لَكَ رسَولٌ فيأخُذُ مَواثيقَهم لِيُطيعَنَّهُ))[٣٣]، (( ... فَيقُولُ الرّبُّ تَباركَ و تَعالى لِعُنقٍ مِنَّ النّارِ: ابُرز، فَيقُول لَهُم: إنّي

---

[٣١] أخرجه: هناد (٢٥٨) وقال محققه: اسناده صحيح .

[٣٢] في رواية: أبو يعلى (١٠٤٤).

[٣٣] أخرجه: أحمد (٢٤/٤) رقم (١٦٠٣١) و قال محققه: حديث حسن، و الطبراني في ((الكبير)) (٨٤١)، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٢١٦/٧): رواه أحمد و رجاله رجالٌ صحيح، و قال البيهقي في ((الإعتقاد)) (ص:١٦٩): إسناده صحيح، و البزار (٣٣/٣) (٢١٧٦) وهو حديث حسن في الشواهد، كما قال الشيخ الأرناؤوط في تحقيقه على صحيح إبن حبان (٣٥٨/١٦)، و اخرجه إبن حبان (٧٣٥٧) و قال محققه: إسناده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٨٨١)، و صححه أيضا الشيخ مقبل في ((صحيح المسند)) (١٩) .

كُنتُ اَبعثُ إلى عباديَ رُسلاً مِن انفسُهم، و إنـي رَسَـولُ نَفسـي إلـيكم اَدخُلُـوا هَـذهِ [النَّـارَ][٣٤] فيَقولُ مَن كُتِبت عليهِ الشَّقَاوَةُ: يارب أينَ نَدخُلُها و مِنها كُنّا نَفِرُّ، قالَ: فَيقَوُل تبارك و تَعالى: أنتُم لِرسُلي أشَدُّ تكذِيباً و مَعَصيَةً [فوَ الذي نَفسي بيدِهِ لَو دَخَلُوهَا،لكانَت علـيهم بَـرداً و سَـلاماً][٣٥] فيَدخلُ هؤلاء الجنة وهؤلاء النّارَ))[٣٦] واتە: (چوار هەن بەڵگەی خۆیان دەهێننەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا:پیاوێکی کەڕ کە گوێی لەهیچ نەبووە، وە پیاوێکی بێ عەقڵی شێت، و پیاوێکی پیر، وپیاوێك کەلە (فەترەدا) مردووە (لەڕیوایەتێکی تردا و منداڵێکی کوڕپە) کەڕەکە دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئیسلام هات و گوێم لەهیچ شتێ نەبوو تا ببیستم، وشێتەکە دەڵێت: پەروەردگار ئیسلام هات و منالان تەپاڵەیان تێ دەگرتم، و پیرەکە دەڵێت: پەروەردگار ئیسلام هات و عەقلم بەهیچ نەئەشکا، و ئەوەی لە فەترەدا بووە دەڵێت: پەروەردگار هیچ نێردراوێکت نەهاتووە بۆلام، ئینجا پەیمانیان لێ وەردەگرێت کە گوێڕایەڵی خوا بکەن، .....ئینجا پەروەردگار بەملێکی ئاگر (واتە:شالاوێکی ئاگر) دەفەرموێت: خۆت ئاشکرا کە (واتە:وەرە ئەو جێگەیە) ئینجا پەروەردگار پێیان دەفەرموێت:من بۆلای بەندەکانم نێردراوێکم دەنارد لەخۆیان، ومن نێردراوی خۆمم بۆلای ئێوە هەموو بچنە ناو ئەو (ئاگرەوە) و ئەوانەی کە لە ئەهلی دۆزەخ نوسراون دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئێمە بۆچی بچینە ناویەوە ئێمە لەو ئاگرە ڕامان دەکرد، و ئەوانەی کە بەختەوەرییان بۆ نوسراوە دەڕۆن بەپەلەو خێراو خۆیان دەخەنە ناوییەوە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت (واتە: بەرامبەر ئەوانەی کە خۆیان فڕێ نەداوەتە ناو ئاگرەوە): ئێوە نێردراوانی منتان توندتر بەدرۆ دەخستەوە و سەرپێچیتان دەکردن (پێغەمبەری خوا دەفەرموێت): سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر بچونایەتە ناویەوە (واتە:ناو ئاگرەکە) ئاگرەکە سارد دەبۆوە لەسەریان و سەلامەت دەبوون، ئینجا ئەوانە دەچنە بەهەشت و ئەوانی تریش دەچنە دۆزەخ ).

---

[٣٤] في رواية .

[٣٥] في رواية ابن حبان (٧٣٥٧) و قال محققه: إسناده صحيح .

[٣٦] أخرجه: أبو يعلى (٣/١٠٤٤)، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٤٦٨)، و (١٤٣٤)، و قال ابن القيم في ((أحكام أهل الذمة)) (٢/ ١١٤٩).

# ئایا خەڵکان بەناوی خۆیان و باوکیانەوە بانگیان لێ دەکرێت لەڕۆژی کۆتاییدا؟

فەرموودەیەکی لاواز لەم بارەیەوە هاتووە کە ئەبودەرداء(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إِنَّكُم تُدعَوْنَ يَومَ القيامَةِ بِأَسَمائِكُم و أَسَماءِ آبائِكُم ...))[٣٧] واتە:(ئێوە بانگتان لێ دەکرێت لەڕۆژی کۆتاییدا بەناوی خۆتان و باوکانتانەوە).

هەرچەندە ئەم فەرموودەیە ئیسنادەکەی لاواز بێت بەڵام ماناکەی ڕاستە، و لە چەندین فەرموودەی تردا هاتووە، وەك فەرموودەکەی ئیبنو عومەر (ﷺ) کە دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرمویەتی: ((إذا جَمَع الله الأولينَ و الآخرينَ يوم القيامة يُرفَع لِكل غادِرٍ لِواءٌ [عِندَ أَستِه] فيُقال: هذا غَدرَةُ فلانُ بن فلان))[٣٨] واتە: (کاتێك خوای گەورە یەکەمەکان و کۆتاییەکانی کۆدەکاتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا، بۆ هەموو غەدارێك ئاڵایەك لای پشتیەوە بەرز دەکرێتەوە ودەوترێت ئەمە غەدری لەفلانی کوڕی فلان کردووە)، وە دوای هاتنە دەرەوەی ڕۆح لە دونیادا ئەوەتا مەلائیکە دەڵێن): ((....فلا يمر بها على ملأ من الملائكة إلا قالوا: ما هذا الروح الطيب ؟ فيقولون: فلان بن فلان...))[٣٩]. واتە: (... بەلای هەر کۆمەڵێك لە مەلائیکە تێ دەپەڕێت دەڵێن: ئەو ڕۆحە پاکە کێ؟ دەوترێت:فلانی کوڕی فلان )، وە فەرموودەکەی عەبدولای کوڕی عەمرو (ﷺ) پشتگیری لەمە دەکات دەفەرموێت:پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان و دوو کتێبی بە دەستەوە بوو فەرمووی: ((أتدرون ما هذان الكتابان؟)... فقال للذي في يده اليمنى: (هذا كتاب من رب العالمين فيه أسماء أهل الجنة و أسماء آبائهم و قبائلهم...)

---

[٣٧] أخرجه: أحمد (١٩٤/٥) (٢١٦٩٣) وقال محققه: اسناده ضعيف، والدارمي (٢٩٢/٢)، وأبوداود (٤٩٤٨)، و البيهقي (٣٠٦/٩) و في ((شعب الإيمان)) (٨٦٣٣)، و قد ضعّفها الشيخ الألباني في ((ضعيف سنن أبي داود)) (١٠٥٣)، و((الكلم الطيب)) (١٥٩)، وفي ((المشكاة)) (٤٧٦٨): إسناده ضعيف، وابن حبان (٥٨١٨) و قال الأرناؤوط في تحقيقه: رجاله ثقات، و لكن يشهد له حديث ابن عمر .

[٣٨] أخرجه: البخاري في ((كتاب الأدب)) (٤٦٤/١٠) (٦١٧٧) (باب يدعى الناس بآبائهم)، ومسلم (١٧٣٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٧٦٦) .

[٥١] أخرجه: أحمد (١٨٥٣٤)، وابي داود (٤٧٥٣)،والنسائي (٨/٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٦٧٦٠)

ثم قال للذي في شماله: (هذا كتاب من رب العالمين فيه اسماء أهل النار و اسماء آبائهم و قبائلهم ثم أجمل على آخرهم ...))[٤٠]. واتە: ( ئەزانن ئەم دوو کتێبە چین ؟ فەرمووی: بەوەی کە بە دەستی ڕاستی بوو: ( ئەمە کتێبێکە لە خوای جیهانانەوە ناوی بەهەشتیەکان وناوی باوکانیان و هۆزەکانیانە) دواتر فەرمووی: بەوەی کە بە دەستی چەپی بوو: (ئەمە کتێبێکە لە خوای جیهانانەوە ناوی دۆزەخیەکان وناوی خۆیان و ناوی باوکانیان وهۆزەکانیانە).

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە ئاماژە بەوە دەکات کە خەڵکان بە ناوی دایکیانەوە بانگ دەکرێن: ((إنَّ الناسَ يَومَ القيامةِ يُدعَونَ بِأمّهاتِهم لا بآبائِهم))[٤١] واتە: (خەڵکان لەڕۆژی کۆتاییدا بەناوی دایکیانەوە بانگیان لێ دەکرێت نەك بەناوی باوکیانەوە بەڵام ئەمە ڕیوایەتێکی لاوازە و ناکرێتە بەڵگە، وە لە ڕیوایەتێکی لاوازی تردا هاتووە: ((يُدعَى النّاسُ يَومَ القِيامَةِ بِأ مِهاتِهم سِتراً مِنَ اللّه عَزوجل عليهم))[٤٢]واتە: (خەڵکان بانگیان لێ دەکرێت لەڕۆژی کۆتاییدا بەناوی دایکیانەوە ئەم داپۆشینەش لەلایەن خواوەیە بۆ ئەوەی ئابڕوویان نەچێت ).

---

[٥٢] أخرجه: احمد (٢/١٦٧)، و الترمذي (٢٤١٨)، وحسنه الشيخ الألباني في: ((صحيح الترمذي)) (١٧٤٠)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٨٤٨) .

[٤١] أورده إبن القيم الجوزية في ((المنار المنيف)) (٣١٧) و قال: حديث باطل،وانظر: ((تحفة المودود))(ص:١٢٢). .

[٤٢] أخرجه: الطبراني في: ((الكبير)) (١١/١٢٢)، و الديلمي في: ((فردوس الأخبار)) (٥٥٤)، والحديث ضعيف أنظر: ((كنز العمال)) (٣٩٧٦٦)، و ((المجمع)) (١٠/٣٥٩)،و ((المغني عن حمل الأسفار)) (٢/٣٨١) و ((الدر المنثور)) (٦/١٧٣)، و ((اللالي المنثورة)) (٢/٢٣٩)، و ((الدرر المنتثرة)) (١١٠)، و ((الموضوعات)) (٣/٢٤٨)، و ((تنزيه الشريعة)) (٢/٣٨١)، و ((كشف الخفاء)) (١/٢٨١)، و ((المقاصد الحسنة)) (١٢٤) و ((تذكرة الموضوعات)) (٢٢٤)، و قال الشيخ الألباني في: ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) رقم (٤٣٣): موضوع، و أنظر طرق الحديث بتوسع في: ((موسوعة أطراف الحديث)) (٣/٢٢١) .

# تۆڵە سەندنەوە (القصاص)

خوای پەروەردگار ناهێڵێت هیچ کەسێك لە بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان بچنە ناو بەهەشت یان دۆزەخ تاوەکو ستەمکارەکان تۆڵەیان لێ نەکرێتەوە وە ماف نەگەڕێتەوە بۆ ستەم لێکراوان .

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((یَحشرُ اللهُ العِبادَ [حُفاة] عُراةً غرلاً ... لَیسَ مَعهم شَيءٌ ثُمَّ یُنادِیهم رَبُّهُم تَعالی بِصَوتٍ یَسمَعهُ مِن بَعدٍ کَما یَسمَعُه مِن قرب: أَنا المَلك أنا الدّیانُ لا یَنبَغي لأحدٍ مِن أهلِ الجَنةِ اَن یَدخُلَ الجَنَّة و لاَ لأَحدٍ مِن اهَل النّارِ أن یَدخُلَ النّارَ و عِندهُ مَظلَمةٌ حتی أقصَّهَ مِنهُ حتّی اللّطمَةَ...))[٤٣] واتە:(خوای پەروەردگار بەندەکانی حەشر دەکات بەڕووتی و بەپێ پەتی... هیچ شتێکیان لەگەڵدانیە ئینجا پەروەردگاریان بانگیان لێ دەکات بەدەنگێك کە ئەوانەی لەدوورن گوێیان لێ یە وەك ئەوانەی لەنزیکن: من پاشام (واتە: خوا دەفەرموێت) من (دیان)م[٤٤] (واتە:تۆڵەسێنم) نابێت هیچ کەسێك لەبەهەشتیەکان بچێتە ناو بەهەشت و هیچ کەسێکیش لەدۆزەخیەکان بچێتە ناو دۆزەخ گەر ستەمێکی کردبوو هەتا تۆڵەی بۆ لێ دەسێنمەوە، تەنانەت زلەیەکیش بێت... ).

---

[٤٣] اخرجه: احمد (١٦٠٤٢) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن، والبخاري ((الأدب المفرد)) (٩٧٠)، و حسّن إسناده الحافظ العراقي في ((الأحياء)) (٥٠٦/٤)، و الحاكم (٤٣٨/٢) و صححه ووافقه الذهبي، و قال إبن القيم الجوزية: حديث حسن جليل كما في ((مختصر الصواعق المرسلة)) (ص: ٤١٩)، وقال الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (٣٥١/١٠) رواه أحمد و الطبراني في الأوسط بإسناد حسن، و حسنه الشيخ الألباني في: ((صحيح الأدب المفرد)) (٧٤٦)، ((السلسلة الصحيحة)) (١٦٠) .

[٤٤] الدّيان: لەفەرهەنگی (القاموس المحيط)دا (١٥٧٥/٢)دا هاتووە بە مانای – القهار –القاضي–الحاكم–السائس–الحاسب–المُجازي الذي لا يضيع عملاً – بل يَجزى بالخيروالشرّ.

# ئەوانەی کە تۆڵەیان لێ دەسەندرێتەوە

**یەکەم: بوختان کاران:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَن قَذَفَ مَملُوكَهُ بَرِيئاً مِمَا قالَ، أُقِيمَ عليه الحَدُّ [في رواية: جُلِدَ][45] يومَ القيامَةِ إلاَّ اَن يَكونَ كَما قَالَ))[46] واتە: (هەرکەسێك تۆمەتی زینا بداتە پاڵ کچۆڵەکەی خۆی کە دوور بێت لەو تۆمەتەی کە دراوەتە پاڵی ئەو کەسە حەددی (جەڵدی) لێ دەدرێت لەڕۆژی کۆتاییدا مەگەر ئەو تۆمەتە ڕاست بوو بێت).

کەواتە: پێویستە خۆمان لە بوختان و هەموو قسەیەکی ناڕەوا بەدوورگرین، ئەوە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رحمه الله) دەفەرموێت: " کانوا يقولون اذا قال الرجل للرجل ياكلب ياحمار ياخنزير [ قيل يوم القيامة] قال الله تعالى (أترانـي خلقته كلباً أو حماراً أو خنزيراً"[47]. واتە: (پیاوچاکان دەیان وت: گەر پیاوێك بە پیاوێك بڵێت سەگ، کەر، بەراز، ئەوا لەو ڕۆژەدا خوای گەورە پێی دەڵێت (بەخاوەن قسەکە): ئایا ئەو کەسەم بەسەگ یان کەر یان بەرزا دروست کردبوو).

**دووەم: لێدان و ئەشکەنجەدان بەناحەق:**

عەمماری کوڕی یاسر (رضي الله عنه) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((مَنْ ضَرَبَ ضرباً [في رواية: مـن ضَـرَبَ مَملوكَـهُ ][48] ظُلمـاً أُقتُص مِنـهُ يـومَ القيامـةِ))[49] واتە هەرکەسێك لەیەکێك بدات (لەڕیوایەتێکدا: هەرکەسێك لەخزمەت

---

[45] في رواية .

[46] أخرجه: البخاري (٤/١٦٩٨)، و مسلم (١٦٦٠)، و الترمذي (١٩٤٧) و قال: حديث حسن صحيح، و أبو داود (٥١٦٥)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٥٥٨)، و في ((صحيح سنن أبي داود)) (٤٣٠٢) .

[47] أخرجه: هناد (١١٩٥) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن أبي شيبة (٨/٥٣٦)، وابن أبي الدنيا ((الصمت)) (٣٥٠) وقال محققه: اسناده صحيح.

[48] في رواية: أبو نعيم في ((الحلية)) (٤/٣٨٧)، و أنظر: ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٥٢) .

[49] أخرجه: البخاري في ((الأدب المفرد)) (١٨١)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (١٣٤) و قال: إسناده صحيح، و في رواية: ((مَنْ ضَرَبَ سوطاً ظُلماً اقتُصَ مِنهُ يوم القيامة)) أخرجه: البيهقي ((الكبرى)) (١٦٠٠٤)، و البزار (٣٤٥٤)،و الطبراني في ((الأوسط)) (١٤٤٥) و إسنادهما حسن كما قال الهيثمي: ((مجمع الزوائد)) (١٠/٣٥٣) .

کارەکەی بدات) بەستەم، ئەو کەسە تۆڵەی لێ دەسەندرێتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا)، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەموویەتی: ((أشَدّ النـاسِ عـذاباً عنـد اللهِ يـومَ القيامـةِ أشَـدّهم عـذاباً للنـاسِ في الـدنيا))[٥٠] واتە: ئەوانەی خوای گەورە سەختترین سزایان دەددات لەڕۆژی کۆتاییدا ئەوانەن کە لەدونیادا بەسەختی سزای خەڵکیان داوە).

لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((إن مثل بذي روح ثم لم يَتُب مثل الله بـه يوم القيامة))[٥١] .واتە: (هەر کەسێك ڕۆح لەبەرێك هەتك بکات (واتە: گوێ ولوت و کلکی ببڕێت و...هتد) پاشان تەوبەنەکات لەڕۆژی کۆتاییدا بە هەمان شێوە هەتك دەکرێت).

## سێیەم: جوێن دەران و پارە خۆرەکان، وخوێن ڕێژەکان:

ئەبوهورەیرە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أتَدرونَ مَنِ المُفلِس ؟ قالوا: المُفلِسُ فينا مَنْ لا دِرهَمَ لهُ و لا مَتاع، فقالَ: إنَّ المُفلِسَ مِنْ أمّتي مَنْ يأتي يومَ القيامة بِصلاة و صيامٍ و زكاةٍ، و يأتي و قد شَتَمَ هذا، و قَذَفَ هذا، و أكلَ مالَ هذا، و سَفَكَ دمَ هذا، و ضَرَبَ هذا، فَيُعطى هذا مِنْ حَسَناتِهِ و هذا مِنْ حَسَناتِهِ فإنْ فَنِيَتْ حَسَناتُهُ قبلَ أنْ يُقضى ما عليهِ، أخِذَ مِنَ خطاياهُمْ فَطُرِحَتْ عليهِ ثُمَّ طُرِحَ في النّار))[٥٢]. واتە: (ئایا دەزانن موفلیس کێیە؟ ئەوانیش وتیان: موفلیس لەناوماندا ئەوەیە کە درهەم و شت ومەکی نەبێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: موفلیس لەناو ئومەتەکەمدا ئەو کەسەیە کە دێت لەڕۆژی کۆتاییدا نوێژی هەیە و ڕۆژووی هەیە و زەکاتی هەیە بەڵام جوێنی بەم داوە و بوختانی بۆ ئەو کردووە و ماڵی ئەمی خواردووە و خوێنی ئەوی ڕشتووە و لەوی داوە، لەچاکەکانی ئەم پیاوە موفلیسە دەدرێت بەو کەسانەی کە ئەم بوختانی بۆ

---

[٥٠] أخرجه: أحمد (٤/٩٠)، والحميدي (٥٦٢)، و الطبراني في ((الكبير)) ١٧/(١٠٠٦)، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٤٢)، وفي ((صحيح الجامع)) (٩٩٨) .

[٥١] أخرجه: أحمد (٥٦٦١) وقال محققه: حديث صحيح

[٥٢] أخرجه: مسلم (٢٥٨١) وفي رواية: ((الدَّين دينان، فمن مات وهو ينوى قضاءهُ، فانا وليّه، ومن مات و هو لاينوي قضاءه فذاك الذي يؤخذ من حسناته ليس يؤمئذٍ دينار ولادرهم)) أخرجه: الطبراني (الكبر) (٧٥١٢)،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٤١٨).

کردوون، وە بەو کەسانەی کە لێی داون بەناهەق، وە بەو کەسانەی کە جوێنی پێداون وە بەو کەسانەی پارەی خواردوون وە بەو کەسانەی کە خوێنی ڕشتوون.، ئەگەر چاکەکانی تەواو بێت پێش ئەوەی مافی خەڵکی لانەمێنێت ئەوا لەخراپەکانی ئەوان هەڵدەگیرێت و فڕێ دەدرێتە سەر تاوانەکانی و پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە سەعیدی کوڕی مسیب (ﷺ) فەرمووی: ((يؤتى بالرجل يوم القيامة، فينظر إلى حسناته قد جمعت له، فيظن إنها تنجيه، فيصيح صائح بالخلق: من كانت له مظلمة عند فلان فليأت . فيأتي أبواه و امرأته و خادمه و ولده و من كان له ظلم مثقال ذرة من الخلق جميعا فيقول: خذ من حسناته بقدر ما ظلمهم حتى يأتي ذلك على حسناته حتى تفنى، و قد بقيت عليه مظالم كثيرة، فيقال: يا رب قد ذهبت حسناته و بقي عليه مظالم، فيقال: خذوا من سيئاتهم فأطرحوها عليه بقدر ما ظلمهم ثم يذهب به إلى النار))[٥٣]

واتە: (پیاوێك دەهێنرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا، و تەماشای چاکەکانی دەکرێت کە بۆی کۆکراوەتەوە، وا ئەزانێ کە فریای دەکەوێت، یەکێك هاوار ئەکات: کێ ستەمێکی لێ کراوە لە لایەن فلأن کەسەوە با بێت، باوك و دایکی و خێزانەکەی و بەر دەستەکەی و ئەوانەی کە ستەمێکی هێجگار کەمیان لێ کراوە لە لایەن ئەو کەسەوە دێن و پێیان دەوترێت: لە چاکەکانی ببەن بە قەدەر ستەمەکەی کە لێی کردوون هەتا هەموو چاکەکانی تەواو دەبێت، وە ستەمێکی زۆری هێشتا بە سەرەوە ماوە، دەوترێت: خوای گەورە چاکەکانی هەمووی تەواو بوو بەڵام هێشتا ستەمی بە سەرەوە ماوە، دەوترێت: خراپەکانی ئەو کەسانە بەرن بیخەنە سەری بەقەدەر ئەو ستەمانەی کە لێی کردوون و دواتر دەست بەتاڵ دەردەچێت و دەیبەن بۆ ناو ئاگر) .

**چوارەم: ئەوانەی کە دەمەقاڵێیان لەنێواندا هەبووە:**

---

[٦٣] أخرجه: الدينوري في ((المجالسه)) (٢٨٩٢) و قال محققه: إسناده حسن .

زوبێری کوڕی عەوام (ﷺ) دەفەرموێت: (([لَمَّا نَزلَت ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾(الزمر: ٣١ ) قال الزبيُر: يارسول الله: اتكرَّرُ علينا الخصومة][٥٤] بعد الّذي كان بيننا في الدُنيا[مَع خواص الذنوب] ؟ [٥٥] قال: ((نعم)) [ لَيُكَررن عَليُكم حتى يُرَدَ على كُل ذي حقٍ حَقُه] [٥٦]، قال الزبُيرُ: وَ اللّهِ إنَّ الأمرَ لَشديدٌ][٥٧] واته:کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەو دەمەقاڵەیەی کە لە نێوانماندا هەبووە لە دونیاندا دووبارە دەکرێتەوە بەسەرماندا (لەگەڵ گوناهە تایبەتیەکان؟) فەرمووی: بەڵێ دووبارە دەکرێتەوە لەسەرتان هەتا هەموو خاوەن مافێك ماف بۆ وەردەگیرێتەوە، زوبێر (ﷺ) وتی: واللە ئەو کارە زۆر سەختە لەبەر ئەوەش بوو ئیمامی عومەر (ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو لەسەرە مەرگدا و فەرمووی: ((.... الحمد لله الذي لم يجعل قاتلي يخاصمني يوم القيامة في سجدةٍ سجدها لله عزوجل))[٥٨]. واتە: (سوپاس بۆ خوا کە بکوژەکەم موسوڵمان نی یە ولە قیامەتدا دەمەقاڵەم لەگەڵدا ناکات لەسەر سوجدەیەك کە بۆ خوای ئەنجام دابیت).

لەڕیوایەتێکی (لاوازدا) هاتووە کە ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کە فەرموویەتی: ((لَيختصمنَّ كلُ شيءٍ يومَ القيامةِ، حتّى الشاتان فيما

---

[٥٤] عن إبن عمر (ﷺ) قال: نزلت هذه الأية و مانعلم في أي شيء نزلت: ﴿ثم أنكم يوم القيمة عند ربكم تختصمون﴾ قلنا: من نُخاصم؟ ليسَ بيننا و بين أهل الكتاب خُصومة، حتى و قعت الفتنة ... قال إبن عمر: هذا الذي و عدنا ربّنا ان نختصم فيه)) . أخرجه: الطبري (٢/٢٤)، و النسائي في: ((التفسير)) (٢/٢٣١) (٤٦٧) و قال محققه: إسناده حسن.

[٥٥] في رواية .

[٥٦] في رواية أبو يعلى .

[٥٧] أخرجه: أحمد (١/١٦٤) و قال محققه: الأرناؤوط (١٤٣٤): إسناده حسن، و أبويعلى (١/٤٥)، و الحاكم (٢/٢٤٩) و صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، و قال الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (٧/١٠٢): رواه الطبراني ورجاله ثقات، و قال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٣٤٠): إسناده جيد .

[٥٨] أخرجه: ابن أبي شبة ((تأريخ المدنية)) (٣/٩٠٢)، وابن قدامة في ((الرقة والبكاء)) (١١١) وقال محققه: اسناده صحيح.

أنتطحا))[٥٩]. واتە: (هەموو شتێك دەمەقاڵەی لەسەر دەبێت لەڕۆژی کۆتاییدا هەتا دوو بزنیش سەبارەت بەو شتەی کە شەڕە شاخیان لەسەر کردووە).

**پێنجەم: ئەگەر تۆڵە کردنەوە زیادەڕەوی تیابکرێت تۆڵەی ئەو زیادە ڕەوییەی لێ دەسەندرێتەوە:**

دایکی باوەڕداران عائشە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: ((إنَّ رَجُلاً قَعَدَ بَين يَدي النبيِّ (ﷺ)، فقَالَ: يارسول الله: إنَّ لي مَملوُكَينِ يُكذِّبونَني،و يَخوُنني، وَ يَعصُونِي و اشتِمهم و أضرِبُهم فكيفَ أنَا مِنهم ؟ قال: ((يُحسبُ ما خَانُوكَ و عَصوكَ و كَذبوُكَ و عِقابَكَ أيَّاهُم ... و إن كانَ عِقابُكَ أيَّاهُم فوُقَ ذَنوبهم أُقتصَّ لَهمُ مِنك الفضل...))[٦٠]. واتە: (پیاوێك لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دانیشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: من دوو خزمەتکارم (واتە:عەبد)م هەیە درۆم لەگەڵدا دەکەن و خیانەتم لێ دەکەن و سەرپێچیم دەکەن، ومنیش جوێنیان پێ دەدەم و لێیان دەدەم، ئایا من چۆنم بۆ ئەوان ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوەی کە خیانەتیان لەگەڵدا کردویت وە سەرپێچی یان کردویت و درۆیان لەگەڵدا کردویت لەگەڵ سزاکەی تۆ بۆ ئەوان بەرامبەر دەکرێن .......ئەگەر سزاکەی تۆ بەرامبەر تاوانەکانیان زیاتر بێت ئەوکات تۆڵەی زیادی ئەوانت لێ دەسەندرێتەوە).

**شەشەم: ئەوەی ستەم لە (معاهد)[٦١]ێك بکات:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((... ألا مَن ظَلَمَ مُعاهِداً، أو اِنتَقصَهُ، أَو كَلَّفهُ فَوقَ طاقَتِهِ، أَو أَخَذَ مِنهُ شَيئاً بغيرِ طِيب نفسٍ، فَأَنا حَجِيجُهُ يَوم القيامَة))[٦٢]. واتە: (... هەر کەسێك ستەم لە (معاهد)ێك بکات (واتە: بێ باوەڕێکی ڕێگە پێ دراو لەلایەن دەوڵەتەوە)یان سوکایەتی پێ بکات یان شتێکی لێ داوا بکات کە لەتوانایدا نەبێت یاخود شتێکی لێ

---

[٥٩] أخرجه: أحمد (٢/٣٩٠) (١١٢٣٨) وقال محققه: اسناده ضعيف، وأبو يعلى (١٤٠٠)، و قال الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (١٠/٣٤٩): إسناده حسن .

[٦٠] أخرجه: الترمذي (٣١٦٥) وقال: حديث غريب، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي))(٢٥٣١)

[٦١] معاهد: واتە ئەو ئەهلی کتابەی کە باج دەدات بە دەوڵەتی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی بەرگری لێ دەکات .

[٦٢] أخرجه: أبي داود (٣٠٥٢)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٦٢٦) .

بسەنێت بەبێ ڕەزامەندی خۆی، من داوای تۆڵەی بۆ دەکەم وە داواکار دەبم لەسەر ئەو کەسەی ستەمەکەی لێ کردووە لەڕۆژی کۆتاییدا).

**حەوتەم: ئەو کەسەی یەکێك بەستەم بکوژێت تۆڵەی لێ ئەسەنرابێتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا دەکوژرێتەوە:**

وەك ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((إنَّ الرَّجُلَ لَيُقتَلُ يومَ القيامَةِ ألفَ قِتْلَةٍ بِضروبِ ما قتلَ)) [٦٣] واتە:((پیاوی بکوژ لەڕۆژی کۆتاییدا هەزار جار دەکوژرێتەوە بەو شێوەیەی کە ئادەمیەکەی پێ کوشتووە لە دونیادا).

**هەشتەم: ئەو ئادەمیزادەی کە بەستەم دەکوژرێت بکوژەکەی خۆی دەدۆزێتەوە و دەستی دەگرێت و دەییات بۆ لای خوای گەورە:**

ئیبنو عەباس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يَجِيءُ المَقْتولُ بالقاتِلِ يومَ القيامَةِ [آخذاً بِيَدِهِ] [٦٤] ناصِيَتُهُ و رَأسُهُ في يدَيهِ و أوداجُهُ تَشْخَبُ دماً يَقُولُ: يا ربٌّ [إنَّ هذا] قَتَلَني، حتَّى يُدنِيهِ مِنَ العرشِ [فَيَقولُ اللهُ لَهُ: لِمَ قَتَلتَهُ؟][٦٥] فَيَقُول: لِتَكونَ العِزةُ لِفلان [ في رواية: ... في مُلكِ فلان][٦٦] فَيَتبوأُ بإثمِهِ [في رواية: ..بذنبِهِ][٦٧] [فَيَقولُ اللهُ تعالى للقاتِلِ: تَعِسْتَ و يُذهَبُ بِهِ إلى النارِ][٦٨]))[٦٩] واتە: (کوژراو بکوژەکەی خۆی دێنێت لە ڕۆژی کۆتاییدا (دەستی بەدەستیەوەیەتی) ناو چەوانی و سەری بە هەردوو

---

[٦٣] قال الحافظ السيوطي في كتابه ((الجامع الكبير)) كما في ((منتخب كنز العمال)) (١٤١/٦): أخرجه ابن أبي شيبة ((المصف)) (٣٨٥٩٣) بإسناد صحيح، و في رواية: ((من مثل بذي روحٍ ثم لم يتُب مثل الله به يوم القيامة)) أخرجه أحمد (٥٦٦١) وقال محققه: حديث صحيح، (٩٢/٢) و الطبراني في ((الأوسط ))(٢٠١/٣).

[٦٤] في رواية أحمد .

[٦٥] في رواية: النسائي (٨٤/٧)، و الطبراني (١٠٠٧٥).

[٦٦] أنظر: ((ترتيب صحيح الجامع)) ١٣/٣(٤٢) .

[٦٧] في رواية احمد (٢١٤٢) .

[٦٨] في رواية الترمذي (٣٠٢٩) .

[٦٩] أخرجه: أحمد (٢١٤٢)، و الحميدي (٤٨٨)، وابن ماجة (٢٦٢١)، و النسائي (٧٥/٧، ١٨٧)، و الترمذي (٣٠٢٩) و قال: حديث حسن غريب، وصَحَّحَهُ الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٤٢٥)، و في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢١٢٢)، و في ((المشكاة)) (٣٤٧٨) و ((صحيح سنن النسائي)) (٣٧٣٢) .

دەستیەوەیەتی و شادەمارەکانی خوێنی لێ دەڕژێت و دەڵێت ئەی پەروەردگار (ئائەمە) منی کوشت، هەتا نزیکی دەکاتەوە لەعەرش (خوا پێی دەفەرموێت بۆچی کوشتت) ؟ ئەویش دەڵێت: بۆ ئەوەی سەربەرزی بۆ فلانە کەس بێت – لەڕیوایەتێکدا – (لەبەر سامانی فلانە کەس) بکوژەکە (تاوانەکانی) کوژراوەکەی لەسەر دادەنرێت (وەخوای پەروەردگار بە بکوژەکە دەفەرموێت: ڕیسوا بوویت، و دەبرێت بەرەو ئاگر) .

**نۆیەم: ئەو کەسەی خیانەتکاری بەرامبەر خێزانی موجاهیدێك بکات:**

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:** ((ما مِنْ رَجُلٍ مِنَ القَاعدِينَ يَخلُفُ رجُلاً مِنَ المجاهدينَ [في أهلِهِ بسوءٍ][70] إلاَّ نُصِبَ لَهُ يومَ القيامةِ، فَيُقال: هذا فُلانُ بن فلان، فَخُذْ مِنْ حَسَناتِهِ ثُمَّ التَفَتَ إلى أصحابِهِ فقالَ: فَما ظنكم، ما أرى يَدَعُ مِن حسناتِهِ شيئاً))[71] واتە: (هەر پیاوێك لەدانیشتووان (واتە: ئەوانەی کە نەچوون بۆ جیهاد) (خراپەیەك) بەرامبەر خێزانێکی موسوڵمانە موجاهیدەکان بکات، ئەو کەسە لەڕۆژی کۆتاییدا بۆی ڕادەوەستێنرێت و دەوترێت: (ئائەمە فلانی کوڕی فلانە لە چاکەکانی ببە)، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوڕی دایەوە بەلای هاوەڵەکانیدا و فەرمووی: (گومانتان چۆنە، وا ئەزانم چاکەکانی هەمووی دەباو هیچی لێ جێ ناهێڵێت)).

**دەیەم: پچڕێنەری خزمایەتی** (قاطع الرحم)**:**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** ((الرَّحِمُ شَجنةٌ (أي:قرابة مشتركة كاشتباك العروق) مِنَ الرَّحمن، و إنَّها تَجيءُ يومَ القيامَةِ تَتَكَلمُ بِلِسانٍ ذَلَقٍ [تَقولُ: أي ربِّ ظُلِمتُ، إني أُسيَ إليَّ، و إني قُطِعْتُ، قال: فَيُجيبُها ربُّها: ألا تَرْضَينَ أنْ أقطعَ مَنْ قَطَعَكِ، و أصِلَ مَنْ وَصَلَكِ][72]، مَنْ أشارَتْ إليهِ بِوَصلٍ، وَصَلَهُ اللهُ، و مَنْ أشارَتْ إليهِ بِقَطعٍ قَطَعَهُ اللهُ))[73] واتە: (ڕەحم و بەزەیی

---

[70] في رواية ابن حبان (٤٦٣٥) .

[71] أخرجه: مسلم (١٨٩٧)، و أبوداود (٢٤٩٦)، و النسائي (٦/٥٠)، و ابن حبان (٤٦٣٥) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم .

[72] في رواية: ابن حبان (٤٤٤) وقال محققه: حديث صحيح .

[73] أخرجه: الحاكم (٢/٣٠١)، وصَحّحه على شرطهما و وافقه الذهبي، و أخرجه البخاري في ((الأدب المفرد)) (٥٥) و أبوداود (٤٩٤١)، وأحمد (٢/١٦٠)، و الحميدي (٥٩١)،و الحاكم (٤/١٥٩) وصَحّحه و وافقه الذهبي مختصرا، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (٤٠)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٢٥) .

خزمایەتی بەشێکە لەناوی خوا، ڕەحم لەڕۆژی کۆتاییدا دێت و قسە دەکات بەزمانێکی پاراو (دەڵێت ئەی پەروەردگار من ستەمم لێ کراوە، من خراپەکاریم بەرامبەر کراوە، من پچڕێنراوم، پەروەردگاریش وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموێت: ئایا ڕازی نابیت ئەوەی کە تۆی پچڕاندووە منیش هەموو میهرەبانی خۆمی لێ دەپچڕێنم وە ئەوەی کە تۆی گەیاندووە منیش هەموو میهرەبانی خۆمی پێ دەگەیەنم)، ڕەحمەکەش هەر کەس دەست نیشان بکات کە گەیاندویەتی خوای گەورەش هەموو چاکەیەکی پێ دەگەیەنێت وە هەرکەس دەست نیشان بکات کە پچڕاندویەتی خوای گەورەش هەموو چاکەیەکی لێ دەپچڕێنێت ).

**یانزەهەم: تۆڵە سەندنەوە لەهەموو دروست کراوان تەنانەت ئاژەڵەکانیش:**

ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لَتُؤدُّنَّ الحقوقَ إلى أهلِها حتَّى يُقادَ لِلشاةِ الجَلْحاءِ مِنَ الشاةِ القرناءِ))[٧٤]. واتە: (مافەکان دەگەڕێنرێتەوە بۆلای خاوەنەکانیان هەتاکو تۆڵەی بزنی بێ شاخ دەسێنرێتەوە لە بزنی شاخدار).

**دوانزەهەم: لێ پێچینەوەی گران لەسەر دەوڵەمەندان و دەسەلاتداران دەبێت:**

عەبدوڵای کوڕی عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... ويَبقى شِدَّةُ الحِسابِ على ذَوي الأموالِ و السُلطانِ))[٧٥] واتە: (..... توندترین لێ پێچینەوە دەمێنێتەوە بەسەر خاوەن سامان و دەسەلاتدارەکان). لەبەر ئەمە بوو هەمووجار ئەبو زەڕی غەفاری دەیفەرموو:((ذو الدر همين اشد حساباً أو قال حبساً من ذي الدرهم))[٧٦] واتە: (خاوەنی دوو درهەم وەستان و لێ پێچینەوەی سەخت تردەبێت لەخاوەنی یەك درهەم).

---

[٧٤] أخرجه: الترمذي (٢٤٢٠) و قال: حديث حسن صحيح، وصحَحه الألباني في ((صحيح سنن الترمذي))(١٩٧٢) .

[٧٥] أخرجه: ابن حبان (٧٤١٩) و قال محققه: إسناده صحيح .

[٧٦] أخرجه: و هناد ((الزهد)) (٥٨٩) وقال محققه: رجاله ثقات، وأحمد ((الزهد)) (١٤٧)،ابن ابي شيبة (٣٤٢/١٣)، وابو نعيم (الحلية) (١٦٤/١)، وابو داود (الزهد) (٢٢)، وابن المبارك (الزهد) (٥١٠) وقال محققه: سنده صحيح،

**سیانزەهەم: ئەو کەسانەی کە منداڵ لەدایکەکانیان دوور دەخەنەوە:**

ئەبو ئەیوب (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ فَرَّقَ بين والِدَةٍ وَ وَلَدِها فَرَّقَ اللهُ بَينهُ و بينَ أحِبَّتِهِ يوم القيامةِ))[77] واتە:( هەرکەسێك جیاوازی بخاتە نێوان دایکێك و منداڵەکەی، خوای پەروەردگار جیاوازی دەخاتە نێوان ئەو کەسە و خۆشەویستانی لەرۆژی کۆتاییدا (واتە: هەرکەسێك دایکێك لە جگەر گۆشەکەی دوور بخاتەوە ئەو کەسە خوای پەروەردگار لە خۆشەویستانی خۆی دوور دەخاتەوە لەرۆژی کۆتاییدا).

## حاڵی سەرکردەکان لەرۆژی لێ پێچینەوەدا

**یەکەم: پەشیمان بوونەوە لەسەر سەرکردایەتی کردنیان بۆ خەڵکان:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لَيوشَكُ رَجُلٌ أنْ يَتَمنَى أنَّهُ خَرَّ مِنَ الثريا، و لَمْ يلِ مِنْ أمرِ الناسِ شيئاً))[78] واتە: (نزیکە پیاوێك خۆزگە بخوازێت کە لە ثورەیاوە (واتە: لەهەرە ئەستێرەی بەرزی ئاسمان) فڕێ بدرایەتە خوارەوە و هیچ کارێکی خەڵکانی بەدەست نەبووایە)، لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((وَيلٌ لِلأُمراءِ، وَيلٌ لِلعُرفاءِ، [وَيلٌ لِلوزراءِ]، ويلٌ لِلأُمناءِ، لَيَتمَنَينَ أقوامٌ يومَ القيامةِ أنَّ ذوائِبَهُم كانَتْ مُعَلَّقةً بالثريا، لَيدَلُونَ بين السماءِ و الأرضِ، و إنَّهُم لَمْ يَلوا [مِنْ أمرَ الناسَ شيئاً][79]))[80] واتە: ( هاوارو بەهیلاك چوون بۆ کاربەدەستان و، بۆ هەواڵگران، و بۆ وەزیرەکان و، بۆ ئەمیندارەکان، کەسانێك لەرۆژی کۆتاییدا خۆزگە دەخوازن کە بە قژ هەڵبواسرانایە بە ثورەیاوە

---

[77] أخرجه: الترمذي (١٥٦٦) و قال حديث حسن غريب، والدارمي (٢٤٧٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (٣٣٦١)، و ((صحيح سنن الترمذي)) (١٢٧١) .

[78] أخرجه: أحمد (١٠٧٣٧) و قال محققه الأرناؤوط: حديث حسن، الحاكم (٩١/٤) و صحّحه و وافقه الذهبي،و ابن حبان (٣٣٦/١١) و قال محققه: إسناده حسن، و حسّنَهُ الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٣٦١) .

[79] في رواية الحاكم .

[80] أخرجه: أحمد (٣٥٢/٢) (١٠٧٥٩) و قال محققه: شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن،والبيهقي (٩٣/١٠)، وابو يعلى (٦٢١٧)، و الطيالسي (٢٥٢٣)، و الحاكم (٩١/٤) و صحّحه و وافقه الذهبي، و الروياني في: ((المسند)) (٦٤٠)،و قال الهيثمي: ((مجمع الزوائد)) (٢٠٠/٥): رواه أحمد و رجاله ثقات .

ئەوان بلەرانایەتەوە لەنێوان ئەرزو ئاسماندا نەك (كارو باری خەڵكیان بەدەست بوایە)، لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە: كە ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((إنَّكُمْ سَتَحرِصونَ على الإمارة و إنَّها سَتَكونُ نَدامةً و حسرةً يوم القيامة))[٨١] واتە: (ئێوە سوور دەبن لەسەر بەدەست هێنانی كاربەدەستی وە ئەوەش دەبێت بە پەشیمانی و ئاخ بۆتان لە ڕۆژی كۆتاییدا) .

لەڕیوایەتێكی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((ما من رجل يلي أمر عشرة فما فوق ذلك الاتى مغلولاً يوم القيامة يده الى عنقه فكهُ برهُ، أوبقهُ إثمهُ))[٨٢] [ولاً لايَفُكُّهُ الا العدل أو يوبقه الجورُ][٨٣])) . واتە:(هەرپیاوێك سەروكاری دەكەسی كردبێت یان زیاتر دەستی بەستراوە بە ملیەوە بە كۆت وزنجیرە دێتە بەردەم خوا لە ڕۆژی كۆتاییدا یان چاكەكانی ڕزگاری دەكات یان خراپەكانی لە ناوی دەبات) . لەڕیوایەتێكدا [تەنها دادپەروەریەكەی كۆت و زنجیركەی لەسەر لادەبات یان ستەمەكەی لەناوی دەبات].

**دووەم: سەرۆك و كاربەدەست چۆن بوو بێت لەگەڵ گەلەكەیدا پەروەردگاریش وا دەبێت لەگەڵ ئەو سەرۆك و كاربەدەستە دا:**

ئەبو مەریەمی ئەزدی (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((مَنْ ولاّهُ اللهُ شيئاً مِنْ أمورِ المسلمين، فاحتجبَ دون حاجتِهِمْ و خلّتهم و فقرهِمْ احتجبَ اللهُ دون حاجتِهِ و خلتِهِ و فقره يوم القيامة))[٨٤] واتە: (هەركەسێك خوای پەروەردگار شتێك لەكاروباری موسوڵمانانی خستبێتە ژێر دەستی، ئەو خۆی دزیبێتەوە لە پێویستی و كەم و كوڕی و هەژارییان خوای پەروەردگاریش پێویستی و هەژاری و كەم و كوڕیەكانی بۆ جێبەجێ ناكات لەڕۆژی كۆتاییدا ).

---

[٨١] أخرجه: النسائي (٨/٢٥٥)، وصححه الشيخ الالباني في ((الصحيحة)) (٢٥٣٠)، و((صحح النسائي)) (٤٢١١).

[٨٢] أخرجه: أحمد (٢٢٣٠٠) وقال محققه: صحيح لغيره .

[٨٣] أخرجه: أحمد (٩٥٧٣): اسناده قوي

[٨٤] أخرجه: أبو داود (٢٩٤٨)، و الترمذي (١٣٣٢) و قال: حديث غريب، و الحاكم (٩٣/٤) و صححه و وافقه الذهبي، و الطبراني في ((الكبير)) ٢٢/(٨٣٢)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٦٤٧١) و ((السلسلة الصحيحة)) (٦٢٩) .

**سێهەم: ئەوەی لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا دەبێتەوە وە هەوڵی دەست خستنی دەستەڵات دەدات نرخی نی یە لای خوا:**

حوزەیفە (ﷺ) گێراویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من فارق الجماعة واستذلَّ الامارە لقی الله ولاوجه له عنده))[٨٥] واتە: (هەرکەسێ خۆی لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیا بکاتەوە و هەوڵی دەست خستنی دەستەڵات بدات هیچ نرخێکی نابێت کە دەگات بە خوا لە ڕۆژی کۆتاییدا) .

**چوارەم: کاربەدەستان لێ پێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت سەبارەت بە کەموکوڕیەکانیان:**

ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) گێراویەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يؤتى بالحكام يوم القيامة، بمن قصَّر، وبمن تعدّى، فيقول الله تعالى: انتم خزان أرضي، ورعاة غنمي وعندكم بغيتي، فيقول للذي قصّر: ماحملك على ما صنعت ؟ فيقول: الرحمة، فيقول الله جل جلاله: انت ارحم بعبادي مني ؟ ويقول للذي تعدّى: ما حملك على ما صنعت ؟ فيقول: غضبت لك فيقول الله: انت اشد غضباً مني ؟ فيقول: انطلقوا بهم فسدّوا بهم ركناً من أركان جهنم))[٨٦] واتە: (کار بەدەستانْ لە ڕۆژی کۆتاییدا دەهێنرێن و هەندێکیان کەم و کوڕیان کردووە لە فەرمانڕەوایی یەکەیاندا وە هەندێکیان دەست درێژیان کردووە. خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: ئێوە کلیل بە دەستی خەزێنەکانی سەر زەوی من بوون وە شوانی مەڕەکانم بوون، و دواکاریەکانی من لای ئێوەیە، ئینجا بەوەیان کە فەرمان ڕەواییەکەی بەکەم و کوڕی ئەنجامداوە پێی دەفەرموێت: چی وای لێ کردیت بەوجۆرە ڕەفتاربکەیت؟ ئەویش دەڵێت: بۆ ئەوەی بەبەزەیی بم بۆیان . خوای گەورەش دەفەرموێت: ئایا تۆ بەبەزەیی تربوویت بۆ بەندەکانم لە من . ئینجا بەوەیان دەفەرموێت کە سنوری بەزاندوە و دەست درێژی کردووە: چی وای لێ کردیت بەو جۆرە ڕەفتار بکەیت؟ ئەویش دەڵێت: لە پێناوی تۆدا لێیان توڕەبووم. خوای گەورەش دەفەرموێت: ئایا تۆ توڕەتر بوویت لە من (واتە: من لە دونیادا لێیان توڕە نەبووم ئەی بۆ تۆ لێیان توڕە بوویت) پاشان خوای گەورە دەفەرموێت:بیان بەن گۆشەیەکی دۆزەخیان پێ پڕ بکەنەوە.

---

[٨٥] اخرجه: أحمد (٢٣٢٨٣) وقال محققه: اسناده حسن.

[٨٦] اخرجه: ابن ابي الدنيا((الأهوال))(٢٤١)، وقال الشيخ الارناؤوط في تحققيه لـ((نهاية البداية))(ص:٣٠٤)حديث حسن

# زیاد کردنی پاداشتی کردەوە چاکەکان

**یەکەم: پاداشتی یادکردنی خوا.**

**ئەبو دەرداء (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((ألا أُنبِئُكم بِخَيرِ أعْمالِكُم، و أزكاها [و أرضاها] [87]) عِندَ مَليكِكُم، و أرفَعها في دَرَجاتِكَم، و خيرٍ لَكم مِنْ إنفاقِ الذَّهبِ و الورقِ، و خيرٍ لَكُم مِنْ أنْ تَلقُوا عَدُوكُم فَتَضرِبوا أعناقَهُم و يَضرِبوا أعناقَكُم ؟ قالوا: بلى، قال: ذِكرُ الله))[88] **واتە: (ئایا پێتان ڕابگەیەنم بەچاکترین کردەوەکانتان و پاکترینیان (وڕازی ترینیان) لای پەروەردگارتان، و بەرزترینیان لەپلەکانتان چاکترە بۆتان لەبەخشینی ئاڵتون وزیو، وچاکترە بۆتان لەوەی کە ڕوو بەڕووی دوژمنتان ببنەوە و لەگەردنیان بدەن و لەگەردنتان بدەن؟ فەرموویان: (واتە: هاوەڵەکان): بەڵێ، فەرمووی: یادکردنی خوا) .**

**پیاوانی کۆڕی یادکردنەوەی خوای پەروەردگار پیاوانی ڕێزدارن لای پەروەردگار لە ڕۆژی کۆتاییدا، لە فەرموودەیەکی (ضعیف) دا هاتووە ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((يَقولُ اللهُ –عز و جل– (سَيَعلَمُ أهل الجمع من أهل الكرم) فقيل: و من أهل الكرم يا رسول الله؟ قال: (مجالس الذكر في المساجد)[89]**، واتە: (خوای پەروەردگار لەڕۆژی کۆتاییدا دەفەرموێت: خەڵکی مەحشەر ئێستا دەزانن کێ ڕێز لێ گیراوانن. وترا: خەڵکانی ڕێز لێ گیراو کێن ئەی پێغەمبەری خوا ؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: ئەوانەن بەشداربوون لە (کۆڕی یادکردنەوە لەمزگەوتەکان) . چاکترین کردەوە لای خوای پەروەردگار لەڕۆژی کۆتاییدا**

---

[87] في رواية ابن ماجة .

[88] أخرجه: أحمد (١٩٥/٥)، (٤٤٧/٦) بإسنادٍ حسن كما قال المنذري في (الترغيب )كما في ((تهذيب الترغيب)) (١٤٤٧) ، و الترمذي (٣٣٧٧)، و ابن ماجة (٣٧٩٠)، و الحاكم (٤١٦/١) وصححه و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٣٩/٣)، و في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٥٧)، و ((الكلم الطيب))(١)، و في ((المشكاة)) (٢٢٦٩)، و في ((صحيح الجامع)) (٢٦٢٩) .

[89] أخرجه: أحمد (٦٨/٣-٧٦)، والبيهقي في ((الشعب)) (٥٣٥)، و قال الهيثمي ((المجمع)) (٧٦/١٠): رواه احمد بإسنادين و أحدهما حسن، وضعفه الشيخ الالباني في ((ضعيف الترغيب)) (٩١٤) و اوردناه للعلم فقط .

یادکردنەوەی خوای پەروەردگارە لە بەیانیان و ئێواران: وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((مَنْ قالَ حينَ يُصْبِحُ و حينَ يُمسي: سبحان الله و بحَمده مائة مرَّة، لَمْ يأتِ أحدٌ يوم القيامة بأفضلِ مِمَّا جاء بِهِ إلاَّ أحَدٌ قال مثل ما قال أو زاد عليهِ))[٩٠] واتە: (هەرکەسێك بەیانی و ئێوارەی بەسەر داهات بڵێت:(سبحان الله وبحمده) سەد جار، هیچ کەسێ لەرۆژی کۆتاییدا نایەت بەکردەوەیەك کە چاکتر بێت لەو کارە تەنها یەکێك نەبێت وەك ئەوی وتوە یاخود لەئەو زیاتری وتوە ).

**دووەم: شەونوێژ و سوپاس کردنی پەوەردگار:**

عوقبەی کوڕی عامر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((.. يُجْمَعُ الناسُ في صعيدٍ واحدٍ، يَنفِذُهم البَصَر، ويُسمِعُهم الداعي، فَيُنادي مُنادٍ، سَيَعلَمُ أهلُ الجمعِ لِمَنْ الكرَم اليوم (ثلاث مرَّات)، ثُمَّ يَقول: أينَ الذين كانَتْ تَتجافَى جُنوبُهم عنْ المضاجِعِ، ثُمَّ يَقولُ: أين الذين كانوا لا تُلهيهم تِجارةٌ ولا بيعٌ عنْ ذِكرِ اللهِ، ثُمَّ يُنادِ منادٍ: أينَ الحَمادونَ الذين يحمدونَ ربَّهُم))[٩١] واتە: (..... خەڵکان کۆدەکرێنەوە لە جێگەیەکدا چاو هەموویان دەبینێت و بانگەوازکاریش دەنگی دەگاتە گوێیان، ئینجا بانگەوازکارێك بانگ دەکات: خەڵکی مەحشەر ئەمڕۆ دەزانن ڕێز بۆ کێیە (سێ جار)، پاشان دەڵێت: لە کوێن ئەوانەی لە جێگە خەوتنەکانیان هەڵدەستان و شەونوێژیان دەکرد، ئینجا دەڵێت: لەکوێن ئەوانەی کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن یادی خوای لەبیر نەبردوونەتەوە، ئینجا بانگارێك بانگ دەکات، لەکوێن ئەو سوپاسکارانەی کە سوپاسی پەروەردگاری خۆیان دەکرد) سوپاسکاران یەکێکن لە چاکترین بەندەکانی خوای گەورە لەرۆژی کۆتاییدا، وەك عیمرانی کوڕی حەصین (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە

[٩٠] أخرجه: مسلم (٦٧٨٤)، و الترمذي (٣٤٦٩)، و قال: حسن صحيح غريب، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٧٦٢)، و في ((صحيح الترغيب)) (٦٥٠). و إن الله تعالى يجازي عباده الصالحين على حسناتهم، ويعطى آلاف الحسنات على الحسنة الواحدة التي عملها العبد في الدنيا، فعن ابي هريرة ﷺ مرفوعاً: ((إن الله عز وجل يعطيهِ أي (يُعطي عبده بالحسنة الواحدة) ألفي ألف حسنة)) ثم تلا أبوهريرة: ﴿ إنْ تَكُ حسنة يضاعفها و يُؤتِ مِنْ لَدنهُ أجراً عظيماً﴾ فقال: إذا قال الله تعالى عز وجل ﴿أجراً عظيماً﴾ فمن يقدر قدره . رواه أحمد (٥٢١-٥٢٢) بإسناد جيد . كما قال الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (١٠/١٤٥)، وأخرجه: البزار (٣٢٥٩) .

[٩١] أخرجه: الحاكم (٢/٣٩٨) وصححه و وافقه الذهبي، وابن ابي الدنيا (الاهوال) (٢١٤)، وقال السيوطي في ((البدور السافرة)) (٥٦٢):اسناده حسن .

پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ أفضَلَ عبادِ اللهِ الحَمَّادونَ ...))[٩٢] واتە: (چاکترین بەندەکانی خوا سوپاسکارانن........).

**سێیەم: خاوەنی زانست (بەتایبەتی زانستە شەرعیەکان).**

خوای پەروەردگار پلەی زانایانی ئیسلام زۆر بەرز دەکاتەوە وکارە چاکەکانیان زۆر بۆ زیاد دەکات چونکە زانایان هەڵگری پەیامی پێغەمبەرانن وەك ئەبو دەرداء(رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:((... إنَّ العُلَماءَ وَرَثَةُ الأنبياءِ..))[٩٣] واتە: ( .... زانایان میراتگری پێغەمبەرانن....).

خوای پەروەردگار (تبارك وتعالى) پلەی بڕواداران و زانایان بەرز دەکاتەوە و هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:﴿ .....يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ..... ﴾ (المجادلة: ١١) ئیبنو عەباس (رضي الله عنه) لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: (قال: يرفع الله الذين أوتوا العلم مِنَ المؤمنينَ على الذينَ لم يأتوا العِلمَ درجات و ذلك لأن فَضلَ العالِمِ عند الله تعالى على العابِدِ كفَضلِ النبي (ﷺ) لأدنى رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِهِ))، واتە: (خوای گەورە پلەی زانایانی بڕوادار چەندین جار بەرز دەکاتەوە بەسەر ئەوانەی کە هەوڵ نادەن بۆ بەدەست هێنانی زانست، وتەکەی ئیبنو عەباس (رضي الله عنه) زۆر لە جێگەی خۆیدایە چونکە پلەی زانایەکی موسوڵمان بەرامبەر خواناسێك (العابد) لای خوای گەورە وەك پلەی پێغەمبەر وایە بەرامبەر بچوکترین کەسی موسوڵمان لە ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) )، وەك ئەبو ئومامە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((فَضْلُ العالِمِ على العابِدِ كفَضلي على أدناكُمْ..))[٩٤] واتە: (پلەی زانا بەبەراورد لەگەڵ خواناس وەك پلەی من وایە بەبەراورد لەگەڵ بچوکترین کەسی ئێوەدا).

---

[٩٢] أخرجه: أحمد (٤/٤٣٤)، والطبراني ((الكبير)) ١٨/(٢٥٤)، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٥٨٤).

[٩٣] أخرجه: الترمذي (٢٦٨٢)، وابن ماجة (٢٢٣)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٨٢)، وفي ((صحيح الترغيب)) (٦٨).

[٩٤] أخرجه: الترمذي (٢٦٨٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٧٨).

**چوارەم: پاڕانەوە لەخوا .**

**خوای گەورە داوای لەبەندەکانی کردووە کە لێی بپاڕێنەوەو داوای لێ بکەن و بەڵێنی داوە داواکاریەکانیان جێبەجێ بکات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ....... ﴾ (غافر: ٦٠)، وە خوای گەورە پاداشتی پاڕانەوە یەکجار زۆر دەکات لە ڕۆژی کۆتاییدا چونکە هیچ بەندایەتیەك نی یە بەڕێزتر بێت لەپاڕانەوە وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لَيسَ شيءٌ أكرمَ على اللهِ مِنَ الدُعاءِ))[٩٥] واتە: (هیچ شتێك نی یە لای خوا بەڕێزتر بێت لە پاڕانەوە).**

**خوای گەورە پاداشتی پاڕانەوەی ئەو بەندانەی کە لەدونیادا بۆی جێبەجێ نەکردوون لەڕۆژی کۆتاییدا بۆیان جێبەجێ دەکات و پاداشتەکانیان یەکجار زۆر دەکات، ئەبی سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرمویەتی: ((ما مِنْ مُسلِمٍ يدعوا اللهَ بِدعوةٍ لَيسَ فيها إثمٌ وَ لا قَطيعةُ رَحمٍ، إلاّ أعطاهُ اللهُ بها إحدى ثلاثٍ: إما أنْ يَستَجيبَ [في رواية: يُعَجِّل] له دَعوَتَهُ أو يَصرِف عنهُ منَ السوءِ مثلِها، أو أنْ يَدَّخِرَها في الآخِرة [منَ الخيرِ مثلَها]))[٩٦] واتە: ( هەر موسوڵمانێك بپاڕێتەوە لە خوا بەهەر پاڕانەوەیەك کە تاوان و پەیوەندی خزمایەتی پچڕانی تێدا نەبێت ئەو کەسە خوای گەورە یەکێك لەو سێ شتەی پێ دەبەخشێت، یان ئەوەتا پاڕانەوەکەی بۆ جێبەجێ دەکات یاخود ئەوەندەی پاڕانەوەکەی خراپەی لەسەر لادەبات (واتە: بەڵاو موسیبەت)، یان ئەوەتا ئەوەندەی پاڕانەوەکەی چاکەی بۆ کەڵەکە دەکات لە ڕۆژی کۆتاییدا) .**

---

[٩٥] أخرجه: الترمذي (٣٣٧٠) و قال حديثٌ حسن، وابن ماجة (٣٨٢٩)، و حسَّنهُ الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٨٧)، و في ((المشكاة)) (٢٣٢) التحقيق الثاني .

[٩٦] أخرجه: أحمد (١٨/٣)، والبزار (٣١٤٣)، و ابو يعلى (١٠١٩)، وقال المنذري في ((الترغيب)): أخرجه أحمد و البزار و أبو يعلى بأسانيد جيدة: كما في ((تهذيب الترغيب)) (١٥٨٩)، وأبو نعيم الأصفهاني ((حلية الأولياء)) (٣١١/٦)، و البخاري ((الأدب المفرد)) (٧١٠)، و الحاكم (٤٩٣/١) و صححه و وافقه الذهبي و اللفظ له، و صححه الشيخ الألباني ((صحيح الأدب المفرد)) (٥٤٧)، و ((مختصر العلو)) (ص: ٢٩٢)، و قال الشيخ الأرناؤوط ((شرح العقيدة الطحاوية)) (ص: ٦٨٢): إسناده صحيح .

**پێنجەم: دامرکاندنەوەی فیتنەو کۆمەڵی سەرلێ شێواوەکان.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بەشەڕ کردن (جەنگاندن) بەرامبەر خەواریج دەفەرموێت: وەك ئیمامی عەلی (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((.. فأينَما لَقيتُمُوهُم فاقْتُلُوهم فإنَّ في قَتْلِهِم أجراً لِمَن قَتَلَهُم يومَ القِيامةِ))[٩٧] واتە: (... لە هەر شوێنێك پێیان گەیشتن بیان کوژن چونکە لە کوشتنیاندا پاداشت هەیە بۆ ئەوەی کەدەیانکوژێت لەڕۆژی کۆتاییدا) .

**شەشەم: خێر کردن لە پارەی حەلاڵ.**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ما تَصَدَّقَ عَبدٌ بصَدَقةٍ مِنْ كَسبٍ طيِّبٍ ولا يَقبَلُ اللهُ إلاَّ طيِّباً ولا يَصعَدُ إلى السَّماء إلاَّ الطيِّبُ إلاَّ كأنَّما يَضَعُها في يَدِ الرَّحمانِ فَيُرَبِّيها لَهُ كَما يُرَبِّي أحدكُم فَلُوَّهُ و فَصيلَهُ (أي: الفَطيمَ الرَضيعَ مِنَ البَهائِمِ) حتَّى إنَّ التَمرةَ لَتأتي يومَ القِيامةِ مِثلَ الجَبلِ العَظيم))[٩٨] واتە: ( بەندەیەك هەر خێرێك بكات لەكاسپی یەكی پاكەوە، خوای گەورە تەنها پاك نەبێت وەری ناگرێت وە بەرز نابێتەوە بۆ ئاسمان (بەڵام ئەو خێرەی کەلە پارەی حەلاڵ دەکرێت) وەك ئەوە وایە کە بیخاتە دەستی خوای گەورە وە خوا بۆی پەروەردە دەكات وەك چۆن یەکێك لە ئێوە ئاژەڵێکی لەشیر براوە پەروەردە دەکات، هەتا خورمایەك دێت لەڕۆژی کۆتاییدا بەوێنەی شاخێکی گەورە) .

**حەوتەم: بەڵاداران.**

جابر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يَودُّ أهلُ العافيةِ يومَ القيامةِ حين يُعطَى أهلُ البلاءِ الثَوابَ لو أنَّ جلُودَهُم كانَت قُرِضَتْ بالمقاريضِ))[٩٩] واتە: (کەسانی بەختەوەر لە دونیادا لە ڕۆژی کۆتاییدا کاتێك بەڵاداران پاداشتیان دەدرێتەوە، ئەوان ئەو کاتە خۆزگە دەخوازن کە پێستەکانیان کەرت کەرت ببوایە بەمقاش (واتە: لەدونیادا)). کەواتە ئەو بەختەوەرانەی کە تووشی بەڵا نەهاتوون

---

[٩٧] أخرجه: البخاري (٣٦١١)، و مسلم (١٠٦٦)، وابن حبان (٦٧٣٩)، و النسائي ((السنن الكبرى)) (٣٥٦٥) .

[٩٨] أخرجه: أحمد (٤١٨/٢)، و مسلم (١٠٦٦)، وابن حبان (٢٧٠) و قال محققه: إسناده صحيح .

[٩٩] أخرجه: الترمذي (٢٤٠٢) و قال: حديث غريب، و حسَّنَهُ الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٦٠)، و في ((المشكاة)) (١٥٧٠) .

لەژیانی دونیادا کاتێك کە دەبینن خاوەن باوەڕە بەلادارەکان کە لەدونیادا خۆشییان بەخۆیانەوە نەدیوە چ پاداشتێکی گەورەیان لەسەر ئەو ناخۆشیانە دەدرێتی ئەو کاتە خۆزگە دەخوازن ئەوانیش بەلادار بوونایە و پارچە پارچە گۆشتی لەشیان لێ بکرایەتەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش ئەو پاداشتانەیان دەست بکەوتایە.

خوای گەورە هیچ چاکەیەکی خاوەن باوەڕان ون ناکات و لەسەری پاداشتی گەورەیان دەداتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا وەك ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ راحَ رَوحةً في سبيلِ اللهِ، كان لَهُ بِمثلِ ما أصابَهُ مِنَ الغُبارِ مِسكاً يومَ القيامةِ))[١٠٠] واتە: ( هەرکەسێك شەو ڕەوییەك بکات لەپێناوی خوادا بەئەندازەی ئەو تەپوتۆزەی کە پێوەی دەنیشێت میسکی دەدرێتێ لەڕۆژی کۆتاییدا).

بەلام بێ باوەڕ ئەگەر کاری چاکە بکات تەنها هەر لەدونیادا پاداشتی دەدرێتەوە و لەڕۆژی کۆتاییدا دۆزەخ دەبێت بە جێگەی و کردەوەکانی پوچ دەکرێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (هـود: ١٥ - ١٦) ، ئـەم ڕاستـیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بەجوانی ڕوونی کردۆتەوە وەك ئەنەس کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی ((إنَّ اللهَ لا يَظلِمُ المُؤمِنَ حَسَنَتَهُ يُثابُ عَلَيها الرِّزقَ في الدُنيا، وَيَجزي بِها في الآخِرةِ، فأمَّا الكافِرُ فَيُطعَمُ بِحَسَناتِهِ في الدُنيا، فإذا أفضَى إلى الآخِرةِ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنةٌ يُعطى بِها خيراً))[١٠١] واتە: (خوای گەورە ستەم ناکات لەخاوەن باوەڕ چاکەکردنەکەی پاداشتی بەڕزق و ڕۆزی دەداتەوە لە دونیادا، و پاداشتی تری دەداتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا، بەلام بێ باوەڕ پاداشتی دەدرێتەوە لەسەر چاکەکردنەکانی تەنها لەدونیادا، ئەگەر بگاتە ڕۆژی کۆتایی هیچ چاکەیەکی نابێت لەوێ کە پاداشتی لەسەر بدرێتەوە).

---

(١٠٠) أخرجه: ابن ماجة (٢٧٧٥)، وحسَّنَهُ الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٢٣٩)، و((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٣٨) .

(١٠١) أخرجه أحمد (١٢٣/٣)، ومسلم (٢٨٠٨)، وابن حبان (٣٧٧) و قال محققه: إسناده صحيح على شرطهما

# پرسیاركردن

لەڕۆژی كۆتاییدا خوای گەورە ڕاستەوخۆ پرسیار لە بەندەكانی دەكات لەسەر كارەكانیان كە لە دونیادا كردوویانە بەبێ بوونی یەكێك كە قسەكان وەربگێرێت (ترجمە)بكات، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((ما مِنكُم مِنْ رَجُلٍ إلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ يومَ القِيامَةِ لَيسَ بَينَهُ و بَينَهُ تَرجُمان [ولا حجابٌ يحْجبُهُ][102]))[103] واتە: (هەر یەكێك لەئێوە پەروەردگار لەڕۆژی كۆتاییدا قسەی لەگەڵدا دەكات و لەنێوانیاندا وەرگێڕێك نی یە (و دەرگاوانێك نی یە كە ڕێگەی لێ بگرێ) .

## ئەو شتانەی كە بەندەكان پرسیاریان لەبارەیەوە لێ دەكرێت

**یەكەم: بێ باوەڕی و هاوتا دانان بۆ خوا.**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ (القصص: ٦٢ )، واتە: (ئەو ڕۆژەی كە بانگیان لێ دەكات و پێی یان دەفەرموێت: لەكوێن ئەو هاوتایانەم كە ئێوە بڕیارتان بۆ دابووم) . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ ۗ تَٱللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴾ (النحل: ٥٦) واتە: ﴿هەندێك لەڕۆزیەكانیان بڕیاردەدا بۆ نەفام وبتەكانیان سوێند بەخوا پرسیارتان لێ دەكرێت دەربارەی ئەو درۆ و پڕوپاگەندانەی هەڵتان دەبەست﴾ .

**دووەم: لێ پێچینەوەی بەندەكان لەسەر گوێ ڕایەڵی كردنیان بۆ پێغەمبەرانیان .**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ (القصص: ٦٥)، واتە: ﴿لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بانگیان لێ دەكات و دەفەرموێت: تا چەندە وەڵامی پێغەمبەرانتان دایەوە و گوێڕایەڵیان بوون ﴾

---

[102] في رواية .

[103] أخرجه: البخاري( ٤ /٢٢٤٢) رقم (٦٥٣٥)، والترمذي (٢٤١٠) و قال: حسن صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٦٨) .

**سێیەم: پرسیار لەخەڵکان دەکرێت لەوانەی کەپەرستوویانە و پرسیار لەپەرستراوەکانیش دەکرێت:**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴾ (الفرقان: ١٧ – ١٨)، واتە: ﴿لەو ڕۆژەدا خۆیان و ئەوانەی کە پەرستوویانە جگە لە خوا کۆدەکرێنەوە، خوای گەورە بەو پەرستراوانە دەفەرموێت:ئایا ئێوە ئەم بەندانەی منتان گومڕا وسەرلێشێواو کرد یان ئەوان خۆیان گومڕا و سەرلێشێواو بوون لە وەڵامدا دەڵێن: پاکی شایستەی تۆیە ئەی خوای پەروەردگار ئێمە کەی ئەوە بووین کە بکرێینە هاوتاو بپەرسترێین بەڵام ئەوان و باوکانیان ئەوەندە نیعمەتت پێدان تا ئاینەکەی تۆیان لەبیر کرد ئەوان خۆیان کەسانێکی لەناوچووبوون﴾ .

**چوارەم: هەموو خەڵکی پرسیاریان لێ دەکرێت سەبارەت بەکردەوەکانیان .**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ (الحجر: ٩٢ – ٩٣) .واتە: ﴿سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەکەین سەبارەت بە کردەوەکانیان ﴾.

**پێنجەم: پرسیار لەخەڵکان دەکرێت سەبارەت بەپەیمانەکانیان کە داویانە بە خوای گەورە دەفەرموێت:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ .....وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴾ (الأحزاب: ١٥) واتە: ﴿بێگومان بەڵێنێك بەخوا بدرێت لێی پرسینەوەی لەسەر دەکرێت﴾. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ .....وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء: ٣٤)،واتە: ﴿پەیمانەکانتان بەرنەسەر لەبەر ئەوەی بەرپرسیار دەبن لێیان﴾.

**شەشەم: پرسیار سەبارەت بە نیعمەتەکانی گوێ و چاو و دڵ دەکرێت .**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴾ (الإسراء: ٣٦) واتە: ﴿خوای گەورە پرسیار لەو شتانە دەکات کە خەڵکان گوێیان لێی بووە و ئەو شتانەی کە چاویان لێ بووە و ئەو شتانەی کە پەیوەندی بەدڵەوە هەیە (واتە: لێ پێچینەوە سەبارەت بە چۆنیەتی بەکارهێنانی چاو و گوێ و دڵ دەکرێت)﴾.

**حەوتەم: پرسیار دەکرێت لەسەر نیعمەتەکانی خوا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ (التكاثر: ٨ ) واتە: ﴿لەو ڕۆژەدا هەمووتان لێ پێچینەوەتان لەگەڵ دەکرێت سەبارەت بەو نیعمەتانەی کە پێتان بەخشرابوو﴾ .

**هەشتەم: پرسیار لە فەرمانڕەواکان دەکرێت سەبارەت بەژێر دەستەکانیان:**

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴾ (الصافات: ٢٤) واتە:﴿ئەو فەرمانڕەوایانە بوەستێنن و لێ پێچینەوەیان لەگەڵدا بکەن ئەوانە کاربەدەستانی خەڵکی بوون﴾، ئیبنو عومەر (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((كُلُّكُمْ راعٍ، و كُلُّكُم مَسؤولٌ عَن رَعيَتِهِ، فَالإمامُ راعٍ وَهوَ مَسؤولٌ عَن رَعيَتِهِ، وَ الرَجُلُ راعٍ في أهْلِهِ وَهوَ مَسؤولٌ عنْ رَعيَتِهِ، والمَرأةُ راعِيةٌ في بَيتِ زَوجِها وَ هي مَسؤولةٌ عَن رَعيَتِها، وَ الخادِمُ راعٍ في مالِ سَيِّدِهِ وَهوَ مَسؤولٌ عَنْ رَعيَتِهِ، وَالرَجُلُ راعٍ في مالِ أبيهِ وهوَ مَسؤولٌ عَن رَعيَتِهِ، فَكُلُّكُم راعٍ وكُلُّكُم مَسؤولٌ عَنْ رَعيَتِهِ))[١٠٤] واتە: (هەموو یەکێك لەئێوە، سەرۆك و شوانەوە و هەموو یەکێك لەئێوە بەرپرسیارە لەژێر دەستەکانی پیاو شوانە بەرامبەر بەخێزانی وە بەرپرسیاریشە لە ژێر دەستەکەی، و ئافرەتیش شوانە لەماڵی مێردەکەیدا و بەرپرسیارە لەژێر دەستەکانی، وە خزمەت کار شوانە لەسامانی خاوەنەکەیدا، ئەویش بەرپرسیارە لەوەی کە لەژێر دەستی دایە وە پیاویش شوانە لەپارەی باوکی و بەرپرسیارە لەوەی کەلەژێر دەستی دایە، کەوابوو هەمووتان شوانن و هەمووشتان بەرپرسیارن لەوانەی لەژێر دەستتاندایە).

---

(١٠٤) أخرجه: أحمد (٥/٢)، والبخاري (٣١٧/٢)، ومسلم (١٨٢٩) .

وە لەڕیوایەتێکی تردا ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ اللهَ سائِلٌ كلَ راعٍ عَمَّا استَرعاهُ أ حَفِظَ أم ضَيَّعَ))[105] واتە: (خوای گەورە پرسیار لە هەموو شوانێك دەکات سەبارەت بەوەی کە لەژێر دەستی دابووە ئایا پاراستوویەتی یان بەرەڵای کردووە) .

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((لايسترعي الله تبارك وتعالى عبداً رعية قلّتْ أو كَثُرت الاّ سألهُ الله تبارك وتعالى عنها يوم القيامة، أقام فيهم أمر الله تبارك و تعالى أم أضاعه ؟ حتى يسأله عن أهل بيته خاصةً))[106] .واتە: (خوای گەورە هەرکەسانێك ژمارەیان کەم بێت یان زۆر بیانخاتە ژێر دەستەڵاتی بەندەیەکی لێ پێچینەوە لەگەڵ ئەو بەندەیەیدا دەکات ئایا فەرمان وئاینی خوای لە ناویاندا جێگیرکرد یان نا، هەتا لێ پێچینەوەی بنەماڵە و خێزانەکەی خۆی بەتایبەتی لەگەڵدا دەکات).

**نۆیەم: پرسیار لە ژێر دەستەکان دەکرێت سەبارەت بە جێبەجێ کردنی فەرمانی فەرمان ڕەواکانیان.**

میقدام (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أطيعوا أمرائكم مهما كان فإن أمروكم بشيء مما لم آتكم به فهو عليهم و أنتم مه براء ذلكم بأنكم إذا لقيتم ربكم قلتم: ربنا لا ظلم، فيقولون: ربنا ارسلت إلينا رسلا فأطعناهم، و إستخلفت علينا خلفاء فأطعناهم و أمرت علينا أمراء فأطعناهم فيقول: صدقتم هو عليهم و أنتم منه براء))[107] واتە: (فەرمانی فەرمان ڕەواکانتان جێبەجێ بکەن بە هەر شێوەیەك بێت ئەگەر فەرمانتان پێ بکەن بە شتێك من پێم نەگەیاندبن ئەوە تاواناکەی دەکەوێتە سەر ئەوان و ئێوە بەری دەبن لێی چونکە کاتێك کە دەچنە بەردەم پەروەردگار دەڵێن: خوای گەورە ستەممان لەسەر نی یە. پێغەمبەرت بۆ ناردین وفەرمانی ئەومان جێ بەجێ کرد، فەرمان ڕەوات بۆ دانایین ئێمە فەرمانی ئەویشمان جێ بەجێ کرد خوای گەورەش دەفەرموێت: ڕاست دەکەن تاوانەکە لەسەر ئەوانە و ئێوە لێی بەرین ) .

---

[105] أخرجه: ابن حبان (٤٤٩٢) و قال محققه: إسناده صحيح على شرطهما .

[106] أخرجه: أحمد (٤٦٣٧) وقال محققه:حديث صحيح.

[107] أخرجه: الطبراني في: ((الكبير)) (٢٠/٢٧٨)، و إبن أبي عاصم في ((السنة)) (١٠٨٢) و قال محققه: حديث صحيح .

# ئەو نیعمەتانە کە بەندەکان لەسەری پرسیاریان لێ دەکرێتەوە لەڕۆژی کۆتاییدا

خوای گەورە ومیهرەبان پرسیار لەبەندەکانی دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا لەسەر ئەم نیعمەتانەی خوارەوە:

**یەکەم: لەش ساغی و ئاوی سارد.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّ أولَ ما يُسألُ [يُحاسَبُ][١٠٨] بِهِ العَبدُ يَوم القِيامَةِ مِن النَّعيمِ أنْ يُقالَ لَهُ: ألَم أُصَححْ [أصِح][١٠٩] لَكَ جِسْمَك و أُروكَ مِنَ الْمَاءِ البـارِد))[١١٠] واتـه: (یەکـەم شـتێك کـە بەنـدەکان لـەڕۆژی کۆتاییـدا پرسـیاریان لـێ دەکرێـت (ولـێ پرسینەوەیان لەسەر دەکرێت) لەنیعمەتەکان ئەوەیە کە پێی دەوترێت: ئایا جەستە و لاشەی ساغم پێ نەبەخشیت و تێر ئاوم نەکردیت لەئاوی سارد) .

**دووەم: نیعمەتی ناردنی پێغەمبەران .**

عودەی کوڕی حاتەم (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویـەتی: ((... لَيَقِفَنَّ أحَدُكُم بَينَ يدَي اللهِ، لَيسَ بَينَهُ و بَينَهُ حِجابٌ يَحجبُهُ ولا تَرجَمانٌ يُترجَمُ لَـهُ، فَيقـولَنَّ لَهُ: ألَمْ أوتِكَ مالاً فيقولَن: بلى، فَيَقولُ: ألَمْ أرسِلْ إليـك رسـولاً؟ فَيقـولنَ: بلـى ...))[١١١] واتـه: (...یەك لەئێوە ڕادەوەستێنرێت لەبەردەم خوادا هیچ پەردەیەك نی یە لـە نێوان خواو ئەودا و هیچ تەرجەمەکارێك نی یە تا تەرجەمەی بۆ بکات پێی دەڵێت (واتە: خوای گەورە ): ئایا سامانم پێ نەبەخشیت؟ دەڵێت: بەڵێ، پێی دەڵێت: ئایا نێردراوم بۆ لات نەنارد؟ دەڵێت: بەڵێ.......) .

---

[١٠٨] في رواية .

[١٠٩] في رواية .

[١١٠] أخرجه: الترمذي (٣٣٥٨) و قال: حديث غريب، والحاكم (١٣٨/٤) وصححه و وافقه الذهبي، وابن حبان (٧٣٦٤) و قال محققه: حديث صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٧٦٤) و في ((السلسلة الصحيحة)) (٥٣٩)، وفي المشكاة (٥١٩٦)، و اللفظ لأبن حبان .

[١١١] أخرجه: ابن حبان (٧٣٧٤) و قال محققه: حديث صحيح .

عەبدوڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەفەرموێت: ((والله ما منكم من احدّ الا سيخلوبه ربه كما يخلو احدكم بالقمر ليلة البدر ثم يقول: يا ابن آدم ماغرك بي؟ يا ابن آدم ماغرّك بي؟ يا ابن آدم ماغرّك بي ؟ يا ابن آدم ماذا عملت فيما علمت يا ابن آدم ماذا اجبت المرسلين))[١١٢] .
واتە: (سوێند بەخوا هەموو یەکێك لە ئێوە بەتەنها دەگات بەخوای گەورە وەك چۆن دەگات بە مانگ لەشەوی چواردەدا، پاشان خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد چی تۆی هەڵخەڵەتاند (سێ جار) و تۆی لە من دوور خستەوە؟ ئەی ئادەمیزاد چیت ئەنجامدا بەو زانیارییەی کە دەتزانی؟ ئەی ئادەمیزاد تا چەند وەڵامی پێغەمبەرانت دایەوە؟

**سێیەم: نیعمەتی سەروەری، ڕێز لێگرتن و، ژن هێنان، و ژێر دەستەکردنی ئاژەڵان.**

ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...فَيَلقى (أي الرَبّ جلّ وَ عَلا) العبدَ، فَيَقولُ: أي فُل (يعني أي فلان) أَلَمْ أُكْرِمْكَ ؟، أَلَمْ أُسَوِّدْكَ؟، أَلَمْ أُزَوِّجْكَ؟، أَلَمْ أُسَخِّر لكَ الخيلَ و الإبلَ و أترُكك ترأس و تَربعُ؟، قال: فَيَقولُ: بَلى يا ربِّ، قال: أَ فَظَنَنتَ أنَّكَ مُلاقيَّ ؟ قال: لا يا رَب، قال: فاليَومَ أَنساكَ كَما نسيتَني...))[١١٣]
واتە: (..... دەگات بەبەندەکەی و پێی دەڵێت (واتە: خوای گەورە ): ئەی فلان کەس ئایا ڕێزم لێ نەگرتیت؟! ئایا نەم کردیت بە خاوەنی سەروەری، ئایا نەم کردیت بەخاوەن ژن؟ ئایا ئەسپ و وشترم بۆ ژێر دەستە نەکردیت ئایا تۆم نەکردە سەرۆك و خاوەن دەسەڵات؟! ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار،دەفەرموێت (واتە: خوای گەورە) ئایا گومانت وا بوو بەمن دەگەیت؟!دەڵێت نەخێر ئەی پەروەردگار، دەفەرموێت: ئەمڕۆ فەرامۆشت دەکەم وەك چۆن تۆ منت فەرامۆش کرد ..... ).

لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:: ((يقول الله عز وجل يوم القيامة: يا ابن آدمَ، حَمَلْتُكَ على الخَيلِ و الإبلِ، و زَوَّجتُكَ النساءَ، و جعلتُكَ تَربع، وترأسُ، فأينَ

---

[١١٢] أخرجه: ابو نعيم (١/١٣١)، و الطبراني (٨٩٠٠) وابن المبارك ((الزهد)) (٣٢) وقال محققه اسناده صحيح، و ابن عبد البر ((جامع بيان العلم)) (١٢٠٠) وقال محققه: اسناده حسن.

[١١٣] أخرجه: مسلم (٢٩٦٨)، وابن حبان (٤٦٤٢) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

شكرُ ذلِكَ))[١١٤] واتە: ( خوای گەورە لەڕۆژی كۆتاییدا دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد سواری سەرپشتی ئەسپ و وشترم نەكردیت ؟ئایا نەمكردیت بەخاوەن ژن؟ ئایا وام لێنەكردیت كەببیت بەخاوەن دەسەڵات و سەرۆك؟ كوا سوپاسی ئەو شتانە؟).

**چوارەم: نیعمەتی گوێ و چاو و نیعمەتی كشتوكاڵ .**

ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((يُؤتى بالعَبدِ يومَ القِيامةِ فَيَقولُ اللهُ لَهُ: أَلَم أجْعَل لَكَ سَمعاً و بَصَراً و سَخَّرتُ لَكَ الأنعامَ و الحَرثَ....))[١١٥] واتە: (بەندەیەك دەهێنرێت لەڕۆژی كۆتاییدا و خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا گوێ و چاوم پێ نەبەخشیت و ئاژەڵان وكشتوكاڵم بۆ ژێر دەستە نەكردیت؟....) .

**پێنجەم: نیعمەتی تەمەن، و ساغ و سەلامەتی ئەندامەكانی لاشە، و نیعمەتی گەنجیەتی و پارە و زانست .**

ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((لا تَزولُ قدَما ابنِ آدَمَ يومَ القِيامةِ مِنْ عِندَ رَبِّهِ حَتَّى يُسْئَلَ عَن خمسٍ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَ أفنَاهُ، وَ عَنْ شَبابِهِ فِيمَ أبلاهُ، و مالِهِ مِنْ أينَ إكتَسَبَهُ و فيمَ أنفَقَهُ، و ماذا عمِلَ فيما عَلِم [.. و عَنْ جِسمِهِ فِيمَ أبلاهُ][١١٦]))[١١٧] واتە: (هەردوو قاچی ئادەمیزاد لەڕۆژی كۆتاییدا ناتوانرێت لەلای پەروەردگاری خۆی جوڵەی پێبكرێت هەتا پرسیاری لێ نەكرێت لەپێنج شت: تەمەنی لەچیدا بردە سەر، وەگەنجیەتی لەچیدا بەكاری هێناوە، و پارەكەی لەكوێوە بەدەستی هێناوە و لەچیدا خەرجی كردووە (واتە: سەرفی كردووە)، وچ كردەوەیەكی كردووە

---

[١١٤] أخرجه: أحمد في: ((المسند)) رقم (١٠٣٧٨) و قال محققه شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم .

[١١٥] أخرجه: الترمذي (٢٤٢٨) و قال: حديث صحيح غريب، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٧٨).

[١١٦] أخرجه: الترمذي (٢٤١٧) و قال: حديث صحيح، وصححه الشيخ الألباني في: ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٧٠)، و في (( اقتضاء العلم)) رقم (١) .

[١١٧] أخرجه: الترمذي (٢٤١٦) و قال: حديث غريب . وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٦٩)، و في ((إقتضاء العلم)) (٢)، و في ((المشكاة)) (٥١٩٧) . و في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٤٦) .

بەو زانستەی کە زانیویەتی، (.......و جەستەی لەچیدا بەکارهێناوە).ئەبو دەردائیش (ﷺ) دەفەرموێت: ((ان اخوف ما اخاف اذا وقفت على الحساب ان يُقال لي قد علمت فماذا عملت فيما علمت))[118]. واتە: (ترسناکترین شت کە لێی دەترسم ئەوەیە کاتێك کە ڕادەوستم بۆ لێ پێچینەوە پێم بوترێت: تۆ زانیاریت هەبوو چەندە کارت بە زانیاریەکەت کرد؟).

**شەشەم: نیعمەتی منداڵ پێبەخشین .**

عودەی کوڕی حاتەم (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((... إنَّ أحَدَكُمْ لاقي الله عز وجل فقائِلٌ ما أقولُ: ألَمْ أجعلكَ سَميعاً بَصيراً، ألَمْ أجْعَل لَكَ مالاً و وَلَداً ...))[119] واتە: (... یەك لەئێوە دەگات بە خوای خۆی و پێی دەفەرموێت ئەوەی من دەیڵێم: ئایا وام لێ نەکردیت کە ببیستیت و ببینیت ؟ ئایا سامان و منداڵم پێ نەدایت ... ).

**حەوتەم: نیعمەتی هێنانی ژنی چاك:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((لَيَلقَيَنَّ أحَدُكُم رَبَّهُ يومَ القِيامةِ، فَيَقولُ لَهُ: ألَم أسخِر لَكَ الخَيلَ و الإبِلَ، ألَم أذركَ تَرأسُ و تَربع، ألَم أزوِّجكَ فُلانَة خَطبها الخُطّابُ فَمَنَعتُهُم))[120] واتە: ( یەك لەئێوە دەگات بەپەروەردگاری لەڕۆژی کۆتاییدا و پێی دەفەرموێت: ئایا ئەسپ و وشترم بۆ ژێر دەستە نەکردیت ؟ ئایا وام لێ نەکردیت کە خاوەن دەسەڵات و سەرۆك بیت ؟ ئایا فلان ئافرەتم نەکرد بە هاوسەرت داواکاران داوایان کرد نەمدا پێیان و لەوانم قەدەغەکرد ).

---

[118] أخرجه: ابو نعيم (١٣٦)، واحمد ((الزهد)) (١٣٦)، والاجري ((اخلاق العلماء)) (٥٠)، وابو داود ((الزهد)) (٢٦٠)، وابن المبارك ((الزهد)) (٣٣) وقال محققه: اسناده صحيح .

[119] أخرجه: ابن حبان (٧٣٦٥) و قال محققه: حديث صحيح .

[120] أخرجه: أحمد (٤٩٢/٢)، وابن حبان (٧٣٦٧) و قال محققه: حديث صحيح، وأخرج: البيهقي ((شعب الإيمان)) (٤٦١٠) عن عبدالله بن سلام (ﷺ) أنه قال: إن الله عز وجل لَيَعُدُّ على عَبدهِ نِعَمَهُ حَتَّى يَعُدُّ عليه فيما يَعُد، يَقولُ: (سالتني فُلانة أنْ أُزوِّجَكَها باسمِها فَزَوَّجتكَها) .

**هەشتەم: لێ پێچینەوەی ئادەمیزاد لەکەم و کوڕی کردنی سەبارەت بە فەرمان نەکردن بەچاکە و ڕێگە نەگرتن لەخراپە .**

**ئـەبو سـەعیدی خـودری (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویـەتی:** ((إنَّ اللهَ جلَّ و علا يَسألُ العَبدَ يومَ القيامةِ، حتَّى إنَّهُ لَيَقولُ لَهُ: ما مَنَعَكَ إذا رأَيتَ المُنكَرَ أنْ تُنكِرهُ ؟ فإذا لَقَّنَ اللهُ العَبدَ حُجَّتَهُ، قال: يا ربِّ وَثِقْتُ بِـكَ، و فَرِقْـتُ مِـنَ النـاسِ))[١٢١] **واتـە: (خـوای گـەورە پرسیار لەبەندە دەکات لەڕۆژی کۆتاییدا هـەتاکو دەفـەرموێت: چـی ڕێگـەی لـێ گرتیـت کـە خراپـەت بینی بـەرگریت نـەکرد ؟ کاتێـك خـوای گـەورە بەڵگەکەی خستە دڵی بەندەکەیـەوە دەڵێت: ئـەی پـەروەردگار متمانـەم پێت هـەبوو و لەخەڵکی دەترسام )، لەڕیوایەتێکدا بەم جۆرە هـاتووە** ((... قـال: يـا ربِّ رَجَوتُـكَ و خِفتُ النّاسَ))[١٢٢] **واتە: (......دەڵێت ئەی پـەروەردگار هیوام بەتۆ هـەبوو، و لەخـەڵکی دەترسام ).**

**نۆیەم: لێ پرسینەوەی بەندەکان سەبارەت بەکەم و کوڕی یان بەرامبەر یەکتری .**

**ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی:** ((إنَّ اللهَ عز و جل يَقولُ يومَ القيامةِ: يا ابن آدَمَ مَرِضْتُ فَلَم تَعُدني؟ قال: يـا ربِّ كيـفَ أعـودُكَ، و أنـتَ ربُّ العالمين ؟ قال: أمَا عَلِمتَ أنَّ عَبدي فلاناً مَرِضَ فَلَمْ تَعُدهُ، أما عَلِمتَ أنَّكَ لَو عُدتَـهُ لَوَجَـدتَني عِندَهُ، يا ابن آدَمَ استَطعَمتُكَ فَلَمْ تُطعِمني ؟ قال: يا ربِّ و كيـف أُطعِمُـكَ و أنـتَ ربُّ العـالمين ؟ قال: أما إنَّهُ استَطعَمَكَ عَبدي فلانٌ، فَلَمْ تُطعِمْهُ، أما عَلِمتَ أنَّكَ لَو أطْعَمتَهُ لَوَجَدتَ ذلِكَ عِنـدي، يا ابنَ آدَمَ: استَسْقَيتُكَ فَلَم تُسقِني ؟ قال: يـا ربِّ و كيـف أُسْـقيكَ و أنـتَ ربُّ العـالمين ؟ قـال: إستَسقاكَ عَبدي فُلانٌ فَلَم تُسْقِهِ أما إنَّكَ لـو سَـقَيتَهُ وَجَـدتَ ذلِـكَ عنـدي))[١٢٣] . **واتە:(خوای**

---

[١٢١] أخرجه: أحمد (٣/٧٧)، و الحميدي (٧٣٩)، و ابن ماجة (٤٢٤٤)، و قال البوصيري في ((مصباح الزجاجة)) (٣/٣٤٤) إسناده صحيح، و ابن حبان (٧٣٦٨) و قال محققه: إسناده قوي و رجاله ثقات، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع))(١٨١٨)، ((السلسلة الصحيحة)) (٩٢٩)، ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٤٠١٧) .

[١٢٢] أخرجه: أحمد في المسند (١١٢١٤) و قال محققه: شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن، و قد أخرجه أيضا: أبو يعلى (١٠٨٩)، و البيهقي ((شعب الإيمان)) (٧٥٧٥) .

[١٢٣] أخرجه: البخاري في ((الأدب المفرد)) (٥١٧)،و مسلم (٢٥٦٩)، و ابن حبان (٢٦٩) و قال محققه: إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٩١٦)، و في ((صحيح الأدب المفرد)) (٤٠٢) .

گەورە لەڕۆژی كۆتاییدا دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد نەخۆش كەوتم و سەر دانت نەكردم، دەڵێت: ئەی پەروەردگار چۆن سەردانم بكردیتایە و تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەكانیت؟ دەفەرموێت: ئەی نەتزانی كە بەندەكەم فلان كەس نەخۆش كەوت و سەردانت نەكرد؟ ئەی نەتزانی ئەگەر سەردانت بكردایە منت دەدۆزیەوە لای ئەو،ئەی ئادەمیزاد داوای خواردنم لێ كردیت و خواردنت نەدامێ ؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگار چۆن خواردنت بدەمێ و تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەكانیت ؟ دەفەرموێت: ئەی بەندەكەم فلان كەس داوای خواردنی لێ نەكردیت و خواردنت پێنەدا ئەی نەتزانی ئەگەر خواردنت پێ بدایە منت دەدۆزیەوە لای ئەو، ئەی ئادەمیزاد داوای ئاوی خواردنەوەم لێ كردیت و پێت نەدام ؟ دەڵێت: ئەی تۆ پەروەردگار چۆن ئاوی خواردنەوەت پێ بدەم و تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەكانی؟ فەرمووی: بەندەكەم فلانە كەس داوای ئاوی لێ كردیت پێت نەدا، ئەگەر پێت بدایە منت دەدۆزیەوە لای ئەو (واتە: پاداشتی ئەو كارەت پێدەبەخشرا لای من)).

لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: ((اسْتَقْرَضْتَ عبدي فَلَمْ يُقرِضني))[١٢٤] واتە: (داوای قەرزم لەبەندەكەم كرد و قەرزی پێنەدام بەڵگەش بۆ ئەم فەرموودەیە ئایەتەكەی خوای گەورە یەكەدەفەرموێت: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ .... ﴾ (البقرة: ٢٤٥) واتە: ﴿كێ یە ئەو كەسەی قەرز دەدات بە خوای گەورە بەقەرزێكی چاك (قەرزەكە لە سامانێكی حەڵاڵ بێت) ئەو كەسە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بە چەندین قات وە زیاتر﴾،

وە بەسەرهاتەكەی ئەبو دەحداح (ﷺ) ئەم ڕاستی یە جوانتر ڕوون دەكاتەوە: كە ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ( لَما نَزَلَت [مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا .... ] قال أبو دَحْداحِ الأنصاري: يا رسول الله، و إنَّ الله عز و جل يُريدُ مِنَّا القَرضَ ؟ قال: ((نَعم يا أبا دحداح)). قال أرِني يَدَكَ يا رسول الله، فَناولَهُ يَدهُ، فقالَ: فإنِّي قَدْ أقْرَضْتُ رَبِّي

---

[١٢٤] أخرجه: أحمد (٢/٣٠٠) رقم (١٠٥٧٨) و قال محققه: شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح إسناده حسن، و الحاكم (٤٩١/٢) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و قال أحمد شاكر في تحقيقه على ((المسند)) (٧٩٧٥): إسناده صحيح، عن أبي هريرة (ﷺ) مرفوعاً.

عز و جل حائِطِي [قال ابن مسعود: و كان حائِطةُ فيهِ ستمائة نخلة و أم الدحداحِ فيها و عيالها] قال فَجاءَ أبو الدحداح فَناداها: يا أم الدحداحِ !! قال: لَبيكَ، قال أُخرُجي فَقَد أقْرَضتهُ ربِّي عز و جل)[١٢٥]. واتە: کاتێك کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا.......﴾ ئەبو دەحداحی (ﷺ) ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە قەرزی دەوێ لێمان ؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەی ئەبو دەحداح). وتی دەستم نیشان بدە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی دایەو ئەبو دەحداح وتی: ئەوا من باخەخورماکەم دا بەقەرز بەخوای گەورە، (ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەڵێت: باخەکەی شەش سەد دار خورمای تیا بوو دایکی دەحداح و منداڵەکانی تێدا بوو)، ئەبو دەحداح چوو بۆلای باخەکەو بانگی کرد: هۆ ئوم و دەحداح، ئەویش وتی: ئەوا هاتم: ئەبو دەحداح وتی: لەباخەکە وەرە دەرەوە چونکە هەموویم دا بەقەرز بە خوای گەورە).

**دەهەم: نیعمەتی خواردنی چاك و خواردنەوەی فێنك.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((.. هذا و الذي نفسي بِيَدِهِ مِنَ النَعيمِ الذي تُسألونَ عنهُ: ظِلٌ بارِدٌ، و رَطبٌ طيبٌ، و ماءٌ بارِدٌ))[١٢٦] واتە:( ...سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە ئائەمە لەو نیعمەتانەیە کە لێ پێچینەوەتان لەبارەیەوە لێ دەکرێت:سێبەری فێنك و خورمای شیرین و چاك و ئاوێکی سارد).

**نۆیەم: نیعمەتی دڵ خۆشی و کامەرانی:**

یەساری کوڕی عەبدوڵای جوهەنی (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... طِيبُ النَفسِ مِنَ النَعيمِ))[١٢٧] واتە: .... دڵ خۆشی و کامەرانی لە

---

[١٢٥] أخرجه: ابن جرير ((التفسير)) (٥/٥٦٢)، والبزار (٩٤٤) ((كشف أستار))، البيهقي ((شعب الإيمان)) (٣٤٥٢)، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٩/٣٢٤): رواه أبو يعلى و رجاله ثقات رجال الصحيح، و صححه الشيخ الألباني في تخريج كتاب ((مشكلة الفقر)) (١٢٠) و أخرجه أيضاً: ابن الجوزي (( زاد المسير)) (١/٢٤٠)

[١٢٦] أخرجه: أحمد (٣/٣٣٨)، و أبوداود (٥١٢٨)، و الترمذي (٢٣٧٠)، و ابن ماجة (٣٧٤٥)، وصححه الشيخ الألباني في ((مختصر الشمائل المحمدية)) ((١١٣))، و في ((صحيح الجامع)) (٧٠٠١).

[١٢٧] أخرجه: أحمد (٥/٢٧٢)، و البخاري ((الأدب المفرد)) (٣٠١)، و ابن ماجة (٢١٤١)، و الحاكم (٢/٣)، و صححه و وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٧٤)، و في ((صحيح الأدب المفرد)) (٢٣١)، و في ((المشكاة))(٥٢٩٠) .

نیعمەتەکانی خوایە ، واتە: ( کامەرانیش یەکێکە لەو نیعمەتە گەورانەی کە خوای گەورە بەخشیویەتی بەئادەمیزادو لێ پرسینەوەی لەسەر دەکات ) .

کەواتە ئادەمیزاد نوقم و ڕۆچووە لە نیعمەتەکانی خوادا کە لە ژمارە نایەن، و خوای گەورە لەبەندەکەی دەپێچێتەوە سەبارەت بەو نیعمەتانە تەنها ئەو شتە پێویستیانە نەبێت کە پێویستن بۆ ژیانی ئادەمیزاد، وەك لەڕیوایەتەکەی ئەبو عوسەیبدا (ﷺ) هاتووە کاتێك کە عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو نیعمەتانەی کە خەڵکان لەڕۆژی دواییدا خوای گەورە لێ پێچینەوەیان لەسەر دەکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەڵامی دایەوە کە خەڵکان لە هەموو شتێك پرسیاریان لێ دەکرێت تەنها لەسێ شت نەبێت: ((... إلاَّ مِنْ ثلاث: خرقةٍ كفَّ بها عورته، أو كسرةٍ سدَّ بها جَوْعَتَهُ، أو جُحرٍ يدخِلُ فيه من الحرِّ و القّر))[١٢٨] واتە: .... (پارچە پەڕۆیەك کە عەورەتی پێ داپۆشی بێت و لەتە کولێرەیەك کە برسیێتی پێ ڕەواندبێتەوە، ولانەو جێگایەك کەلە تاو گەرما و سەرما چووبێتە ناوییەوە) .

## خوای پەروەرگار پرسیار لەئەندامەکانی لاشەی ئادەمیزاد دەکات سەبارەت بەو کردەوانەی کەکردویەتی

خوای پەروەردگار مۆر دەنێت بەسەر دەمی ئادامیزاددا و پرسیار لەئەندامەکانی لەشی دەکات سەبارەت بە کردەوەکانی کە پێی هەستاون لەدونیادا، خوای گەورە ئەندامەکانی لاشە بۆیە دێنێتە زمان چونکە ئادەمیزاد نکوڵی و ئینکاری لە کردەوەکانی دەکات، و هۆی نکوڵی کردنی لەکردەوەکانی ئەوەیە کە کاتێك بێ گومان دەبن لەوەی تەنها موسوڵمان نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە ئەو کاتە نکوڵی لە کردەوەکانیان دەکەن بۆ ئەوەی بچنە ڕیزی موسوڵمانانەوە .

---

[١٢٨] أخرجه: أحمد (٨١/٥)، البيهقي ((الشعب)) (٤٦٠١)، و قال الهيثمي ((المجمع)) (٢٦٧/١٠): رواه أحمد و رجاله ثقات، وقال الشيخ مقبل ((الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين)) (١٢٥٥): حديث حسن،وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٢٢١)، و في رواية ضعيفة: ((كلُّ شيءٍ فَضلٌ عن ابن آدَمَ من جلف الخبز، و ثوب يواري سوءتَهُ و بيتٌ يَسكُنُهُ، و ما سوى ذلك فهو حسابٌ يُحاسَبُ به يوم القيامة)) أخرجه: الترمذي (٢٣٤٢) و قال: حديث صحيح، و الحاكم (٣١٢/٤) و صححه و وافقه الذهبي، الطبراني ((الكبير)) (١٤٧)، و البيهقي في: ((شعب الإيمان)) (١٠٣٦٧)، وضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف الترغيب))(١٨٧٦).

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أنَّ رجُلاً سأل ابن عباس عن قولِهِ تعالى ﴿.....وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ (الأنعام: ٢٣) فقال: إنَّهُم لَّما رَأوا يومَ القيامةِ أنَّهُ لا يَدخُلُ الجَنَّة إلاَّ مُسلِمٌ، قالوا: تعالوا فَلْنَجحَدْ، فَختم الله على أفواهِهِم فتكَلَمَتْ أيديهم و أرجُلِهم فلا يكتمونَ الله حديثاً﴾))[129] واتە: پیاوێك پرسیاری كرد لە ئیبنو عەباس سەبارەت بەم ئایەتە ﴿.....وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ (الأنعام: ٢٣) ئەویش فەرمووی: ئەوان كاتێك كە بینییان لەڕۆژی كۆتاییدا تەنها موسوڵمان نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، وتیان وەرن بانكۆڵی لەكردەوەكانمان بكەین، ئینجا خوای گەورە مۆری نا بەسەر دەمیانەوە و دەست و قاچی هێنانە زمان و هیچ شتێك ناشارنەوە لە خوای گەورە )، ئەو ئەندامانەی كە شایەتی لەسەر ئادەمیزاد دەدەن زمان و دەست و قاچ، گوێ، چاو، و پێست، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (النور: ٢٤). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَـٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (فصلت: ٢٠).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ڕاستی یەی زۆر بەوردی ڕوون كردۆتەوە: ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((فيلقى العَبدَ، فيقولُ: أيْ فُلُ ألَم أكرِمْكَ ؟ ألَم أسَوِّدْكَ ؟ ألَم أزَوِّجْكَ ؟ ... فيقولُ: بلى يا ربِّ، فَيَقولُ: فَظَنَنْتَ أنَّكَ مُلاقيَّ؟ ... فيَقولُ: أنا عَبدُكَ آمَنتُ بِكَ و بِنَبيِّكَ و بِكتابِكَ، و صُمتُ و صَلَّيتُ و تَصَدَّقْتُ، و يُثني بِخير ما استَطاعَ، قال فَيقولُ لَهُ: أفلا نَبعَثُ عَلَيكَ شاهِدَنا ؟ فَيَفكِّرُ في نَفسِهِ مِنَ الذي يَشهدُ عليهِ [... يقولُ يا ربِّ ألَم تُجرني مِنَ الظُلمِ ؟ قال: بلى، قال: فإنِّي لا أُجيزُ على نَفسي إلاَّ شاهِداً مِنِّي، فَيقولُ: كَفى بِنَفسِكَ اليومَ عَلَيكَ شهيداً، و بالكِرام الكاتبين عَلَيكَ شهيداً، فَيُختَمُ على فيهِ][130] [و هو (الفِدامُ) كما في رواية الحاكم:((يَجيئون يوم القيامة و على أفواهِهِم الفِدام)) هي خِرقَةٌ يُشَدُّ بها الفَمَ]))[131] .

---

[129] أخرجه: الحاكم (٢/٣٠٦) وصححه و وافقه الذهبي .

[130] أخرجه: مسلم (٢٩٦٩)، و ابن حبان (٧٣٥٨) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم، عن أنس.

[131] أخرجه: الحاكم (٢/٤٤٠) وصححه و وافقه، واحمد (٢٨٥٧) وقال محققه: اسناده حسن. .

واتە: (خوای گەورە دەگات بەبەندەکەی و دەفەرموێت: ئەی فلان کەس ئایا رێزم لێ نەگرتیت ؟ ئایا تۆم نەکرد بەسەرۆك ؟ ئایا نەم کردیت بەخاوەن ژن ؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، خوای گەورە دەفەرموێت: گومانت وابوو کە بە من دەگەیت؟ دەڵێت: من بەندەی تۆم باوەڕم بەتۆ و بە پێغەمبەرەکەت و کتێبەکەت هێنا،و بەڕۆژوو بووم و نوێژم کرد و چاکەم کرد، و هەتا دەتوانێت باسی خۆی بەچاکە دەکات، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا شاهیدەکەمان بهێنینە قسە لەسەرت ؟ ئەویش بیر دەکاتەوە کە کێ شاهید بێت بەسەریەوە .. دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئایا منت ڕزگار نەکردووە لەستەم؟ دەفەرموێت: بەڵێ، دەڵێت: من ڕێگە نادەم کە کەس شاهید بێت بەسەرمەوە تەنها شاهیدێك نەبێت لە خۆم، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئەمڕۆ بەسە کە خۆت شاهید بیت بەسەر خۆتەوە و بەسە کە نوسەرە بەڕێزەکان (واتە: مەلائیکە بەڕێزەکان). شاهید بن بەسەرتەوە ئینجا مۆر دەندرێت بەسەر دەمیەوە ، (وە لەڕیوایەتی (حاکم) دا هاتووە کە ئەم مۆرە پارچە قوماشێکە کە دەمی پێ دەبەسترێت)، وە بە ڕانی دەوترێت بێتە قسە (ڕان یەکەم بەشی لاشەیە کە پرسیاری لێ دەکرێت)،

لەڕیوایەتێکی تردا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەفەرموێت: ((فإنّي أحسَبُ أوّلُ ما يَنطِقُ مِنهُ الفخِذُ اليُمنى))[١٣٢] واتە: (من وا دەزانم کە یەکەم شتێك دەهێنرێتە زمان ڕانی قاچی ڕاستە )، موعاویەی کوڕی حەیدە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((تُعرَضون على الله و على أفواهِكُم الفِدامُ، و إنَّ أوّل ما يَتكَلّمُ مِنَ الآدَمي فَخِذِه و كفِّهِ))[١٣٣] واتە: (یەکەم شتێك کە قسە دەکات لە ئادەمیزاددا دوای ئەوەی مۆر دەنرێت بەسەر دەمیەوە ڕانیەتی و ناو لەپی دەستی ( واتە: دێتە زمان و شاهیدی لەسەر دەدات)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((قال فتنطِقُ فخِذه و لَحمه و عِظامهِ بما كان يَعمَل [ثمَّ يُخلّى بينه و بين الكلام]))[١٣٤] . واتە: (دەهێنرێنە بەردەم خوا و پارچە

---

[١٣٢] أخرجه: ابن جرير بسند صحيح، كما في ((السلسلة الصحيحة)) تحت الحديث (٢٧١٣) .

[١٣٣] أخرجه: أحمد (٤/٤٤٦) (٢٨٥٧)و (٢٠٠٢٦) قال محققه: اسناده حسن، و الحاكم (٢/٤٤٠) وصححه و وافقه الذهبي، عن معاوية بن حيدة مرفوعاً و النسائي ((التفسير)) (٤٨٩) و قال محققه: حديث صحيح إسناده حسن من هذا الوجه .

[١٣٤] أخرجه: مسلم (٢٩٦٩) .

قوماشێکیان بەسەر دەمەوەیە ویەکەم شتێك کە قسە دەکات لە ئادەمیزاددا ڕانیەتی و ناو لەپی دەستیەتی، ئینجا ڕانی و گۆشتی و ئێسکەکانی دێنە زمان وباس لەوکردارانە دەکەن کە ئەنجامبیانداوە کردوویانە ئینجا ئەو کەسە بواری قسەی پێ دەدرێت).

خوای گەورە وتەی ئەو جۆرە ئادەمیزادانەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە کە بەئەندامەکانی لاشەکانیان دەڵێن: ﴿وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ (فصلت: ٢١ - ٢٣) واتە: ﴿ بۆچی شاهیدیتان دا بەسەر مانەوە؟ ئەوانیش دەڵێن خوا هێناینیە زمان کە هەموو شتێکی هێناوەتە زمان، و ئەویش بوو یەکەم جار دروستی کردن و بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە، وە ئێوە خۆتان نەدەشاردەوە واتان دەزانی کەدوورن لە شایەتی دانی گوێ و چاو و پێستی لەشتان دژتان بەڵکو وا گومانتان دەبرد کە خوا نازانێت بە زۆرێك لەو کارانەی دەیکەن، ئا ئەوە گومانتان بوو کە دەتان برد بە پەروەردگارتان ئێوەی لە ناو برد و چوونە ڕیزی زیان لێ کەوتووانەوە﴾. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (([فيقولُ: بُعداً لكنَّ و سُحقاً فَعَنكُنَّ كنت أناضل][١٣٥] قال: ( فذلِك المُنافِق و ذلِك لِيُعذِرَ من نفسهِ و ذلِك الذي سخِط اللهُ عليهِ )[١٣٦] واتە: (ئینجا ئەو کەسە دەڵێت: دوورتر کەونەوە و بهاڕدرێن خۆ من کۆششم لەبەر ئێوە دەکرد، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ئەو کەسە موونافیقە!! وا دەکات بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات و هەر ئەویشە کە خوا زۆر ڕقی لێیەتی).

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إذا كان يوم القيامةِ عُرِّفَ الكافِرُ بعَمَلِهِ فَجَحَدَ و خاصَمَ، فَيُقال: هؤلاءِ جيرانُكَ يَشهَدون عَليكَ، فَيقولُ: كذبوا، فيُقال: أهلُكَ، عَشيرتُكَ، فيقولُ:

[١٣٥] أخرجه: مسلم (٢٩٦٩) .

[١٣٦] أخرجه: مسلم (٢٩٦٨)، و ابن حبان (٤٦٤٢)، و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

كذبوا، فَيُقال: احلِفوا: فَيَحلفونَ، ثُمَّ يُصمِتُهُم اللهُ و تَشهَدُ عَليهم ألسِنَتهُم و أيديَهُم، ثُمَّ يُدخِلُهُم النار))[١٣٧]. واتە: **( کاتێك ڕۆژی کۆتایی دێت کافر بەکردەوەکانی ئاشنا دەکرێت ئینکاری دەکا و دەمەقاڵە دەکات .دەوترێت: ئا ئەوانە دراوسێکانتن شاهیدی دەدەن بەسەرتەوە ؟ ئەویش دەڵێت:درۆیان کرد، ئینجا دەوترێت: خزمەکانت و عەشیرەکەشت، شاهیدن بەسەرتەوە ئەویش دەڵێت درۆیان کرد، ئینجا پێیان دەوترێت: سوێند بخۆن، ئەوانیش سوێند دەخۆن، پاشان خوای گەورە بێ دەنگیان دەکات و زمان و دەستەکانیان شاهیدی دەدەن بەسەریانەوە ئینجا خوای گەورە دەیانخاتە ناو ئاگرەوە .**

**عەبدوڵای کوڕی عەباس** (ﷺ) **دەفەرموێت:** ((وأما قولـه: ﴿ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴾ (الأنعام: ٢٣) و﴿ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴾ (النساء: ٤٢) قال: إن الله تعالى يغفر يوم القيامة لأهل الاخلاص من ذنوبهم لا يتعاضم عليه ذنب ان يغفره ولايغفر شركاً فلما رأى المشركون ذلك قالوا: أني ربنا يغفر الذنوب ولايغفر الشرك تعالوا لنقل: إنّا كنّا أهل ذنوب ولم نكن مشركين فقال الله تعالى: اما اذا كتموا الشرك فاختموا على افواهم فيختم على أفواهم فتنطق ايديهم وارجلهم بما كانوا يكسبون فعند ذلك عرف المشركون أن الله لايُكتم حديثاً فذلك قوله تعالى و﴿ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴾ (النساء: ٤٢)﴾[١٣٨]. **واتە: (مەبەست لەو دوو ئایەتە ئەوەیە خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا لە گوناهی دڵسۆزەکان خۆش دەبێت و هیچ تاوانێکی بەلاوە گەورە نابێت لێی خۆش نەبێت تەنها تاوانی هاوتادانان بۆ خوا نەبێت کە هەرگیز لە خاوەنەکەی خۆش نابێت لەوێدا موشرك و هاوتا بڕیاردەرەکان دەڵێن: خوای گەورە لە هەموو گوناهێك خۆش دەبێت**

[١٣٧] أخرجه: أبو يعلى (١٣٩٢)، و قال الهيثمي ((المجمع)) (٣٥١/١٠): رواه أبو يعلى بإسنادٍ حسن على ضعف فيه، و الحاكم (٦٠٥/٤) و صححه و قال الذهبي: صحيح على شرط مسلم. و عزّاهُ الشوكاني في ((فتح القدير)) (٢٧/٤) إلى ابن أبي حاتم و الطبراني و ابن مردويه .

[١٣٨] أخرجه: الخطيب البغدادي ((صحيح الفقية والمتفقة)) (٨٠) موصولاً رواهُ البخاري تعليقاً، وقال محققه: اسناده حسن.، وابن منده ((التوحيد)) (١-١٩)،

تەنها لە شەریك بۆ خوادانان خۆش نابێت، ئێمەش بابڵێین: ئێمە شەریکمان بۆ خوا دانەناوە و تەنها ئێمە لە گوناهباران بووین. خوای گەورەش دەفەرموێت: ئەوانە تاوانی شەریك بۆ خوا دانانەکەیان دەشارنەوە مۆربنێن بەسەر دەمیاندا. پاشان مۆردەنرێت بەسەر دەمیانداو دەستەکان و قاچەکانیان دێنە زمان و شایەتی دەدەن لەسەر کردەوەکانیان. ئالەوکاتەدا موشریکەکان دەزانن کە ناتوانن هیچ شتێك لە خوا بشارنەوە ئەوەش مەبەستی ئایەتە پیرۆزەکەیە کە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّى بِهِمُ الْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا ﴾

## ئەو کردەوانەی کە لێخۆش بوونی خوای گەورە بۆ تاوانەکانی خاوەن باوەڕان مسۆگەر دەکات

ئەو ستەمانەی کە ئادەمیزاد کردوویەتی سێ جۆرە: وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە لە فەرموودەیەك کە ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((الظُّلمُ ثلاثةٌ، فَظُلمٌ لا يَترُكُهُ الله، و ظُلمٌ يُغفَر، و ظُلمٌ لا يُغفَرُ، فأمَّا الظُّلمُ الذي لا يُغفَر فالشِركُ لا يَغفِرهُ الله، و أمَّا الظُّلمُ الذي يُغفَرُ فَظُلمُ العبدِ فيما بينَهُ و بينَ رَبِّهِ، و أمَّا الظُّلمُ الذي لا يُترَكُ فظُلمُ العِباد، فَيَقتَصُ اللهُ بَعضَهُم من بعضٍ))[139] واتە: (ستەم سیانە: ستەمێك خوا هیچی جێ ناهێڵێت، و ستەمێك کە لێی خۆش دەبێت، و ستەمێك کە هەرگیز لێی خۆش نابێت ئەو ستەمەی کە هەرگیز لیێ خۆش بوونی نی یە ئەویش هاوتا بڕیاردانە بۆ خوا کە بەهیچ جۆرێك خوا لێی خۆش نابێت، و ئەو ستەمەی کە لیێ خۆش بوونی بۆ هەیە ئەویش ستەمی بەندەیە لە نێوان خۆی و پەروەردگاریدا، و ئەو ستەمەی کە هیچی لیێ جێ ناهێڵرێت ئەویش ستەمی بەندەکانە لەناوخۆیاندا، خوای گەورە تۆڵە لەهەندێکیان وەردەگرێت بۆ هەندێکیان، و هەموو تاوانێك هیوا وایە خوای گەورە لیێ بووردنی لەبارەیەوە هەبێت تەنها دوو شت نەبێت کە لیێ بووردنی لەبارەوە نی یە ئەویش مردنە لەسەر شەریك بۆ خوا قەرار دان و کوشتنی خاوەن باوەڕێکە بەناحەق).

---

(١٣٩) اخرجه: أحمد (٢٦٠٣١) وقال محققه: رجاله ثقات، والحاكم (٥٧٥/٤)، وصححه، والبيهقي ((الشعب)) (٧٤٧٣). الطيالسي (٦٠/٢) وللفظ له، وقال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٩٢٧).

وەك ئەبو دەرداء (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((كلُّ ذنبٍ عسى اللهُ أنْ يَغفِرَهُ إلاَّ مَنْ ماتَ مُشرِكاً [..كافراً..][١٤٠]، أو مَنْ قَتلَ مؤمناً مُتَعَمِّداً))[١٤١] واتە: (هەموو تاوانێك هیوا وایە خوا لێی خۆش ببێت تەنها ئەوە نەبێت کە بە موشریکی یاخود (کافری) مردبێت، یاخود یەکێکە کە خاوەن باوەڕێکی بەبێ هۆ کوشتووە، هەروەها هەموو تاوانەکانی ئینسان لێ خۆش بوونی خوای پەروەردگاری لەسەرە تەنها شەریك بۆ خوا قەراردان نەبێت وەك خوای گەورە دەفورموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ..... ﴾ (النساء: ٤٨) .

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((قال الله تعالى: [يا ابن آدمَ لَوْ لَقيتَني] بِقُرابِ الأرضِ خطايا ثُمَّ لَقيتني لا تُشرِك بي شيئاً للَقيتُكَ بِقُرابِها مَغفِرة))[١٤٢] واتە: (خوای گەورە فەرموویەتی [ئەی ئادەمیزاد ئەگەر] بەئەندازەی سەر ڕووی زەوی تاوانت هەبێت ئینجا بگەیت بەمن وبە هیچ جۆرێ هاوتات بۆ بڕیار نەدابم ئەوا پێت دەگەم و بەئەندازەی سەر ڕووی زەوی لێخۆشبوونم بۆت هەیە) ، لەڕیوایەتێکی تردا ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) فەرموویەتی: ((سمِعتُ رسول الله (ﷺ) يقولُ: ((قال الله تعالى: .. يا ابن آدم إنَّكَ لَوْ أتَيتني بِقُرابِ الأرضِ خَطايا ثُمَّ لَقيتَني لا تُشرِكُ بي شيئا لأتَيتُكَ بِقُرابِها مَغفِرةً))[١٤٣]. واتە: (گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (خوای گەورە فەرموویەتی: ئەی ئادەمیزاد گەر تۆ بەئەندازەی سەر ڕووی زەوی تاوانت هەبێت بگەیتەلام و هاوتات بۆ بڕیار نەدابم بەئەندازەی سەر ڕووی زەوی لێخۆشبوونم بۆت هەیە).

ئەو کردەوە چاکانەی کە لێ خۆش بوونی خوا مسۆگەر دەکات بۆ ئادەمیزاد ئەمانەی لای خوارەوەیە:

---

[١٤٠] في رواية الحاكم .

[١٤١] أخرجه: أبوداود (٤٢٧٠)، و النسائي (٨١/٧)، و الحاكم (٣٥١/٤) وصححه و وافقه الذهبي، وابن حبان (٥٩٨٠) و قال محققه: حديث صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٥٦١).

[١٤٢] أخرجه: أحمد (١٥١/٥)، ومسلم (٢٦٨٧) .

[١٤٣] رواه الترمذي (٣٥٤٠)، وقال حديث غريب، و أحمد (٥٠ /١٧٢)، و صححه الشيخ الألباني في: ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٨٠٥)، و ((السلسلة الصحيحة)) (١٢٧) .

**١- قبوڵ کردنی پەشیمانی موسوڵمانێك.**

**ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ أقالَ مُسلماً عَثرَتَهُ، في رواية [بيعته] أ قال الله عَثرَتَهُ يومَ القيامةِ))[١٤٤] واتە:(هەرکەسێك لە هەڵە و پەشیمان بوونەوەی موسوڵمانێك ببورێت لەمامەڵە وشتی تردا خوای گەورە لە هەڵەکانی دەبورێت لەرۆژی کۆتاییدا).**

**٢- لێبوردن لەقەرز و سوك کردنی بۆ موسوڵمانێکی دەست کورت.**

**ئەبی هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ يَسَّرَ على مُعسرٍ يَسَّرَ الله عليه في الدنيا و الآخرةِ))[١٤٥] واتە: (هەر کەسێك قەرزێك سوك بکات لەسەر دەست تەنگێك خوای گەورەش کارەکانی لەسەر ئاسان دەکات لەدونیا و قیامەت دا)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ سرَّهُ أنْ يُنجيَهُ الله مِنْ كُرَبِ يوم القيامة، فَلْيُنَفِّسْ عن مُعسرٍ أو يَضع عنهُ))[١٤٦] واتە: (هەر کەسێك پێی خۆشە خوای گەورە ڕزگاری بکات لەناڕەحەتیەکانی ڕۆژی کۆتایی با یارمەتی دەست کورتێك بدات یاخود قەرزەکەی لەسەر کەم بکاتەوە).لە ڕیوایەتێکی تردا مەیمونە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:((من إدّانَ دنياً وهو ينوي قضاءة ادّاهُ الله عنه يوم القيامة))[١٤٧]. واتە: (هەر کەسێك قەرزێك بکات و خوا ئاگادار بووە لە نیەتی کە ویستویەتی بیداتەوە ئەو کەسە خوا قەرزەکەی بۆ دەداتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا (واتە: مەبەست لەو کەسەیەکە مردن ماوەی نەداوە تا قەرزەکانی بداتەوە)).**

**لەڕیوایەتێکی تردا کە ئیبن مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((حُوسِبَ رجلٌ مِمَّنْ كانَ قَبلَكُم، فَلَم يوجَدْ لَهُ مِنْ الخَيرِ شيء إلاّ أنَّهُ كان**

---

[١٤٤] أخرجه: أحمد (٢/٢٥٢)، وأبو داود (٣٤٦٠)، و الحاكم (٢/٤٥) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وابن ماجة (١٧٨٦)، و البيهقي (٦/٢٧)، وابن حبان (٥٠٣٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطهما، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢١٩٩)، و في ((المشكاة)) (٢٨٨١)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٦١٤) .

[١٤٥] أخرجه: مسلم (٢٦٩٩)، وأبو داود (٤٩٤٦) .

[١٤٦] أخرجه: مسلم: (١٥٦٣) .

[١٤٧] أخرجه: و الطبراني ((ترغيب)) (٣/٣٣) رواه أحمد، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع))(٥٩٨٦) .

يُخالِطُ الناسَ، و كان موسِراً يؤمُرُ غُلامَهُ أنْ يَتجاوزَ عن المُعسِرِ، فقال الله عز وجل: فَنحنُ أحقُّ مِنهُ، فَتجاوَزْ عنهُ))[١٤٨] واتە: (پیاوێك لەوانەی کە لە پێش ئێوەدا بوو، لێ پێچینەوەی لەگەڵدا کرا هیچ چاکەیەکی نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە تێکەڵ بەخەڵکان دەبوو وە دەوڵەمەندبوو، بەمنداڵەکانی دەوت کە لە ئادەمیزادی دەست تەنگ ببورن خوای گەورەش فەرمووی: ئێمە شیاوترین بەو لێبوردنە لەو، ئینجا خوای گەورەش لێی بورا (واتە: لەتاوانەکانی خۆش بوو)).

**٣- ترسان لەخوای گەورە:**

خوای گەورە مژدەی داوە کە ڕازی بوون و لێخۆش بوونی خۆی بۆ ئەو موسوڵمانانەیە کە لە خواترساون وەك دەفەرموێت:﴿ .....رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴾ (البينة: ٨)، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: عن ربه ((و عِزَتي لا أجْمَعُ على عبدي خَوفينِ و أمنين إذا خافَني في الدنيا أمِنتَهُ يومَ القيامةِ، و إذا أمِنَني في الدنيا أخَفْتُهُ يوم القيامةِ))[١٤٩] واتە: (خوای گەورە فەرموویەتی: سوێند بەشکۆمەندیم کۆی ناکەمەوە لەسەر بەندەکەم دوو ترس و دوو بێ باکی، ئەگەر بەندەکەم بترسێ لێم لەدونیادا بێ ترسی (واتە: بێ باکی) دەکەم لەڕۆژی کۆتاییدا، و ئەگەر بێ باك بێت لەمن لەدونیادا دەیترسێنم لەڕۆژی کۆتاییدا). لەڕیوایەتێکی تردا کە حوزەیفە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ رجُلاً مِمَّنْ كان قبلَكُم أمَرَ بِجيفتِه إذا مات أنْ يُحرقَ، ثُمَّ يُطحنَ ثمَّ يُرفَعَ: فإذا كانتِ ريحٌ عاصِفٌ ذُرّيَ فيها، فَجَمَعَهُ الله يوم القيامة فقال: لِمَ فَعَلْتَ ذلِكَ ؟ قال: مِنْ خَشيتِكَ، [ في رواية: فَرَجوتُ أنْ أنجو، فَغَفَر لَهُ] [١٥٠]))[١٥١] واتە: (پیاوێك لەوانەی کە لە پێش ئێوە دا بوون فەرمانی کرد بوو ئەگەر مرد لاشەکەی بسوتێنرێت ئینجا بهاڕدرێت

---

[١٤٨] أخرجه: أحمد (٤/١٢٠)، و مسلم (١٥٦١)، و الترمذي (١٣٥٢)، و الطبراني في ((الكبير)) ١٧/(٥٣٧)، و الحاكم (٢/٢٩) و صححه على شرطهما .

[١٤٩] أخرجه: ابن حبان (٦٤٠) وقال محققه: إسناده حسن، و أبو نعيم في ((الحلية)) (٦/٩٨)، وإسناده صحيح كما قال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧٤٢) .

[١٥٠] في رواية .

[١٥١] أخرجه: أحمد (٤/١١٨)، و البخاري (٣٤٧٩)، و الطبراني في ((الكبير)) ١٧/(٦٤٧)، و اللفظ للطبراني .

ئینجا بەرز بکرێتەوە ئەگەر بایەکی توند هەبوو بدرێت بە دەمیەوە و بلاوکرێتەوە (واتە: بەسەر زەوی ودەریادا )، خوای گەورە کۆی کردەوە لەرۆژی کۆتاییداو پێی فەرموو: بۆچی وات کرد ؟ وتی: لەترسی تۆ (هیوام وابوو کە رزگار ببم پاشان خوا لێی خۆش بوو).

لەریوایەتێکی تردا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((كان رجل ممن كان قبلكم لم يعمل خيراً قط الا التوحيد فلما احتُضرَ قال لأهله: انظروا اذا انا مِتُ ان يُحتّرقوهُ حتى يدعُوه حمما ثم اطحنوه ثم اذروه في يوم ريح [ثم ذروا نصفه في البرو نصفه في البحر فوالله لئن قدر الله عليه ليعذّبَهُ عذابا لا يُعذّبه أحداً من العالمين ] فلما مات فعلوا ذلك به [فامر الله البر فجمع مافيه و أمر البحر فجمع ما فيه ]فأذا هو [قائم] في قبضة الله،فقال الله عزوجل: يا ابن آدم ماحملك على ما فعلت قال: أي رب من مخافتك في رواية [ من خشيتك وانت اعلم] قال فغفر له بها ولم يعمل خير قط الا التوحيد))[١٥٢] . واتە: (پیاوێك هەبوو لە ئومەتەکانی پێش ئێوەدا و هیچ کارێکی چاکەی نەبوو تەنها یەکخواپەرست بوو، کاتێك سەرە مەرگی هاتە پێش بەخزمەکانی وت: گەر مردم لاشەکەم بسوتێنن تا دەبێتە خەڵوز، پاشان بیهاڕن پاشان لە رۆژێکی با و زریاندا نیوەی بپرژێنن بەسەر وشکانیدا و نیوەکەی تری بپرژێنن بەسەر دەریادا وتی: سوێند بەخوا، گەر خوای گەورە کۆی بکاتەوە سزایەکم دەدات کە هیچ کەسێکی وا سزا نەدابێت لە جیهاندا کاتێك ئەو پیاوە مرد بەو جۆرەیان لێ کرد کە خۆی داوای کرد بوو، خوای گەورەش فەرمانی بە وشکانی کرد ئەوەی تیایدا بلاوبوەتەوە کۆی بکاتەوە و بیهێنێت، وەفەرمانی بە دەریاش کرد ئەوەی تیایدا بلاوبوەتەوە کۆی بکاتەوە و بیهێنێت، تا بەپێوە وەستا لەمشتی خوادا، خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئادەمیزاد چی وای لێ کردیت ئەو کارە ئەنجام بدەیت؟ ئەویش وتی: خوای گەورە ئەو کارەم لەترسی تۆ ئەنجام داوە تۆش باشتر دەزانیت. ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:خوای گەورە لەبەر ئەو کارەی لێی خۆش بوو وەئەو کەسە هیچ چاکەیەکی تری نەبوو تەنها یەکخواپەرست بوو).

[١٥٢] أخرجه: أحمد (٢/٣٠٤) وقال الشيخ الألباني في ( الصحيحة) (٣٠٤٨) اسناده صحيح.

**٤- توورە نەبوون:**

**ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((مَنْ كَفَّ غَضَبَهُ كفَّ اللهُ عنهُ عذابَهُ))[١٥٣] **واتە: ( هەر کەس تورەبوونی خۆی بگرێتەوە خوای گەورەش سزای خۆی لێ دەگرێتەوە) ، لەڕیوایەتێکی تردا ئیبنو عەمرو(ﷺ) پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی:** [ما يُنقِذُني [ ماذا يباعدني] مِنْ غَضَبِ اللهِ ؟ قال: ((لا تَغضَبْ))][١٥٤] **واتە: (چی ڕزگارم دەکات لەتورە بوونی خوا ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ((توورە مەبە!)).**

**٥- ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکە:**

**عەبدولڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((... مَنْ حافَظَ عَليها (أي: الصلاة) كانت لَهُ نوراً و بُرهاناً و نجاةً يومَ القيامةِ))[١٥٥] **واتە: (.... هەر کەسێ پارێزگاری بکات (واتە: پێنج نوێژە فەرزەکە) ئەوکارەی دەبێتە ڕووناکی و بەڵگە و ڕزگار بوون بۆی لەڕۆژی کۆتاییدا).**

**٦-لابردنی ناڕەحەتی لەسەر خاوەن باوەڕان:**

**ئەبی هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((مَنْ سَتَرَ مُسلِماً سَتَرهُ اللهُ في الدنيا و الآخرة، و مَنْ فَرَّجَ عن مسلمٍ كُربةً فرَّجَ اللهُ عنه كربَةً مِنْ كُرَبِ يومِ القيامةِ))[١٥٦] **واتە: (هەرکەسێك موسوڵمانێك دابپۆشێ خوای گەورە دای دەپۆشێت**

---

[١٥٣] أخرجه: أبو يعلى (١٠٧١/٣)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٦٠) .

[١٥٤] أخرجه: أحمد(٦٦٣٥) وقال محققه: صحيح لغيره، وابن حبان (٢٩٦) وقال محققه: اسناده حسن، و الطبراني ((مكارم الأخلاق)) ، و ابن عبدالبر ((التمهيد)) بإسناد حسن، كما قال الحافظ العراقي في ((الإحياء)) (١٦١/٣)، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٢٧٤٧). .

[١٥٥] أخرجه: أحمد (١٦٩/٢) (٦٥٧٦) وقال محققه: اسناده حسن،و الدارمي (٣٠١/٢)، و الطحاوي ((معاني الآثار)) (٢٢٩/٤)، و قال الهيثمي ((المجمع)) (١٩٢/١): رجال أحمد رجال ثقات، و ابن حبان (١٤٦٧) و قال محققه: إسناده صحيح، و حسنه الشيخ الألباني في ((الثمر المستطاب))(٥٣/١).

[١٥٦] أخرجه: أحمد (٢٥٢/٢)، و مسلم (٢٦٩٩)، وأبوداود (٤٩٤٦)، و ابن ماجة (٢٢٥)، و الترمذي (٤٢٥)، وابن حبان (٥٣٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح أبي داود)) (١٣٠٨)، و في ((صحيح ابن ماجة)) (١٨٤)، و في ((صحيح الترغيب)) (٦٧) .

(واتە: گوناهەکانی) لەدونیاو قیامەتداو هەرکەسێك نارەحەتیەك لابەرێت بەسەر موسوڵمانێکەوە خوای گەورە نارەحەتیەك لەنارەحەتیەکانی ڕۆژی کۆتایی بەسەرەوە لادەبات).

**٧- تۆبە کاران و ڕەفتار چاکان:**

بێ گومان ئەو خاوەن باوەڕە تۆبەکارانەی کە ڕەفتاری خراپەیان گۆڕیوە بۆ ڕەفتار و کاری چاکە ئەو کەسە خوای گەورە خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ (الفرقان: ٧٠)، ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لَيَتَمَنَّيَنَ أقوامٌ لو أكثروا مِنْ السيئاتِ " قالوا بِمَ يا ررسول الله ؟ قال: الذينَ بَدَّلَ اللهُ سيئاتِهم حَسناتٍ))[١٥٧] واتە: ( کۆمەڵێك خۆزگە دەخوازن کە خراپەیان زۆر بکردایە)) وتیان: بەچی ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: (ئەوانەی کە خوا خراپەکانی بۆ گۆڕیون بەچاکە)) .

**٨- ئەوانەی دان بەتاوانەکانیاندا دەنێن:**

لە عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يدنوا المؤمنُ مِنْ رَبِّهِ يومَ القِيامةِ حتَّى يَضَعَ عَليه كَنَفَهُ [في رواية: فَسَتَرهُ مِن الناسِ] ))[١٥٨] ثُمَّ يُقرِّرهُ بِذنوبِهِ، فَيقولُ: [هل تَعرِفُ ذنبَ كذا و كذا] [١٥٩] فيقولُ: نَعم [فيقولُ: أتَعْرِفُ ذنبَ كذا و كذا] [١٦٠] [حتَّى إذا قرَّرهُ بِذنوبِهِ و ظَنَّ أنَّهُ قد استَوجبَ] [١٦١] [في رواية:حتَّى إذا بَلَغَ ما شاء اللهُ أنْ تبلُغَ ]، قال: فإنِّي قدْ سَترتُها عليكَ في الدنيا، و إنِّي اغفِرُها لَكَ

---

[١٥٧] أخرجه: الحاكم (٢٥٢/٤) وصححه و وافقه الذهبي وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢١٧٧)و (٣٠٥٣)، ووقال الشيخ الألباني: وفيه اشارة الى فضل الله عزوجل ورحمته بمن يشاء من عباده الذين يبدل يوم القيامة سيئاتهم حسنات ورجح ابن القيم (طريق الهجرتين) (ص:٢٤٧) ان ذلك في الدنيا بتحول العائب من اعماله القبيحة الى اضدادها.

[١٥٨] في رواية .

[١٥٩] في رواية .

[١٦٠] في رواية .

[١٦١] في رواية .

اليومَ، ثمَ يُعطى صحيفة حَسناتِهِ....))[١٦٢]. واتە: ( خوای گەورە بڕوادار لەخۆی نزیك دەخاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا تا دەیخاتە ژێر سایەی خۆی و ونی دەكات لەپێش چاوی خەڵكی پاشان وای لێ دەكات تا دان بە تاوانەكانی خۆیدا دەنێت و خوا پێی دەفەرموێت: ئایا ئەو گوناه و ئەو گوناهت دەناسیتەوە هەتا وای لێ دەكات كە دان بەهەموو تاوانەكانیدا دەنێت وگومان دەبات كە دۆزەخی بۆ مسۆگەر بووە، هەتا دەیگەیەنێتە ئەو شتانەی كە خوا دەیەوێت پێی بگەیەنێت، ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت: من ئەوانەم بۆ داپۆشیت لەدونیادا و ئەمڕۆ من لەوانەت دەبوورم، ئینجا نامەی چاكەكانی پێ دەبەخشرێت...... ).

**٩- یادكردنی خوا ( یادی خوا ):**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:((ما عَمِلَ ابنُ آدَمَ عَمَلاً أَنْجَى لَهُ مِنْ عذابِ اللهِ مِنْ ذكر الله))[١٦٣] واتە: ( ئادەمیزاد هیچ كردەوەیەكی نەكردووە ڕزگارتربێت بۆی لەسزای خوا وەك یادكردنی خوا). لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا كە فەرموویەتی: ((خُذوا جُنَّتَكُم مِن النار قولوا: سبحانَ اللهِ و الحَمدُ للهِ ولا إلهَ إلاَّ الله و اللهُ أكبر فإنَّهُنَّ يأتينَ يوم القيامة مُقدِماتٍ و مُعقِّباتٍ و مُنجياتٍ و هُنَّ الباقياتُ الصالِحات))[١٦٤]. واتە: (ڕزگاربوونتان لە ئاگر وەرگرن و بڵێن: (سبحان الله والحمد لله ولاإله إلاالله والله أكبر) چونكە ئەوانە لەڕۆژی كۆتاییدا دێن و پێشەكیەكانن و

---

[١٦٢] أخرجه: أحمد (٧٤/٢)، و البخاري (٢٤٤١، ٦٠٧٠)، وابن ماجة (١٨٣)، و ابن حبان (٧٣٥٥) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط البخاري، و صححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن ابن ماجة) (١٥١).

[١٦٣] أخرجه: الطبراني في ((الكبير)) ١٣٨/٢٠، وأحمد (٢٣٩/٥)، وابن أبي شيبة (٢٩٤٤٣)، و قال الحافظ العراقي في ((الإحياء)) (٢٩٦/١): أخرجه ابن أبي شيبة و الطبراني بإسنادٍ حسن، وقال الحافظ العسقلاني في ((بلوغ المرام)) (ص: ٣٤٥): اخرجه ابن أبي شيبة و الطبراني بإسنادٍ حسن، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٧٣/١٠) رجاله رجالُ الصحيح، وقال الشيخ مقبل في ((الصحيح المسند)) (١٠٤٢): أخرجه الترمذي (٣٣٧٧) وهو حديث صحيح، و صححه الشيخ الألباني في: ((صحيح الجامع)) (٥٥٢٠) .

[١٦٤] أخرجه: النسائي في ((عمل اليوم و الليلة)) (٨٤٨) والطبراني في ((الصغير)) ١٤٥/١، و الحاكم (٥٤١/١) صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، البيهقي ((الشعب)) (٦٠٦)، و وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٢١٤) .

دواییەکانن و بەدواچووەکان و ڕزگار بووەکانن، و ئەوانیش کردەوە چاکەکانن کە دەمێننەوە).

**١٠- ڕۆژوو گرتن بۆ خوا:**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((الصومُ جُنَّةٌ مِن عَذاب الله))[١٦٥] واتە: ( ڕۆژوو قەڵغان و خۆ پاراستنە لە سزای خوا) . لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((الصيامُ جُنَّةٌ و حِصنٌ حَصينٌ من النار))[١٦٦] واتە: ( ڕۆژوو گرتن خۆپاراستنە و قەڵایەکی زۆر قایمە لەئاگر )، وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە جابری کوڕی عەبدولاّ(ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((الصيامُ جُنَّةٌ يستَجِنُّ بِها العَبدُ مِن النار هو لي و أنا أجزي به))[١٦٧] واتە: ( ڕۆژوو گرتن خۆ پاراستنێکە بەندە خۆی پێ دەپارێزێت لەئاگر ئەوە بۆ منە و منیش پاداشتی دەدەمەوە (واتە: خوای گەورە )).

**١١- خۆش ویستنی خوای پەروەردگار:**

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەفەرموێت: مَرَّ النبيُّ (ﷺ) في نَفَرٍ مِن أصحابِهِ، و صبيٌّ في الطريقِ، فَلَمَّا رأتْ أمُّهُ القومَ، خَشيَت على ولَدِها أنْ يُوطَأَ، فأقبَلَتْ تَسعى و تَقولُ: ابني ابني، وَسَعَتْ فأخذَتْهُ، فقالَ القومُ: يا رسول الله: ما كانَتْ هذه لِتُلقيَ إبنها في النارِ، قال: فَخَفَّضَهُم النبيُّ (ﷺ) فقال: ((لا، و اللهُ عز و جل لا يُلقي حَبيبَهُ في النارِ [و في رواية: ولا اللهُ يُلقي حَبيبَهُ في النّارِ]))[١٦٨] واتە: ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی تێپەڕین، ومنداڵێك لەڕێگەکەدا بوو، کاتێك دایکەکەی ئەو کۆمەڵە کەسەی بینی ترسا لەوەی کە

---

[١٦٥] أخرجه: ابن خزيمة (٣/١٩٣)، و البيهقي ((السنن الصُغرى)) (١٣٣٦) و قال محققه: حسن، عن عثمان بن العاص مرفوعاً. واللفظ للبيهقي، وقال الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣/٢٦٤): (٣٧٦٠) إسناده صحيح .

[١٦٦] أخرجه: الإمام أحمد في ((المسند)) (٣/٣٩٦) (٩٢٢٥) وقال محققه:حديث صحيح. وصححه ايضاً الحافظ نورالدين علي بن بكر الهيثمي في: (مجمع الزوائد) (٣/١٨٠)، و أخرجه الطبراني ((الكبير)) (٨٣٦١-٨٣٦٢)،والبيهقي (شعب الإيمان) (٣٥٧٠)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٩٨٠).

[١٦٧] أخرجه: الإمام أحمد في ((المسند)) (١٤٦٦٩) وقال محققه: حديث صحيح.

[١٦٨] أخرجه: أحمد ((المسند)) (١٢٠١٨) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وأخرجه: البزار (٣٤٧٦)، وأبو يعلى (٣٧٤٧)، و الحاكم (١/٥٨) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي.

منداڵەکەی بکرێت بەژێر پێوە، ئینجا بە ڕاکردن هاتوو وتی: کوڕەکەم کوڕەکەم، و بەخێرایی هات تا هەڵی گرت، هاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئافرەتە هەرگیز منداڵەکەی فڕێ ناداتە ئاگرەوە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ دەنگی کردن و فەرمووی:(نەخێر خوای پەروەردگاریش خۆشەویستی خۆی فڕێ ناداتە ناو ئاگرەوە ) .

**١٢- ئەوانەی بەردەوام داوای لێخۆشبوونیان لە خوا کردووە:**

فوضالەی کوڕی عوبەید (ﷺ) گێراویەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((العبد آمن من عذاب الله ما استغفر الله))[١٦٩].واتە: (بەندە هەتا داوای لێخۆش بوون لە خوا بکات دوورە لە سزای خوا ).

# ڕەحمەتی خوای پەروەردگار

خوای گەورە بەڵێنی داوە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە ڕازی بکات سەبارەت بە ئومەتەکەی و غەمباری نەکات، کەواتە ڕەحمەتی خوای گەورە زۆر فراوانە و زۆر نزیکە لەخاوەن باوەڕان، عەبدولای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ﷺ) دەفەرموێت: ((قال: تَلا النبـي(ﷺ): [ربِّ إنَّهُنَّ أضْلَلْنَ كثيراً مِن الناسِ] فرفَعَ يَدَيهِ و قال: اللهُم أمَّتي أمَّتي و بكَى ... فقال الله عز و جل: يا جبريلُ إذهَبْ إلى محمَدٍ فَقُلْ: إنَّا سَنُرضيكَ في أُمَّتِكَ ولا نَسُؤُكَ))[١٧٠] واتە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ﴾(إبراهيم: ٣٦) ئینجا هەردوو دەستی بەرزکردەوە و دووجار فەرمووی ((خوایە ئومەتەکەم)) ئینجا گریا ((خوای پەروەردگار فەرمووی: ئەی جبریل بچۆ بۆ لای موحەمەد و پێی بڵێ: ئێمە ڕازیت دەکەین لە ئومەتەکەتدا و ناڕەحەتت ناکەین). بێ گومان دروستکراوانی خوا بەکردەوەکانی خۆیان ناتوانن بچنە بەهەشت چونکە تەنها کردەوەکانیان نایان گەیەنێتە بەهەشت بەڵکو بەڕەحم و بەزەیی و لێخۆش بوونی خوای پەروەردگار دەچنە ناو بەهەشت . ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە

---

[١٦٩] أخرجه: احمد (٢٣٩٥٤) وقال محققه: حديث حسن بطرقه .

[١٧٠] أخرجه: مسلم (١/١٠٧) .

پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لَنْ يَدخُلَ الجَنَّةَ أحَدٌ بِعملِهِ، قالوا: و لا أنتَ يا رسول الله ؟ قال: و لا أنا إلاّ أنْ يَتَغَمَدَني اللهُ بِفَضلٍ منهُ و رَحمةٍ فَسَدِّدوا و قارِبوا...))[١٧١] واتە: (هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت بەکردەوەکانی خۆی) وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی:(منیش هەروەها مەگەر میهرەبانی و بەزەیی خوای گەورە منیش بگرێتەوە، کەوابوو کارەکان ڕێك بکەن و نزیکی بکەنەوە ....) ، (واتە: کارەکانتان ڕێك خەن بە گوێرەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەکەتان و نزیکی بکەنەوە لێ ی).

لەڕیوایەتێکی تردا ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەگێڕتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((ما منكم من أحد يُدخله عمله الجنة ولاينجيه من النار الا برحمة من الله وفضل))[١٧٢]، واتە: (هیچ کەسێك لە ئێوە کردەوەکانی نایخاتە بەهەشت و ڕزگاری ناکات لە دۆزەخ تەنها میهرەبانی وبەزەیی خوا ڕزگاری دەکات لە دۆزەخ و دەیخاتە بەهەشت).

پێغەمبە ری بەڕێزمان (ﷺ) مژدەی پێ داوین کە ئومەتی ئیسلام ئومەتێکی ڕەحم پێ کراوە لە قیامەتدا و سزاکانیان تەنها لە دونیادا دەبێت، وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((أُمَّتي هذه أُمةٌ مَرحومةٌ ليس عَليها عَذابٌ في الآخرة، عَذابُها في الدنيا: الفِتَنُ و الزلازِلُ و القَتلُ))[١٧٣] واتە: (ئومەتەکەم ئومەتێکی ڕەحم پێکراوە سزای لەسەر نی یە لەڕۆژی کۆتاییدا، سزاکەی لەدونیادا یە: ئاژاوە و بومەلەرزە و کوشتنە ). بەزەیی خوای گەورە سەد پلەیە و بەزەیی هەردەم پێش تورە بوونی کەوتووە، وەك ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لَمَّا خَلَقَ اللهُ الخَلقَ كَتَبَ في كتابٍ فَهوَ عِندَهُ فوقَ العرشِ: إنَّ رَحمَتي غَلَبَتْ [سَبَقَتْ][١٧٤] غَضَبي))[١٧٥] واتە: (کاتێ خوای گەورە دروست کراوەکانی دروست کرد لەکتێبێکدا نووسی کەلای خۆیەتی لەسەر عەرش: بەزەییم زاڵ بووە (لەڕیوایەتێکدا: پێش کەوتووە) بەسەر

---

[١٧١] أخرجه: البخاري (٥٦٧٣)، ومسلم (٢٨١٦)، و النسائي (١٢١/٨) و في رواية: ((لَنْ يدخل الجنة أحدٌ إلاّ برَحمةِ الله)) . رواه أحمد (٥٢/٣) و إسناده حسن، كما قال الهيثمي في: ((المجمع)) (٣٥٦/١٠) .

[١٧٢] أخرجه: أحمد (٩٠٦٤): اسناده صحيح على شرطما .

[١٧٣] أخرجه: أحمد (٤١٠/٤) . و الحاكم (٤٤٤/٤) وصححه و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٣٥٩٧) . و في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٠٩)، و في ((صحيح الجامع)) (٢٢٦١) .

[١٧٤] في رواية .

[١٧٥] أخرجه: البخاري (٣١٩٤)، و مسلم (٢٧٥١) .

تووڕە بوونمدا، لەبەر ئەوە بوو جبریل (عليه السلام) ئاو و قوڕی دەکرد بەدەمی فیرعەوندا بۆ ئەوەی کاتێ لەسەرە مەرگدا بوو بەزەیی خوای گەورەی پێ نەگات و خوای گەورە بەزەیی پێدا نەیەتەوە و لێی نەبورێت، وەك ئیبنو عەباس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ جبريل جَعلَ يَدُسُّ في فِيِّ فرعونَ الطِّينَ خَشيَةَ أنْ يَقولَ لا إلهَ إلاَّ اللهُ، فَيَرْحَمهُ اللهُ أو خَشيَةَ أن يَرحَمهُ اللهُ))[١٧٦].واتە: (جبریل بەردەوام قوڕاوی دەکرد بەدەمی فیرعەوندا لەترسی ئەوەی نەوەك بڵێت: (لاإله إلا الله) و خوای گەورە بەزەیی پیا بێتەوە یاخود لەترسی ئەوەی کە خوا ڕەحمی پێ بکات).

هەروەها ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((قَدِمَ رسول الله (ﷺ) .....، فإذا إمرأةٌ مِن السبيِ تَسعى، إذ وَجَدتْ صبياً في السَبيِّ ؟أخذتْهُ، فألزَقَتهُ بِبَطنِها فأرضَعَتْهُ فقال النبي (ﷺ): ((أتَرَونَ هذه المرأة طارِحةً وَلَدَها في النارِ؟)) قُلنا: لا واللهِ و هي تَقْدِرُ على أن لا تَطرَحَهُ، فقال رَسولُ الله (ﷺ): ((اللهُ أرحَمُ بِعِبادهِ مِنْ هذه بِوَلَدِها))[١٧٧] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە و دەست کەوتەکانی لەگەڵ خۆیدا هێنا، لەناو دەستکەوتەکاندا ئافرەتێك هەبوو کە بەپەرۆشەوە دەگەڕا کاتێك منداڵێکی دۆزیەوە لەدەست کەوتەکاندا گرتی و گوشی بەخۆیەوە و شیری پێدا، و پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئەو ئافرەتە منداڵەکەی خۆی فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە؟) وتیان: نەخێر والله ناهێڵێت تێ ی بکەوێت تا توانای هەبێت، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی:(خوا زۆر بە بەزەیی ترە بۆ بەندەکانی لەو ئافرەتە بۆ منداڵەکەی).

لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((إنَّ لله مئة رحمة انزل منها رحمة واحدة بين الجن و الانس والبهائم و الهوام، فبها يتعاطفون، وبها يتراحمون، و بها تعطف الوحش على ولدها

---

[١٧٦] أخرجه: الترمذي (٣١٠٨) و قال: حديث حسن صحيح غريب، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٤٨٤) . و في رواية: ((.. فقال جبريل فلَو رأيتني و أنا آخذ من حالِ البحرِ فادسُهُ في فيهِ مخافةَ أن تُدرِكَهُ الرَّحمة)) أخرجه: الترمذي (٣١٧٠)، وأحمد (١/٢٤٠)، و الطيالسي (٢٦١٨)، والحاكم (٢/٣٤٠) موقوفا على ابن عباس و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في: ((السلسلة الصحيحة)) (٢٠١٥)، و صححه الأرناؤوط موقوفاً في ((المسند)) رقم (٢١٤٤) .

[١٧٧] أخرجه: البخاري (١٠/٣٦٠)، و مسلم (٢٧٥٤) من حديث عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) و في رواية: ((لو تعلمون قدْرَ رحمة الله لا تَكَلْتُم عَلَيها)) رواه البزار (٣٢٥٦) و إسناده حسن، كما قال الهيثمي في: ((المجمع)) (١٠/٣٨٥) .

واخر الله تسعاً و تسعین رحمة یرحم بها عباده الی یوم القیامة))[178] واتە: (خوای گەورە سەد بەزەیی هەیە، تەنها یەك بەزەیی دابەزاندۆتە نێوان ئادەمیزاد و جنۆکەو ئاژەڵەکان و بەوەش سۆزو بەزەییان هەیە بۆ یەکتری ودڕندەکانیش بەوە سۆزیان هەیە بۆ بێچوەکانیان. خوای گەورە نەوەدونۆ بەزەییەکەی تری هەڵگرتووە بۆ ڕۆژی کۆتایی).

## هەندێك لەو کردەوانەی کە بەزەیی خوای گەورە بۆ خاوەن باوەڕان مسۆگەر دەکات

**١- بەزەیی هاتنەوە بەخەڵکانی سەر زەوی و بەئاژەڵاندا:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((الرّاحِمون یَرْحَمُهُم الرّحمان، إرحَموا مَـنْ في الأرضِ یَـرحَمكُم مَـنْ في السَّـماءِ))[179] واتـە: ( بەبەزەیی یەکان خوا بە بەزەیی دەبێت بۆیان، بەزەییتا ن هەبێت بەوانەی لەزەویدان، ئەوەی لەئاسماندایە کەخودایە بەزەیی دەبێت بۆتان (واتە: خوای گەورە لەسەر عەرشی خۆیەتی لەسەرو ئاسمانەکان).

ئوسامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... وإنَّما یَرحَمُ اللهُ مِنْ عِباده الرُّحَماء))[180]، ((... و الشاةُ إنْ رَحِمتَها رَحِمَكَ اللهُ))[181]. واتە: (....ئەوانەی کە خوا بەزەیی دەبێت بۆیان لەبەندەکانیدا: بەندە بەبەزەیی یەکانن وە ((گەر تۆ بەزەییت بە مەڕدا بێتەوە خوا بەزەیی بە تۆ دا دێتەوە)) هەروەها ئەبو ئومامە

---

[178] أخرجه: مسلم (٢٧٥٢، ٦٩٠٨)

[179] أخرجـه: أحمـد (٦/١)، وأبـوداود (٤٩٤١)، و الترمـذي (٣٦٥٨) و قـال: حـديث حسـن، والحـاكم (٢٤٨/٤) و صححه و وافقه الذهبـي، و في ((جِلاء الأفهام)) (ص: ٨٤) قال محققه الشیخ الأرناؤوط: حدیث صـحیح، وصـححه الشیخ الألباني في ((السـلسلة الصحیحة)) (٩٢٥) وفي روایة: ((خـاب عبـدٌ وخسـر لم یجعـل الله تعـالی في قلبـه رحمـة للبشر)) أخرجه: ابـن عسـاکر (٥٩/٧) وصـححه الشـیخ الالبـاني في ((الصـحیحة)) (٤٥٧) و((صـحیح الجـامع)) (٣٢٠٥).

[180] أخرجه البخاري (١٢٤٨)، و مسلم (٩٢٣) .

[181] أخرجه أحمد (٤٣٩/٣)، و البخـاري في ((الأدب المفـرد)) (٣٧٣)، و الحـاکم (٥٨٦/٣)، وأبـو نعـیم في ((الحلیـة)) (٣٠٢/٢) و قال الهیثمي في ((المجمع)) (٣٣/٤): رجاله ثقـات، وقـال الأرنـاؤوط في تحقیقـه علـی ((جـلاء الإفهـام)) (ص: ٨٤) و ((جامع العلوم)) (٣٩٣/١): إسناده صحیح، وصـححه الشـیخ الألبـاني في: ((السلسـلة الصـحیحة)) (٢٦)، و في ((صحیح الأدب المفرد)) (٢٨٧) .

(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ رَحِمَ ولو ذَبيحة عَصفُورٍ رَحِمَهُ الله يوم القيامةِ))[١٨٢] واتە: ( هەرکەسێك ڕەحم وبەزەیی هەبێت بۆ سەر بڕینی چۆلەکەیەك، خوای گەورەش بەزەیی دێتەوە بەودا لەڕۆژی کۆتاییدا).

**٢- ئەو موسوڵمانەی کە مزگەوتی کردووە بەماڵی خۆی:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((المَسجِدُ بيتُ كلِّ تَقيٍّ، و تَكَفَّلَ الله لِمَنْ كان المَسجدُ بيتَهُ بالرّوحِ و الرَّحمةِ...))[١٨٣] واتە: مزگەوت ماڵی هەموو کەسێکی پارێزگارە، خوای گەورە کەفیلی ئەو کەسەی کردووە بەڕەحم و بەزەیی خۆی کە مزگەوت بۆتە ماڵی)، بەڵکو موسوڵمانانی هاتوچۆکار بۆ مزگەوتانی خوا دراوسێی خوای گەورە دەبن لەڕۆژی کۆتاییدا، ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ اللهَ يُنادي يومَ القيامةِ: أينَ جيراني أينَ جيراني ؟ قالَ: فَيَقولُ المَلائِكةُ: رَبَّنا و مَنْ يَنبَغي أنْ يُجاوِرَكَ ؟ فيقولُ: أينَ عُمَّارُ المَساجِدِ))[١٨٤] واتە: خوای گەورە لەڕۆژی کۆتاییدا بانگ دەکات: لەکوێن دراوسێکانم ؟ لەکوێن دراوسێکانم ؟ فەرمووی (واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ)) مەلائیکەکانیش دەفەرموون: پەروەردگارمان کێ هەیە شایستە بێت کە دراوسێیەتیت بکات؟ دەفەرموێت (واتە:خوای گەورە)لەکوێن ئەوانەی مزگەوتەکانیان ئاوەدان دەکردەوە).

**٣- ڕق خواردنەوە (کظم الغیظ):**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَنْ كَظَمَ غَيظاً وَلَوْ شاءَ أنْ يَمضيَهُ لأمْضاهُ ملأ اللهُ قَلبَهُ رجاءً يومَ القيامةِ))[١٨٥] واتە: (هەرکەسێ ڕقێ خۆی بخواتەوە و ئەگەر بیەوێت دەری بڕێت دەتوانێت کە دەری بڕێت ئەو کەسە خوا دڵی پڕ دەکات لە هیوا لەڕۆژی کۆتاییدا).

---

[١٨٢] أخرجه: البخاري ((الأدب المفرد)) (٣٨١)، و الطبراني ((الكبير)) (٧٩١٥)، و قال الهيثمي ((المجمع)) (٤/٣٣): رجاله ثقات، وحسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة))(٢٧)، و((صحيح الأدب المفرد)) (٢٩٤) .

[١٨٣] أخرجه: أبو نعيم في: ((الحلية)) (٦/١٧٦)، والقضاعي في: ((مسند الشهاب)) (١/١٤٠)، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٧١٦)، و في ((تمام المِنّة)) ص (٢٩٢)، و في ((صحيح الترغيب)) (٣٢٨) .

[١٨٤] أخرجه: الحارث بن أبي أسامة في ((مسند)) (٢/٧٢)، و صححه الشيخ الألباني في((السلسلة الصحيحة)) (٢٧٢٨) .

[١٨٥] أخرجه: الطبراني في ((الكبير)) (١٣٦٤٦)، وابن عساكر (١/١٨)، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٧٦)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٠٦) .

**٤- ئەنجامدانی ئەو کارە چاکانەی کە خۆشەویستی خوا بۆ خاوەنەکانیان مسۆگەر دەکەن:**

**ثەوبان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ان العبدليلتمس مرضاة الله فلا يزال بذلك فيقول الله لجبريل: ان فلانا عبدي يلتمس ان يرضيني الا وانّ رحمتي عليه فيقول جبريل: رحمة الله على فلان، ويقولها حملة العرش و يقولها من حولها حتى يقولها أهل السماوات السبع ثم تهبط له الى الارض))[١٨٦] واتە: بەندەی واهەیە لە هەوڵدایە تاخوا لێی ڕازی بێت و لەو پێناوەدا بەردەوامە، تا خوای گەورە بە جبریل (عليه السلام) دەفەرموێت:فلان کەسی بەندەم لە هەوڵی ئەوەدایە من ڕازی بکات لەخۆی ئێستا ڕەحمەتی منی لەسەر بێت (واتە: بەزەیی منی بۆ مسۆگەرە) . جبریل (عليه السلام) دەڵێت: ڕەحمەت وبەزەیی خوا لەسەر فلانە کەس بێت، پاشان هەڵگرانی عەرش ئەو وتەیە دووبارە دەکەنەوە، لەپاش ئەوان ئەوانەی چوار دەوری ئەوان ئەو وتەیە دووبارە دەکەنەوە تا هەموو نیشتەجێیان لە ئاسمانەکان ئەوە دووبارە دەکەنەوە، پاشان دادەبەزێتە سەر زەوی) .**

**لەو کارە چاکانەش: موتەقیەکان و شوێن کەوتووانی سوننەتی پێغەمبەر، تەوبەکردن، پاك و خاوێنی ڕاگرتن، پشت بەستن بەخوا، دادپەروەری، ئارامگرتن، چاکەکردن، تێ کۆشان لەپێناوی خوا: وەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة: ٢٢٢).

﴿.... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ﴾ (آل عمران: ١٥٩ ).

﴿....إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ (الحجرات: ٩) أو(المائدة: ٤٢ ) أو(الممتحنة: ٨ ).

﴿....وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (آل عمران: ١٤٦).

﴿....إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ (البقرة: ١٩٥ ).

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ (الصف: ٤).

﴿....إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ (التوبة: ٧ ).

﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ....﴾ (آل عمران: ٣١) .

﴿......فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ .....﴾ (المائدة: ٥٤ )

---

[١٨٦] اخرجه: أحمد (٢٢٤٠١) و قال محققه: اسناده حسن، والطبراني (الأوسط) (١٢٦٢).

هەرکەسێك یەکێك لەم کردەوەچاکانەی تیا بێت دەیگەیەنێتە ئەوەی خۆشەویستی خوای بۆ مسۆگەر بکات ئەوکەسە خوای گەورە فڕێی ناداتە ناو ئاگرەوە و ڕزگاری دەکات لە دۆزەخ، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا، و اللهُ لا يُلقي حَبيبَهُ في النار))[187] واتە: (نەخێر پەروەردگاریش خۆشەویستی خۆی فڕێ ناداتە ناو ئاگرەوە)، بێ گومان بەزەیی خوا تایبەتە بەخاوەن باوەڕان وەك خوای گەورە دەفەرموێت﴿.....وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمًا﴾ (الاحزاب: ٤٣ ).

ڕەحمی خواش سەد پلەیە، یەك پلەی هێناوەتە دونیا نەوەد ونۆ پلەی هەڵگرتووە بۆ پیاو چاکان لەڕۆژی کۆتاییدا: ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ لِلّه مائِة رَحمةٍ قَسَّمَ منها رَحمةً بين أهلَ الدنيا وَ سعتُهُم إلى آجالِهِم و أخَّرَ تِسعَةً و تسعين لأوليائِهِ يومَ القيامةِ))[188] واتە: (خوای گەورە سەد بەزەیی هەیە یەك بەزەیی بەش کردووە لەنێوان خەڵکی دونیادا کە بەشی کردوون تا تەواو بوونی ئەجەلەکانیان، و نەوەدو نۆکەی هەڵگرتووە بۆ پیاوچاکانی خۆی لەڕۆژی کۆتاییدا).

پیاوچاکانی خوا ئەوانەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاری کرددوون، عەمری کوڕی واقید (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ أولياءَ اللهِ المُصَلونَ، و مَنْ يُقيمُ الصلوات الخمس التي كَتَبَهُنَ الله على العبادِ، و يَصومُ رَمَضانَ، و يَحتسِبُ صومَهُ، و يُؤتي الزكاة طَيِّبةً بها نَفْسهُ يَحتَسِبُها، و يَجتَنِب الكبائر التي نَهى اللهُ عنها))[189] واتە:

---

[187] أخرجه: أحمد ((المسند)) رقم (١٢٠١٨) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرطها، والبزار (٣٤٧٦) . وأبو يعلى (٣٧٤٧)، و الحاكم (٥٨/١) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، و قال الحافظ ابن كثير في ((تفسير القرآن العظيم))(٥٣٢/٤) أخرجه أحمد بإسنادٍ على شرط الشيخين . و قال الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (٢١٣/١٠): رواه أحمد و البزار و رجالهما رجال الصحيح .

[188] أخرجه: الحاكم (٥٦/١) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، و اللفظ له . و الحديث عند الإمام أحمد ورد بلفظ: ((لله عز وجل مِئةُ رَحمةٍ و إنَّهُ قَسمَ رحمةً واحدة بين أهل الأرضِ، فَوَسِعَتهُم إلى آجالِهِم، و ذَخَرَ تِسعةً و تسعين رحمةً للأوليائِهِ، و اللهُ عز و جل قابِضٌ تلك الرحمة التي قَسمها بين أهل الأرض إلى التسعِ و التسعينَ فَيُكمِّلُها مِئةَ رحمةٍ للأوليائِهِ يوم القيامة)) رواه: أحمد ((المسند)) (١٠٦٧٠) و قال محققه الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وقال الهيثمي في: ((المجمع)) (٣٨٥/١٠): رجاله رجال الصحيح .

[189] أخرجه: أبو داود (٢٨٧٥)، والنسائي (٧/٨٩) . و الحاكم (٥٩/١)، والطبراني في ((الكبير)) (١٠١/١٧) و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٤٨/١): ورجاله موثقون، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)): (٢٤٩٩) .

(پیاوچاکانی خوا نوێژ خوێنانن، هەرکەسێك پێنج نوێژەکە بکات کە خوا پێویستی کردووە لەسەر بەندەکان، و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت و چاوەڕێی پاداشتی ڕۆژووەکەشی بکات، و زەکاتیش بدات و پێی خۆش بێت لە ناخی دڵی یەوە چاوەڕێی پاداشتەکەشی بکات، وخۆی بپارێزێت لە گوناهە گەورەکان کە خوای گەورە داوای دوور کەوتنەوەی لێ کردوون).

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە بەزەیی خوا دیاری دەکات بۆ پارێزگاران (المتقين)، سەلمانی فارسی (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ اللهَ خَلَقَ مِئةَ رحمةٍ كلُّ رحمةٍ ملءَ ما بين السَّماءِ و الأرض ... فإذا كان يوم القيامة قَصَرها على المُتقينَ و زادَهُم تِسعاً و تسعين))[١٩٠] واتە: ( خوای گەورە سەد بەزەیی دروست کردووە هەموو بەزەیی یەك پڕ بەنێوان زەوی و ئاسمانە ....کە ڕۆژی کۆتایی هات نەوەدونۆ بەزەییەکەی تریش دەبەخشێ بەپارێزگاران).

سیفاتی (متقی)یەکان ئەو سیفاتانەیە کە خوای گەورە دیاری کردووە لە قورئانداو فەرموویەتی: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ (البقرة: ١٧٧). واتە: ﴿کرداری چاك و کاری باش تەنها بریتی نیە لە ڕووکردنتان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکو کرداری چاك و کاری باش بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هەبێت بە خوا و ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و کتێبە کان و بە پێغەمبەران، هەروەها ماڵ و سامانی بەخشیبێ بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و داواکاران و لە پێناوی ئازادکردنی بەندەکاندا، هەروەها نوێژی بە چاکی ئەنجامدا بێت زەکاتیشی لە ماڵ و سامانی دەرکردبێت و ئەوانەی وەفادار بن بە پەیمانەکانیان کاتێك پەیمانیان دابێت، ئەوانەش کە لەکاتی نەداریی و هەژاری و نەخۆشی و

---

[١٩٠] أخرجه: الحاكم (٤/٢٤٧) و صححه على شرط مسلم، ووافقه الذهبي، والطبري،((الكبير)) (٦١٤٤).

ناخۆشی و کاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا ئارامگرن، ئائەوانە کەسانێکن ڕاستیان کردووە و هەر ئەوانیش پارێزگار و خواناسن﴾.

هەر کەسێك ئەگەر بیەوێت بگاتە ڕیزی (متقی)یەکان دەبێت زۆر خۆی بپارێزێت لەوانەی کە قەدەغە نەکراوان (مەبەست شوبهاتە) نەوەك ببێتە هۆی کەوتنە ناو ئەو شتانەی کە قەدەغە کراون . ئەمەش تەنها لەڕیوایەتێکی (لاوان)دا هاتووە کە سەعد (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ الرجلَ لا یکون من المُتقین حتَّی یدَعُ ما لا بأسَ بِهِ حَذَراً لِما بِهِ بأس))[١٩١] واتە: (کەسێك نابێت بە متقی هەتاکو واز نەهێنێت لەو شتانەی کە قەدەغە نەکراون (وەك خۆ پاراستنێك) بۆ نەکەوتنە ناو ئەو شتانەی کە قەدەغە کراون). لەبەر ئەمانە پێویستە لەسەر ئادەمیزادی ژیرو عاقل کە سستی نەکات لەکردەوەی چاك و پێویستە هەمیشە بەردەوام بێت لەسەر کارە چاکەکانی چونکە ئەگەر وا نەبێت بەڵگەی پێ نەدراوە کە خوا ڕەحمی پێ دەکات چونکە خوا ڕەحم دەکات بەو کەسانەی کە خۆی دەیەوێت وەك دەفەرموێت:

﴿....وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ...﴾ (البقرة: ١٠٥) واتە: ﴿....خوا ڕەحمەتی خۆی تایبەت دەکات بەهەر کەسێك بیەوێت و شایستەی بێت.......﴾، خاوەن باوەڕانی پارێزگاران بێ گومان نزیکترن لە ڕەحمی خوا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿....وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ﴾ (الأعراف: ١٥٦). واتە:﴿ ڕەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتۆتەوە،جا ئەو ڕەحمەت و میهرەبانیەم تۆمار دەکەم بۆ ئەو کەسانەی کە پارێزگاری دەکەن و زەکات دەدەن و ئەوانەش کە باوەڕی تەواو بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەهێنن﴾.

---

[١٩١] أخرجه: الحاكم (٤/٣١٩) و صححه و وافقه الذهبي . و الترمذي: (٢٤٥١) و قال: حديث حسن غريب، و ابن ماجة (٤٢٩٢)، و ضعّفه الشيخ الألباني في: ((ضعيف سنن الترمذي)) (٢٤٥١)، و ((ضعيف سنن إبن ماجة)) (٤٩٧٧).

## ئەوانەی کە بۆنی بەهەشت ناکەن

لەو ڕۆژە ترسناکە گەورەیەدا کۆمەڵێك لەخەڵکی موسوڵمان بۆنی بەهەشت ناکەن تەنانەت لەدووریشەوە بۆنی ناکەن لەبەر چەند کردەوەیەك کە کردوویانە لەژیانی دونیادا لەوانە:

**١- فێر بوونی زانستی شەرعی لە پێناوی پەیداکردنی سامانی دونیادا:**

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ تَعَلَّمَ عِلماً مِمَّا يبتَغي بِهِ وَجهَه الله لا يَتعلَمُهُ إلاَّ لِيُصيبَ بِه عرضاً مِنْ الدنيا لَمْ يَجِد عُرفَ الجنة يوم القيامةِ))[١٩٢] واتە: (هەر کەسێك زانستێك فێر بێت لەوانەی کە تەنها بۆ خوا ئەنجام دەدرێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە شتێکی دونیایی پێ دەست بخات ئەو کەسە بۆنی بەهەشت ناکات لەڕۆژی کۆتاییدا ).

کەواتە پێویستە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها لە پێناوی خوادا فێرببین. ئەبو ئیدریسی خەوەلانی (رحمه الله) دەفەرموێت: "الذي يبتغي الاحاديث ليحدث بها لايجد ريح الجنة"[١٩٣] .واتە: (ئەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) فێردەبێت تەنها بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی باس بکات (واتە: تا خەڵکان پێی بڵێن: فەرموودەناسە) ئەو کەسە بۆنی بەهەشت ناکات).

**٢- ئەوانەی سەرو ڕیشیان بۆیە دەکەن بەبۆیەی ڕەش:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((يَكون قومٌ يَخْضُبونَ في آخِرِ الزمان بالسّواد كَحواصِلِ الطَّيرِ لا يُريحون رائِحة الجنَّةِ))[١٩٤] واتە:(کۆمەڵە خەڵکانێك دەبن لەئاخر زەماندا

---

[١٩٢] أخرجه: أحمد (٢/٣٣٨)، وأبوداود (٣٦٦٤)، وابن ماجة (٢٥٢)، والحاكم (١/٨٥) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وابن حبان (٧٨) وقال محققه:حديث صحيح، وصححه النووي ((رياض الصالحين)) (ص: ١٩٦) إسناده صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (٢٢٧)، و ((صحيح سنن أبي داود)) (٣١١٢)، و ((إقتضاء العلم)) (١٠٢) .

[١٩٣] أخرجه:ابن ابي شيبة ((المصنف)) (٨/٥٤٢)، وابن عبد البر((جامع بيان العلم)) (١١٣١) وقال محققه: حسن .

[١٩٤] أخرجه: أحمد (٢٤٧٠) و قال محققه شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، و النسائي (٨/١٣٨)، وأبي داود (٤٢١٢)، و الطبراني في ((الكبير)) (١٢٢٥٤)، وقال الشيخ أحمد شاكر في تحقيقه على ((المسند))

بۆیەی ڕەش بەکاردێنن ( واتە: سەرو ڕیشیان بۆیەی ڕەشی لێ دەدەن ) وەك سەرسنگی باڵندە، بۆنی بەهەشت ناکەن).

**٣- ئافرەتانی ڕووت و قووتی لادەر لە ئایین:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((صِنفانِ مِنْ أهلِ النارِ لَمْ أرهُما ..... و نِساءٌ كاسياتٌ عارياتٌ مائِلاتٌ مُميلاتٌ رؤوسُهُنَّ كأسْنِمةِ البُختِ المائِلةِ لا يدْخُلنَ الجنَّة ولا يَجِدنَ ريحَها))[١٩٥] واتە: ( دوو کۆمەڵ هەن لە خەڵکی ناو ئاگر نەم بینیون "،.... وئافرەتانێکی پۆشتەی ڕووتی لارو لەنجەکاری لادەر لە دین سەریان وەك سەر پشتی حوشتری لار وایە ناچنە بەهەشت و بۆنیشی ناکەن).

**٤- درۆ کردن بەناوی پێغەمبەرەوە (ﷺ) یان بەناو خەوەوە یاخود بەناو دایك و باوکەوە:**

ئەوسی کوڕی ئەوس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ كَذَّبَ على نبيِّهِ،أو على عَيْنَيْهِ، أو على والِدَيهِ لَمْ يُرِحْ رائِحةَ الجَنَّةِ))[١٩٦] واتە: (هەر کەسێ درۆ بکات بەناو پێغەمبەرەکەیەوە یان درۆ بە چاویەوە بکات (واتە: خەونێك نەبینێت و بەدرۆ بیگێڕێتەوە بۆ خەڵکان)، و ئەوەی درۆ بەناو دایك و باوکیەوە دەکات (واتە: خۆی بە وەچەی ئەو دایك وباوکە نازانێت) بۆنی بەهەشت ناکات ).

**٥- ئەو ئافرەتانەی داوای تەلاق لەمێردەکانیان دەکەن بەبێ هیچ هۆیەکی شەرعی:**

ثەوبان (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أيّما إمرأةٍ سألَتْ زَوجَها الطلاقَ مِنْ غيرِ بأسٍ حرَّمَ اللهُ عليها أن يريحَ رائِحةَ الجَنَّةِ))[١٩٧] واتە: (هەر

---

(١٥٦/٤): صحيح، وقال الحافظ ابن حجر العسقلاني في ((فتح الباري)) (٤٩٩/٦) إسناده قوي، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٣٥٤٨)، و في ((غاية المرام)) رقم (١٠٧) (ص ٨٤:)، وقال في ((تمام المنة)) (ص ٨٥:)، و ((صحيح النسائي)) (٤٦٩٩)، و ((المشكاة)) (٤٤٥٢).

[١٩٥] أخرجه:أحمد (٣٥٥/٢)، ومسلم (٢١٢٨)، والبيهقي (٢٣٤/٢)، وابن حبان (٧٤٦١) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم .

[١٩٦] أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٥٩١) . وقال الهيثمي في ((المجمع)) (١٤٨/١): إسناده حسن.

[١٩٧] أخرجه: أحمد (٢٧٧/٥)، و أبوداود (٢٢٢٦)، والترمذي (١١٨٧) و قال: حديث حسن، وابن ماجة (٢٠٥٥)، و الحاكم (٢٠٠/٢) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وابن حبان (٤١٨٤) و قال محققه إسناده صحيح على

ئافرەتێك داوای تەڵاق لەمێردی بکات بەبێ هیچ هۆیەك، خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەری بۆنی بەهەشت بکات ، لەڕیوایەتێکدا ((.... فَحرامٌ عَليها رائِحة الجَنَّة))[198] واتە: ....ئەو کەسە حەرام کراوە لەسەری بۆنی بەهەشت بکات).

**٦- هەرکەسێك خۆی بە منداڵی باوکی نەزانێت:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَنْ ادَّعى إلى غَيرِ أبيهِ لَمْ يَرِح رائِحة الجَنَّة))[199] واتە:(هەر کەسێ خۆی بە منداڵی باوکی خۆی نەزانێت بۆنی بەهەشت ناکات ) .

**٧- ئەو سەرکردەیەی کە دڵسۆز نەبێت بۆ گەلەکەی:**

مەعقەلی کوڕی یەسار(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ما مِنْ عبدٍ استَرعاهُ الله رعيَّةً فَلَمْ يَحُطها بِنَصيحةٍ إلاَّ لَمْ يَجِدْ رائِحة الجَنَّة))[200] واتە: (هەر بەندەیەك کە خوای گەورە کەسانێکی خستبێتە ژێر دەسەڵاتیەوە و دڵسۆزی و ئامۆژگاری نەکردبن ئەو کەسە بۆنی بەهەشت ناکات) .

**٨- ئەوەی ( معاهد ) ێك بکوژێت:**

(معاهد) ئەو کەسەیە کە (جوولەکەیە یان گاورە) و سەرانە دەدات بەفەرمانڕەوای موسوڵمانان و ڕێگە پێ دراوە بە سەربەستی بژی لە نێوان موسوڵماناندا. عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((مَنْ قَتلَ نفساً مُعاهِدةً لَمْ يَرِحْ رائِحةَ الجَنَّة...))[201] واتە: ( هەر کەسێك (معاهد)ێك بکوژێت بۆنی بەهەشت ناکات) وە لە ڕیوایەتێکدا: ((سيكونُ قومٌ لَهم عَهْدٌ فَمَنْ قتلَ رجُلاً مِنهُم لَمْ يَرِحْ

---

شرط مسلم، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٢٧٠٦)، و ((المشكاة)) (٣٢٧٩)، و ((ارواء الغليل)) (٣٥)، و ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٦٧٢)، و ((صحيح سنن أبي داود)) (١٩٤٧) .

[198] في رواية الترمذي .

[199] أخرجه: الحاكم (٤٤/١) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٥٩٨٨)، و((الصحيحة)) (٢٣٠٧) .

[200] أخرجه: البخاري (١٩٦٩/٤) .

[201] أخرجه: البخاري (٦٩١٤)، وابن ماجة (٢٦٨٦)، والحاكم (١٢٦/٢) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢١٧٥) .

رائِحةَ الجنَّة))[٢٠٢] واتە: ( کۆمەڵە کەسانێکی خاوەن پەیمان دەبن هەرکەسێك پیاوێك لەوانە بکوژێت بۆنی بەهەشت ناکات) .

## بۆنی بەهەشت لە چەندەها دووری جیاواز جیاواز بۆن دەکرێت

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((.... و إنَّ رِيحَها تُوجَـدُ مِـنْ مَسيرةِ أربعينَ سنةٍ))[٢٠٣] واتە: (....بۆنی دێت لە دووری چل ساڵەوە)، وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((...و إنَّ رِيحَهـا لَتُوجَـدُ مِـنْ مسـيرةِ سـبعين عامـاً))[٢٠٤] واتە: (...بۆنی دێت لە دووری حەفتا ساڵەوە)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((...إنَّ رِيحَها لَتُوجَدُ مِنْ مسيرةِ مِائـةِ عـامٍ))[٢٠٥] واتە:(...بۆنی دێت لە دووری سەد ساڵەوە)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((...و إنَّ رِيحَهـا[ريـح الجنَّـة] لَتُوجَـدُ مِـنْ مسـيرةِ خمسُـمِائةِ عـامٍ))[٢٠٦] واتە:(...بۆنی بەهەشت دێت لە دووری پێنج سەد ساڵەوە )، ئالەم جیاوازیەوە ئەوە دەردەکەوێت کەنزیکی و دووری بۆنی بەهەشت بەگوێرەی پلەو کارە چاکەکانی ئەو موسوڵمانەیە کە پێ دەچێت هەندێ لەو موسوڵمانە پلە نزمانە لە دووری چل ساڵەوە بۆنی بەهەشت دەکەن، بەڵام هەندێك لەموسوڵمانە پلە بەرزەکان لە دووری پێنج سەد ساڵەوە بۆنی بەهەشت دەکەن (واللە اعلم).

---

[٢٠٢] أخرجه: أحمد ((المسند)) (١٦٩٥٠) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح .

[٢٠٣] أخرجه: البخاري (١٩٤٩/١)(٦٩١٤) .

[٢٠٤] أخرجه: الترمذي (١٤٠٣) و قال: حسن صحيح، وابن ماجة (٢٦٨٧) . و النسائي (٢٥/٨)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١١٣٢)، و ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢١٧٦)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٠٧) .

[٢٠٥] أخرجه: ابن حبان (٧٣٨٢) و قال الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٠٦) .

[٢٠٦] أخرجه:أحمد (٢٠٥٠) وقال محققه: حديث صحيح، والحاكم (٤٤/١) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٧٣٨٣) و قال محققه: حديث صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) كما في ((ترتيب صحيح الجامع)) (١٠٥/٣) (٥) (٥٩٨٨)، و((السلسلة الصحيحة))(٢٣٠٧). و في رواية أحمد (٦١/٤): ((...إنَّ رِيحَها لَتُوجَدُ مِنْ مسيرة تسعين عاماً)) و رجاله رجال الصحيح – كما قال الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (٢٩٣/٦) .

# هەندێ لەو موسوڵمانانەی نزیکن لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لە مەحشەردا

**١- ئەوانەی کە زۆر سلاوات لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەدەن .**

ئەبو ئومامە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((صلاةُ أمّتي تُعرَضُ عليَّ كلَّ يوم جمعةٍ، فَمَنْ كان أكثرَهُم عليَّ صلاةً كان أقربَهَم مني مَنزِلةً))[٢٠٧] واتە: (سلاواتی ئومەتەکەم نیشانم دەدرێت لە هەموو جومعەیەکدا، هەرکەسێکیان زیاتر سلاواتی لە من دا بێت، ئەو کەسە لە هەموویان زیاتر جێگەی نزیکترە لە منەوە) .

**٢- خاوەنی خوڕەوشتی جوان و چاك .**

عەبدولای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((...ألا أخبِرُكم بأحَبِّكُم إليَّ، وأقرَبكُم منِّي مَجلِساً يوم القيامةِ ؟! أحاسِنُكم أخلاقاً، وإنَّ أبْغَضَكُم مني مَجلِساً يوم القيامةِ الثّرثارون، و المُتَشَدِّقون، و المُتَفَيهِقونَ))[٢٠٨] واتە: (...ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خۆشەویست ترینتان لای من و نزیکترینتان لە کۆڕی من لەڕۆژی کۆتاییدا: خوڕەوشت جوانەکانتانن، و ئەوانەی لە هەمووانتان زیاتر ڕقم لێ یەتی و دوورترینتان لە کۆڕی منەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا چەنەبازەکانن (واتە: ئەوانەی کە زۆر قسەی پوچ و بەتاڵ دەکەن کە خوا پێی ڕازی نی یە)، و ئەوانەی کە قسە بە فیزەوە دەکەن، و فیز زل وخۆ بەزل زانەکانن ) .

**٣- ئەوانەی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا و لەسەر دونیا نەویستی ماونەتەوە و نەگۆڕاون .**

ئەبوزەڕ(رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((من لە هەمووتان لە ڕۆژی کۆتاییدا لە پێغەمبەر (ﷺ) نزیك ترم من گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر ی خوا (ﷺ) دەیفەرموو: ((اني لأقربكم يوم

---

[٢٠٧] أخرجه: ابن أبي شيبة (١١/٥٠٥) و أبو يعلى (١/٢٣٢)، وابن حبان (٩١١)، البزار (١/٢٤٠)، والطبراني في ((الكبير)) (٩٨٠٠)، والبيهقي ((الدعوات)) (١/١٨)، وقال المنذري ((الترغيب)) (٣/٣٠٣): إسناده حسن، وقال الحافظ ابن حجر العسقلاني ((فتح الباري)) (١١/١٦٧): سنده لا بأس به، و قال الإمام السخاوي ((القول البديع)) (ص ١٥٨) إسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (١٦٧٣)

[٢٠٨] أخرجه: أحمد (٢/٢١٧)، والبخاري ((الأدب المفرد)) (٢٧٢)، والترمذي (٢٠١٨)، و الطبراني ((الكبير)) (١٠٤٣٢)، وابن حبان (٤٨٥) و قال محققه: إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (٢٠٦)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٧٩١) .

القيامة من رسول الله اني سمعت رسول الله ﷺ يقول: ((انَّ أقربكم مني يوم القيامة من خرج من الدنيا كهيئته يوم تركته عليه))[٢٠٩] واتە: (نزیکترینتان لە من لە ڕۆژی کۆتاییدا ئەوانەن کە لە دونیا دەرچوون و وەك ئەو ڕۆژە وابوون کە لە دونیادا بەجێم هێشتوون).

**٤- ئەو ئافرەتانەی لە دوای مردنی مێردەکانیان شویان نەکردۆتەوە وخزمەتی منداڵەکانی خۆیان کردووە.**

عەونی کوڕی مالیك (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أنا وامراةٌ سفعاء الخدّين كها تين يوم القيامة، وجمع بين اصبعيه السبابةوالوسطى: ( امراة ذات منصبٍ و جمالٍ آمتْ من زوجها حبست نفسها على ايتامها حتى بانوا أو ماتوا))[٢١٠] واتە: (من و ئافرەتێکی پیری لێوسوور لە ڕۆژی کۆتاییدا ئاوها لە نزیك یەکین و ئیشارەتی کرد بە هەردووپەنجەی شایەتمان لەگەڵ پەنجەی ناوەڕاستدا، ئەوەش ئافرەتێکی خاوەنی جوانی و پلەوپایە بووە لە دوای مردنی مێردەکەی شووی نەکردووەتەوە وخۆی تەرخان کردووە بۆ خزمەتکردنی منداڵە بێ باوکەکانی تا منداڵەکان گەورە بوون وجیابوونەتە ویاخود یان مردوون).

**٥- ئەو بازرگانەی کە موسوڵمان و ڕاستگۆ و متمانەی پێ کراوە.**

عەبدولای کوڕی عومەر (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((التاجرُ الأمين الصدوق المسلم مع [ النبيين والصديقين] و الشهداء يوم القيامة))[٢١١] واتە: (بازرگانی متمانە پێ کراو و ڕاست گۆ و موسوڵمان لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکاندایە لە ڕۆژی کۆتاییدا) .

**٦- بنەماڵەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).**

ئیمامی عەلی (ﷺ) دەگێڕێتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((اني و اياك ( أي: فاطمة) وهذين ( الحسن و الحسين ) و هذا الراقد (يعني عليا) يوم القيامة في مكان واحدٍ "يعني

---

[٢٠٩] أخرجه: أحمد (٢١٤٥٨) وقال محققه: محتمل التحسين.

[٢١٠] أخرجه: أحمد (٢٤٠٠٦) وقال محققه: اسناده حسن لغيره، وابو داود (٥١٤٩)، والطبراني (١٠٣/١٨)، والبيهقي ((شعب)) (٨٦٨) وعبد الرزاق (٢٠٥٩١) .

[٢١١] أخرجه: ابن ماجة (٢١٣٩)، والحاكم (٦/٢)، والدار القطني (٧/٣) (٢٧٨٩)، والبيهقي (الشعب) (٢٦٦/٥) (١٢٣٠-٤٨٥٠) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٣٤٥٣)، و (صحيح الترغيب) (١٧٨٢،١٧٨٣).

فاطمة ولـديها الحسـن و الحسـين ﷺ"))[٢١٢] واتـە: (فـاطمـە مـن و تـۆ و ئـەو دووانـە (واتـە: حەسەن و حوسەین (رضي الله عنهما)) وە ئەو پـاڵ كـەوتووە (واتـە: ئیمامی عـەلی (ﷺ)) لە ڕۆژی كۆتاییدا لەیەك جێگەداین).

**٧- ئەوەی بژێوی و پەروەردەی دوو كچ یان دوو خوشكی بگرێتە ئەستۆ.**

ئەنەس (ﷺ) گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من عال جـار يـتين حتـى تبلغا جاء يوم القيامة انـا و هـو وضـم اصـابعه))[٢١٣] . واتـە: (هـەر كەسێك دووكچـی خـۆی بەخێو بكـات (واتـە: بـژێویان بـۆ دابین بكـات) تـا گـەورە دەبـن ئـەو كەسـە لـە ڕۆژی كۆتاییـدا دێـت و لەگـەڵ منـدا دەبێـت ئـاو هـا پاشـان هـەموو پەنجـەكانی نووسـان بەیەكەوە).

**٨- ئەوانەی پێغەمبەریان (ﷺ) زۆر خۆش ویستووە.**

ئەنــەس (ﷺ) گێڕاویەتیــەوە و فەرموویــەتی: پیاوێـك جارێكیـان پرسـیاری لـە پێغەمبەر (ﷺ) كرد و وتی: كەی قیامەت دێت ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تـۆ چیت بـۆ ئامادە كردووە ؟ پیاوەكەش وتـی: هـیچ شتێكم نی یە تەنها ئەوەم هەیە كە خوا و پێغەمبەرم (ﷺ) خۆش دەوێت . پێغەمبەر (ﷺ) پـێی فـەرموو: ((انـت مـع مـن أحببـت)) واتە: تۆ لەگەڵ ئەوانە دایت كە خۆشت دەوێن).

ئەنەس (ﷺ) دەفەرموێت: ئێمە زۆر زۆر دڵخۆش بووین بە ئەم وتەیەی پێغەمبەر (ﷺ) و دەفەرموێت: ((فانا أحب النبـيّ وابابكر وعمر و ارجو أكون معهـم بحـبي ايّـاهم))[٢١٤] . واتە: (منیش پێغەمبـەر (ﷺ) و ئـەبو بـەكر و عومـەرم زۆر خـۆش دەوێـت و هیوام وایە لەگەڵیاندابم بە خۆشەویستیم بۆیان).

---

[٢١٢] أخرجه: الطيالسي (٢٦/١٩٠)، وصححه الشيخ الألباني (الصحيحة) ( ٣٣١٩) .

[٢١٣] أخرجه: مسلم (٢٦٣١)

[٢١٤] أخرجه: البخاري (٣٦٨٨)، ومسلم (٢٦٣٩).

# هەندێك لەو كۆمەڵانەی كە خوای گەورە ڕوویان دوور دەخات لە ئاگری دۆزەخ لەڕۆژی كۆتاییدا

**١- ئەوەی بەرگری لە كەسایەتی برای خۆی دەكات كاتێك كە لە پاش ملە باسی دەكرێت (واتە :غەیبەتی دەكرێت ).**

ئەبی دەرداء (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((مَـنْ رَدَّ عن عِرضِ أخيهِ ردَّ الله عـن وجهـهِ النّـارَ يـومَ القيامـةِ))[٢١٥] واتـە:( هەركەسێك بەرهەڵستی (واتـە: پارێزگـاری) لـە كەسـایەتی برایـەكی بكـات خـوای گـەورە ئـاگر دەگێڕێتـەوە و دووری دەخاتەوە لەدەم و چاوی لەڕۆژی كۆتاییدا).

لەڕیوایـەتێكی تـردا لـە ئـەسمائی كچـی یەزیـد (رضـي الله عنهـا) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرمویەتی: ((مَنْ ذَبَّ عن عِرضِ أخيهِ بالغيبة كان حقاً على الله أنْ يَعتِقَهُ مِنَ النار))[٢١٦] واتە: (هەر كەسێك پارێزگاری لە كەسایەتی برایەكەی بكات بە پەنامەكی، ئەو كەسە خوا پێویستی كردووە لەسەر خۆی كە ئازادی بكات لە ئاگر ).

**٢- هەر كەسێ ڕۆژێك لە پێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت .**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَنْ صامَ يوماً في سبيلِ اللهِ باعَدَ اللهُ وَجهَـهُ عـن النـار سـبعينَ خريفـاً))[٢١٧] واتـە: (هەركەسێك ڕۆژێك بـەڕۆژوو بێـت لە پێناوی خـوادا خـوای گـەورە ڕووی دوور دەخـات لـەئاگر حـەفتا پـایین) ، لەڕیوایـەتێكی تـردا ((....مِئـةَ عامٍ))[٢١٨] واتە: (... خوا ڕووی دوور دەخاتەوە لە ئاگر سەد ساڵ ) .

---

[٢١٥] أخرجه: أحمد (٦/٤٤٩) (٢٧٥٣٦) وقال محققه: حسن لغيره،، والترمذي (١٩٣١) و قال: حديث حسن، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٥٧٥)، و((صحيح الترغيب))(٢٨٤٨).

[٢١٦] أخرجه: أحمد (٦/٤٦١) و إسناده حسن كما قال الهيثمي ((مجمع الزوائد)) (٨/٩٥)، والمنذري ((الترغيب)) (٤١٩٣)، و صححه الشيخ الألباني في: ((صحيح الجامع)) (٦١١٦)، و((صحيح الترغيب))(٢٨٤٧).

[٢١٧] أخرجه البخاري ( ١/١٧٤)، والنسائي (٤/١٠٣)، وصححه الشيخ الألباني في((صحيح سنن النسائي)) (٢١١٨-٢١٢٤) .

[٢١٨] أخرجه النسائي (٤/١٧٤)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٦٣٣٠)، و ((صحيح النسائي)) (٢١٢٨)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٢٥٦٥) . و في رواية: ((مَنْ صامَ يوماً في سبيلِ الله جعل اللهُ بينَهُ و بينَ النار خَندَقاً كم بين السماءِ و الأرضِ)) رواه الطبراني في الصغير الأوسط (٣٥٧٤) وقال محققه: اسناده حسن، و حسن اسناده ايضاً كل من الهيثمي في: ((المجمع)) (٣/١٩٤)، و المنذري ((الترغيب)) (١٤٤٤)،و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب))(٩٩١).

# ئاسان کردنی نارەحتیەکانی ڕۆژی کۆتایی لەسەر خاوەن باوەڕ

بڕواداران (المؤمنین) لە مەحشەردا کەم دەمێننەوە، واتە: وەك نیوە ڕۆژێکی لێ دێت لەسەریان، هەتا وەکو بەئەندازەی ڕۆژ ئاوابونێکی لێ دێت بۆ ئەوان، لە کاتێکدا کە ئەندازەی ئەو ڕۆژە پەنجا هەزار ساڵ درێژ دەبێت لەسەر بێ باوەڕان.

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((یَقومُ الناسُ لِرَبِّ العالمین مِقدارَ نصف یوم ( إنِّي لأرجُوا أنْ لا یُعجِز رَبِّي أنْ یُؤخِرَ أُمتي [عند رَبِّها] نِصفَ یوم)[219] مِنْ خَمسین ألفَ سنةٍ یُهونُ ذلك علی المُؤمِن کَتدلي الشمسِ لِلغروبِ إلی أنْ تَغرُب))[220] واتە: (خەڵکان دەوەستن بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانیان بەئەندازەی نیو ڕۆژ ( من هیوام وایە کە ئومەتەکەم دوانەخرێت لای پەروەردگاری بەئەندازەی نیو ڕۆژ) لە پەنجا هەزار ساڵ ئەو ڕۆژە ئاسان و کەم دەبێت سووك دەکرێت لەسەر خاوەن باوەڕ وەك ماوەی ڕۆژئاوابوونێك تا بە تەواوی ڕۆژ تیایدا ئاوا دەبێت).

لەڕیوایەتێکی تردا کە (ضعیف)ە ئەبی سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا وە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((و الذي نَفسي بِیَدِهِ إنَّهُ لَیُخَفِفُ علی المُؤمن حتَّی یَکونَ أهْونَ علیهِ مِنَ الصَّلاةِ المَکتُوبة یُصَلِّیها في الدُنیا))[221] واتە: (سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەوە (واتە: مانەوە لە قیامەتدا) ئاسان دەکرێت لەسەر خاوەن باوەڕ

---

[219] أخرجه: أبوداود (٤٣٢٧)، و الحاکم (٤/٤٢٤) و صححه علی شرطهما و وافقه الذهبي، و قال ابن کثیر في ((البدایة)) (٦/٢٥٣): إسناده جید، و صححه الشیخ الألباني في: ((صحیح سنن أبي داود)) (٣٦٥٦)، و في ((السلسلة الصحیحة)) (١٦٤٣)، و ((صحیح الجامع)) (٢٤٨١)، و ((المشکاة)) (٥٥١) .

[220] أخرجه: ابن حبان (٧٣٣٣) و قال الأرناؤوط: إسناده صحیح علی شرط البخاري، وأبو یعلی (٦٠٢٥) و قال الحافظ العراقي في تخریج ((الإحیاء)) (٤/٤٩٩): أخرجه أبو یعلی بإسناد جید، و قال الشیخ السفاریني ((لوامع أنوار البهیة)) (٢/١٦٨): أخرجه أبو یعلی بإسناد صحیح،وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح الترغیب)) (٣٥٨٩).

[221] أخرجه: أحمد (٣/٧٥)، وابن حبان (٧٣٣٤)، و قال محققه: إسناده ضعیف، وأبو یعلی (١٣٩٠) و قال الحافظ العراقي في تخریج ((الإحیاء)) (٤/٤٩٩): حسن، وقال الشیخ الألباني في ((المشکاة)) (٥٥٦٤) و((ضعیف الترغیب))(٢٠٩٥): إسناده ضعیف، و قال الهیثمي في ((المجمع)) (١٠/٣٣٧): رواه أحمد و أبو یعلی و إسناده حسن علی ضُعفِ راویهِ .

هەتاکو ئاسانتر دەبێت لە نوێژە فەرزێك کە ئەنجامی دابێت لە دونیادا (ئەم ڕیوایەتە لاوازە تەنها بۆ ئاگاداریت هێناومە) .

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە مانەوە و ناڕەحەتیەکانی ئەو ڕۆژە لەسەر خاوەن باوەڕ یەك سەعات دەبێت: عەبدولاّی کوڕی عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... يَكـونُ ذلـك اليـوم أقْصَـرَ علـى المـؤمنين مِـنْ سـاعةٍ مِـن نَهار))[٢٢٢] واتە: (... ئەو ڕۆژە کورتتر دەبێت لەسەر خاوەن باوەڕان لە سەعاتێك کە لە ڕۆژێکدایە)، بەڵکو لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەو کاتە لەسەر خاوەن باوەڕان بە ئەندازەی کاتی نیوەڕۆ و عەسر دەبێت . ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يومَ القيامةِ على المُؤمنين كَقَدرِ ما بين الظُهرِ و العَصْرِ))[٢٢٣] واتە: (ڕۆژی کۆتایی لەسەر خاوەن باوەڕان وەك ماوەی نێوان نیوە ڕۆو عەسر دەبێت).

---

[٢٢٢] أخرجه: ابن حبان (٧٤١٩) و قال الأرناؤوط في تحقيقه: إسناده حسن . و قال الهيثمي ((مجمع الزوائد))(٣٣٧/١٠) رواه الطبراني و رجاله رجال الصحيح غير ابن كثير الزبيدي وهو ثقة، وكيع ((الزهد)) (٦٤٨/٢)، والبيهقي ((البعث)) (ص:٤٤١)، وهناد (الزهد)) (٣٢٥) وقال محققه: اسناده: صحيح، وابن ابي الدنيا ((الأهوال)) (١٧٢)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب )) (٣٥٩٠) .

[٢٢٣] أخرجه: الحاكم (٨٤/١) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة))(٢٤٥٦)، و ((صحيح الجامع))(٨١٩٣) .

# تکاکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئومەتەکەی

لە ڕۆژی کۆتاییدا خوای گەورە ڕێگە دەدات بە پێغەمبەر و خۆشەویستی خۆی موحەمەد (ﷺ) تا تکا بکات بۆ ئومەتەکەی خۆی، ابن ابی العز (رحمه الله) دەفەرموێت: "يكونُ شَفاعَته لأَقوامٍ مِنْ أمَّتِهِ تَساوَتْ حَسَنَاتُهُمْ و سَيِّئاتُهَم؛ فَيَشْفَعُ لأَهلِ الكَبائِرِ مِنْ أمتِهِ أيضاً"[1]. واتە: (تکای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کەسێك لە ئومەتەکەی دەبێت کە چاکە و خراپەی هاوسەنگە، و تکا دەکات بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە تاوانە گەورەکانیان ئەنجام داوە لە دونیادا لە ئومەتەکەی .

تکا کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بریتیە لەو پاڕانەوە تایبەتەی کە بۆ هەموو پێغەمبەرێك هەیە لە دونیادا، کە پێغەمبەران ئەو پاڕانەوەیان بە کار هێناوە لە دونیادا تەنها پێغەمبەری خۆمان نەبێت (ﷺ) کە ئەو پاڕانەوەیەی خۆی دواخستووە تا ببێت بە تکا کردن بۆ سەرجەم ئومەتی خۆی لە ڕۆژی کۆتاییدا: جابر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لِكُلِ نَبِي دَعوَةٌ قَدْ دَعا بِها في أُمَّتِهِ، وإني إختبأت [2] دَعْوَتي شَفاعَةً لأُمَّتي يَومَ القِيامةِ ))[3] . واتە: ((بۆ هەموو پێغەمبەرێك پاڕانەوەیەك هەیە کەپاڕاوەتەوە تێیدا بۆ ئومەتەکەی، وەمن پاڕانەوەکەم دوا خستووە تا (شەفاعەت) بێت بۆ ئومەتەکەم لە ڕۆژی کۆتاییدا )، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەروەری پێغەمبەرانە و خاوەنی تکا کردنیانە، بوریدە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( إذا كانَ يَومَ القِيامَةِ كُنتُ إمامَ النبيِّينَ و خَطِيبَهُم و صاحِبَ شَفاعَتِهِمْ غَيرَ فَخرٍ ))[4]واتە: (کاتێك ڕۆژی کۆتایی دێت من پێشەوای پێغەمبەران و وتار بێژیان و خاوەنی تکا کردنیان دەبم بەبێ فەخر).

---

[1] أنظر: ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٢٨٣/١) لإبن أبي العز .

[2] وفي رواية: البخاري (٦٣٠٤): ((...أخَّرتُ...)) .

[3] أخرجه: أحمد (٣٨٣/٣)، ومسلم (٢٠١) .

[4] أخرجه: أحمد (١٣٧/٥)، والترمذي (٣٦١٥) وقال حديث حسن، وابن ماجة (٤٣١٤)، والحاكم (٧١/١) وصححه و وافقه الذهبي، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٨٢)، و((المشكاة))(٥٧٦٨)، و((الظلال)) (٧٨٧).

هەروەها بەزەیی و دڵسۆزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئومەتەکەی زۆر بە جوانی لەوەدا دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕازی نەبووە نیوەی ئومەتەکەی بچێتە ناو بەهەشت بەڵکو تکا کردنی بۆ سەرجەم ئومەتەکەی خۆی هەڵبژاردووە،عەوفی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أتـاني آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبيّ فَخَيَّرَني [٥] بَيْنَ أنْ يَدْخُلَ نِصف أُمَّـتي الجَنَّـةَ و بَيْنَ الشَـفاعَة فـاختَرتُ الشَـفاعَةَ)) [٦] واتە: ((یەکێك لای پەروەردگاری خۆمەوە هات بۆ لام سەرپشکی کردم لە نێوان ئەوەی کە نیوەی ئومەتەکەم بچێتە بەهەشت و لە نێوان تکا کردندا، منیش شەفاعەت و تکا کردنم هەڵبژاد)، هۆی هەڵبژاردنی تکا کردن ( شەفاعەت کردن ) لە لایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەوەیە کە خوای گەورە نیشانی پێغەمبەری داوە (ﷺ) کە چی ڕوودەدات لە ئومەتەکەیدا لە خوێن ڕشتن وئاژاوە و بەلای گەورە لە دوای خۆی.

ئوم حەبیبە (رضـي الله عنهـا) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: ((أريت ما يلقى أُمتي بَعدي وسَفكِ بَعِضهِم دِماءَ بَعضٍ، [فاحزنني وشق ذلك عليَّ] وسَبَقَ ذلك مِنَ اللهِ، كما سَبَقَ في الأُمِمِ قَبلَهُم فاحزنني وشـق ذلـك علـي، فَسَـألتُه أن يَـوَلِّيني يـوم القيامَةِ شفاعةً فيهم فَفَعَلَ)) [٧] واتە: ( نیشانم دراوە ئەوەی کە تووشی ئومەتەکەم دەبێت لە دوای من کاتێك هەندێکیان خوێنی هەندێکیان دەڕێژن و ئەم کارانەشی کە لەلایەن خواوە زانراوە پێشتر، وەك چۆن پێشتر لە ئومەتەکانی پێش ئەوان (واتـە: موسوڵمان) ڕووی داوە ئەوەش منـی تـەواو نیگـەران کـرد بۆیـە منـیش داوام کـرد تکا کـردنم پـێ ببەخشرێت بۆیان لە ڕۆژی کۆتاییدا و هەر بەو جۆرەیشی کرد (واتـە: خوای گـەورە بۆی جێ بەجێ کردم) .

---

[٥] وفي رواية ابن ماجة: ((...خيرّني رَبي...)) .

[٦] أخرجه: أحمد (٦/٢٩)، والترمذي (٢٤٤١) و قال حديث غريب، وابن ماجة (٤٣١٧)، والحاكم (١/١٣) و صححه على شرط مسلم، و قال الذهبي صحيح على شرطها، و قال الهيثمي في: ((المجمع)) (٧/٢٢٤): رواه أحمد و الطبراني في الأوسط و رجالهما رجال الصحيح، وصحّح إسناده الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٦)، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٨٥)، و ((الظلال)) (٨١٨)، وصححه ابن حبان (٢١١) وقال الأرناؤوط في تحقيقه: إسناده صحيح .

[٧] أخرجه: أحمد (٢٧٤١٠) وقال محققه: حديث صحيح، والطبري (٢٣/٤٠٩)، الحاكم (١/٦٨) وصححه على شرطهما، وابن ابي عاصم (( السنة)) (٢٢٢) وقال محققه:اسناده صحيح، و قال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٤٠): صحيح على شرط الشيخين .

وە ڕێگە بە تکا کردنی پێغەمبەر (ﷺ) دەدرێت لە دوای دانانی پردی صراط لەسەر دۆزەخ وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((فيقولونَ: أَنْتَ رَبُّنا، ثم يضرَبُ الجُسرِ على جَهَنَّم، وتَحِلُّ الشَفاعَة))[٨] واتە: (دەڵێن تۆ خودای ئێمەیت، ئینجا پردەکە لەسەر دۆزەخ دادەنرێت و ماوەی تکا کردن دەدرێت).

## تکا کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ کێ دەبێت ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکا دەکات بۆ چەند کۆمەڵە کەسانێك لە ئوممەتەکەی لە ڕۆژی کۆتاییدا لەوانەش:

**١- ئەو موسوڵمانانەی کە تاوانە گەورەکانیان ئەنجام داوە بەڵام هاوتاو شەریکیان بۆ خوا بڕیار نەداوە:**

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((شَفاعَتي لإهلِ الكَبائِرِ مِنْ أُمَّتي))[٩] واتە: ( تکا کردنی من بۆ ئەو کەسانەیە کە تاوانە گەورەکانیان ئەنجام داوە لە ئوممەتەکەم دا). هەر لەبەر ئەمەش بوو کە یەکێك لە پاڕانەوەکەیدا دەیفەرموو: (خوایە بمخەیتە ڕیزی ئەو کەسانەی کە تکا کردنی پێغەمبەریان بەر دەکەوێت) ئا لێرەدا حوزەیفە (ﷺ) پێی فەرموو: ((إنَّ الله يُغني المؤمِنينَ عَنْ شَفاعَةِ محمد (ﷺ) و يكون شَفاعَتُهُ للمذنِبينَ المسلِمين))[١٠] واتە: (خوای گەورە وا دەکات لە خاوەن باوەڕەکان کە پێویستیان بە تکا کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبێت بۆیان بەڵکو تکا کردنەکەی بۆ موسوڵمانە گوناە بارەکان دەبێت )، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە جابر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من لم يكن من أهل الكبائر فماله وللشفاعة))[١١] واتە: (هەر

---

[٨] اخرجه: احمد (٢/١١-١٦-١٧)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٦٩٠٨) .

[٩] أخرجه: أحمد (٣/٢١٣)، وأبو داود (٤٧٣٩)، والترمذي (٢٤٣٥) و قال: حديث حسن صحيح غريب، وابن ماجة (٤٣١٠)، والحاكم (١/٦٩) و صححه على شرطهما ووافقه الذهبي، وصححه ابن حبان (٦٤٦٨) و قال الأرناؤوط في تحقيقه: إسناده صحيح على شرط مسلم، وصحح إسناده الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٣)، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٧٩)، وفي ((المشكاة)) (٥٥٩٩)، وفي ((الروض)) (٤٥) (٣)، وفي ((الظلال)) (٨٣٠)، وفي ((الضعيفة)) (١/٣٧٦) .

[١٠] أخرجه: ابن أبي الدنيا ((كتاب الصمت)) (٣٤٥): و قال المحقق: إسناده حسن .

[١١] أخرجه: الترمذي (٢٤٣٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترمذي)) (١٩٨٣)، والحاكم (١/٦٩) .

کەسێك لەوانە نەبێت کە گوناحی گەورەیان ئەنجام داوە چ پێویستیەکی بە وباسە هەیە) .

**هەندێك لە تاوانە گەورەکان:**

(( الإشراك بالله، وقتل النّفس بغير الحق، والزنى، والفرار من الزحف، و أكل الرِّبا، وأكل مال اليتيم، وقذف المحصنة الغافلة، و السحر، والتَعرب بعد الهجرة، وعقوق الوالدين، و اليمين الغموس لإقتطاع أموال الآخرين، وبخاصة عند منبرهِ (ﷺ) و بعد العصر، والكذب، والرياء، و ترك الصلاة و الجمعة و الجماعة و الحج مع القدرة، و منع الزكاة، و الغدر، واحياء سنة جاهلية في الإسلام، و التصوير وصنع التماثيل، و قتل أهل الذمة، و الوداً، و الأنتحار، و المن في الإعطاء، و التكذيب بالقدر، و الذبح لغير الله، و تغير منار الأرض، و إتيان الساحر و الكاهن و تصديقهما، و إضلال الأعمى عن الطريق، و إتيان البهيمة و الحائض و إتيان الدّبر، و وصل الشعر و نتف الحاجب، و التّنمص و الوشم و التفلج و حلق اللحية، و النفاق، و الحكم بغير ما أنزل الله و الحكم بالظلم، و إخلاف الوعد، و الخيانة، و الفجور في الخصام، و الدياثة، ومنع القصاص و الحدود و ايواء المجرمين، و أكل اللحوم المحّرمة، و الزواج بالمحرمات من النكاح، والأكل و الشرب في أنية الذهب و الفضة، و منع المهر، و ضرب ووسم الدابة في وجهها، و خداع الناس، وإسبالٌ الثياب، وكشف العورة، والأضرار بالوصّية، والجور في القضاء، و ظلم الشرط، وسفور المرأة، و النياحة و ضرب الوجه و نشر الشعر و شق الجيب و الدعاء بدعوى الجاهلية، وسؤ الخلق، و فحش اللسان و بذائته، و لعن الرجل والديه، و البخل، و الحسد، و التباغض، و التهاجر، و قطع الأرحام، و الإدعاء لغير الأب، و لعن الإنسان و الحيوان،وتكفير الناس، و ظن السوء بالله، و الفخر بالاحساب و الطعن في الإنساب، و الثرثرة، و التشدق، و الإطراء في المدح و تزكية النفس، و الجدال مع أهل الحق بالباطل و مخاصمتهم، و الحلف بغير الله، و الكفر و سب الله و رسوله و الدين و الصحابه، و سب الأئمة و العلماء و كافة الناس، و ضرب المسلم بغير الحق، و الغيبه والنميمه، وإيذاء الجار، والأستطالة على الضعيف،ومنعُ فضل الماء، ونقصُ المكيال و الموزاين، و اباق العبد، و نشوز الزوجة، و تحريم الحلال و تحليل الحرام، و عدم التنزه من البول، و كتمان العلم و تعلمه لغير وجه الله، و الغناء و تعلم المزامير، و الكذب على الله و رسوله، و ترك الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر، و كثرة الحلف، و أكل أموال الناس بالباطل، و تغير خلق الله، و الخروج عن جماعة المسلمين و إمامهم، و نكث البيعة، و عدم نصر المظلوم مع القدرة على

ذلك، و الغلول و القمار،و الرشوة، و إيذاء الصالحين، و العصبية، و حب إشاعة الفاحشة، و ترويع المسلم، و جحود النعمة، و الإستخفاف بحرمات الله، و الرضا بالمعصية، ومودة أعداء الله، و اليأس من روح الله، و الأمن من مكر الله، و العجب، و الإلحاد في الحرم و التطفيف في الوزن و الكيل، و التجسس على المسلمين، و الطيرة، و لباس الحرير و الذهب للرجال))[١٢] واتە: (شەریك بۆ خوا بڕیاردان، کوشتنی یەکێك بە ناحەق، زینا کردن، هەڵهاتن لەڕووی کافر، سوو خواردن، ماڵی هەتیو خواردن، بوختان کردن، سیحر کردن، ئەعرابی بوون دوای کۆچ کردن ( واتە: دوور کەوتنەوە لەو جێگەیەی کە هیجرەتی بۆ کراوە)، ئازاردانی باوك و دایك، سوێند خواردنی درۆ بۆ زەوت کردنی سامان و سەروەتی کەسانی تر، سوێند خواردنی درۆ بە تایبەتی دوای عەسر، درۆ کردن، ڕیا بازی، واز هێنان لە نوێژ و جومعە و جەماعەت وحەج نەکردن لەگەڵ تواناادا، زەکات نەدان، غەدر کردن، زیندووکردنەوەی سوننەتێکی جاهیلی لە ئیسلامدا، دروستکردنی پەیکەر، کوشتنی ئە هلی زیمە، زیندە بە چاڵ کردنی منداڵ ، خۆکوشتن، منەت کردن، بەدرۆ خستنەوەی قەزاو قەدەر، قوربانی بۆ غەیری خوا، گۆڕینی سنوری زەوی بە ناحەق، چوون بۆ لای ساحیر و فاڵ گرەوە و بەڕاست دانانیان، ڕێگە ون کردن لە کوێر، نێر بازی، جووت بوون لەگەڵ ئاژەڵدا، جووت بوون لەگەڵ ئافرەتدا لە کاتی حەیزدا، برۆ هەڵگرتن و دانانی قژی دەسکرد، خاڵ کوتان و دان شاش کردن، حوکم کردن بە غەیری شەریعەتی ئیسلام، زۆرداری، دوو ڕوویی ( نیفاق )، خیانەت کردن، پەیمان نەبردنە سەر، گەوادی کردن و ڕێگرتن لە تۆڵە سەندنەوە، داڵدەدانی تاوان باران، زیادەڕەوی لەدەمە قاڵەدا، خواردنی ئەو گۆشتانەی کە حەرامە، مارەکردنی ئافرەتە حەرام کراوەکان لەسەر شتە حەرام کراوەکان، خواردن و خواردنەوە لە قاپ و قاچاغی ئاڵتون و زیو، زەوت کردنی مارەیی، و لێدان و داغ کردنی ئاژەڵ لە دەم وچاوی دا، فێڵ کردن لە خەڵکی، جل شۆڕکردن و ڕاکێشانی بە زەویدا، دەرخستنی عەورەت، زەرەر پێگەیاندن لە وەسیەتدا، قازی ستەم کار، پۆلیسە زاڵمەکان، سفوری ئافرەت، شین کردن و لێدانی دەم وچاو و قژ ڕنینەوە و یەخەدادڕین هاوار کردن و بەهاواری جاهیلی، خوڕەوشتی ناشرین، زمان پیسی و داوێن پیسی، لەعنەت کردن لە باوك

[١٢] أنظر: ((كتاب الكبائر)) للإمام الذهبي، و ((كتاب الكبائر)) للإمام محمد بن عبد الوهاب .

ودایك، بەخیلی، حەسودی، بوغزاندنی خاوەن باوەڕان و قسەنەکردن لەگەڵ خاوەن باوەڕاندا و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، لەعنەت کردن لە ئادەمیزاد و ئاژەڵ، خەڵکی کافر کردن، گومانی خراپ بردن بە خوا، شانازی کردن بە باو و باپیرانەوە بە ناحەق، ڕەخنە گرتن لە نەژاد ( نەسەب)، خۆ بەزل زانین، ئەوانەی قسەی زل و فیزاوی دەکەن، شانازی کردن بە خۆوە، دژایەتی کردنی باوەڕدارن و دەمە قاڵێ کردن لە گەڵیان، سوێند خواردن بە غەیری خوا، جوێن دان بە خوا و پێغەمبەر و هاوەڵانی وە جوێن دان بە زانایانی موسوڵمان و خەڵکانی موسوڵمان، لێدانی موسوڵمان بە ناحەق، لە پاش ملە باس کردن، دووزمانی کردن، ئازار دانی دراوسێ، خۆبەزل زانین بەسەر بێ دەستەڵاتدا، ئاو لە خەڵك گرتنەوە، تەرازوو بازی، هەڵهاتنی کۆیلە لە خاوەنەکەی، بە گوێ نەکردنی ژن بۆ مێردەکەی، حەرام کردنی حەڵاڵ و حەڵاڵ کردنی حەرام، خۆپاك نەکردنەوە لە میز وپیسایی، شاردنەوەی زانست، فێربوونی زانستی شەرعی بۆ غەیری خوا، گۆرانی وتن، درۆ کردن بە ناوی خوا و پێغەمبەرەوە، فەرمان کردن بە خراپە، ڕێگرتن لە چاکە، زۆر سوێند خواردن، خواردنی ماڵی خەڵکی بە ناهەق، داگیر کردن، گۆڕینی دروست کراوانی خوا، دەرچوون لە کۆمەڵی موسوڵمان و فەرمانی پێشەواکەیان، بەیعەت شکاندنی سەرۆکی موسوڵمانان،پشت نەگرتنی بێ تاوان لەگەڵ تواناداا، قومار کردن، خراپە ئەنجام دان لە حەرەمی کەعبەدا، سیخوڕی کردن بەسەر موسوڵمانانەوە، بێ هیوابوون لە ڕەحمی خوا، نەترسان لە فێڵ و (مکر)ی خوا، ڕەش بینی، پۆشینی ئاوریشم و ئاڵتوون بۆ پیاو، دژایەتی کردن و ئازار دانی پیاوچاکانی خوا، چەك هەڵگرتن دژ بە موسوڵمان، وکەسێکی لەعنەت کار، دزی کردن، شاهیدی دان بەدرۆ، شکاندنی ڕۆژوو بەبێ هۆ، دزی کردن لە دەسکەوتی جیهاد، فیتنە بەرپاکردن، یارمەتی دانی کافران و موشریکەکان وپشتیوانی کردنیان، خۆشویستنی بێ باوەڕان، کرێ نەدان بە خاوەن ماف، گاڵتە کردن بە خوا و پێغەمبەر و ئیسلام و موسوڵمانان، سوپاس نەکردنی خوا، بەرتیل خواردن، دڵ پیسی ) .

**٢- ئەو موسوڵمانانەی کە هاوتایان بۆ خوا بڕیار نەداوە .**

**ئەبی زەڕ (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((...اختبأتَ دَعوَتِي شَفاعَةً لأُمَّتي في القيامَةِ و هيَ نائِلةٌ إنْ شاءَ الله لِمَنْ لَمْ يُشْرِك باللهِ شَيئاً))[١٣] **واتە: (....... من داواکردنەکەم شاردۆتەوە بۆ ئومەتەکەم لە ڕۆژی کۆتاییدا، و انشاء الله دەگات بەو ئەو کەسەی کە هیچ هاو تایەکی بۆ خوا بڕیار نەدابێت).**

**بۆ بە دەس کەوتنی تکا کردن پێویستە ئەو موسوڵمانانە هاوتایان بۆ خوا بڕیار نەدابێت هەتا مردن، وەك عەوفی کوڕی مالك (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرمویەتی:** ((انَّ شَفاعَتِي لِمَنْ ماتَ لا يُشركُ باللهِ شَيئاً مِنْ أُمَتي))[١٤]. **واتە: تکا کردنی من بۆ ئەو کەسەیە کە مردبێت و هیچ هاوتایەکی بۆ خوا بڕیار نەدابێت لە ئومەتەکەمدا) ، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** ((هيَ لكُلِ مُسْلِم))[١٥] **واتە: (ئەو تکا کردنە بۆ هەموو موسوڵمانێکە) ، لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:**((فهي لكم و لِمَن شَهِدَ أن لا الـه إلا الله))[١٦]**واتە: (ئەو تکا کردنە بۆ ئێوەیە (واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)) وە بۆ ئەو کەسەیە شایەتی دابێت کە هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت بە حەق تەنها هەر (الله) شایستەی پەرستنە) .**

**٣- ئەو موسوڵمانانەی کە شایە تمانیان دڵسۆزانە لەناخی دڵیانەوە دابێت:**

**ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((... شَفاعَتِي لِمَنْ شَهِدَ أنْ لا اله إلا الله و أنَّ مُحَمَّداً رَسولُ اللهِ مُخلصاً يُصَدِّقُ لِسانه قَلبَهُ و

---

[١٣] أخرجه: أحمد (١٤٨/٥)، و الحاكم (٤٢٤/٢) و صححه على شرطهما، وابن حبان (٦٤٦٢) و قال: محققه حديث صحيح، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٦٣٦) .

[١٤] أخرجه: أحمد (٢٩/٦)، والترمذي (٢٤٤١)، و ابن ماجة (٤٣٠٧)، و الحاكم (١٣/١)، وصححه على شرط مسلم و قال الذهبي صحيح على شرطهما، و ابن حبان (٢١١) و قال محققه: إسناده صحيح، و صحح إسناده الشيخ الألباني في: ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٦)، و في ((صحيح سنن ابن ماجة))(٣٤٧٦) .

[١٥] اخرجه ابن ماجة (٤٣١٧)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٨٥) .

[١٦] اخرجه احمد: (٢٢٢/٢) (٧٠٦٨)،واسناده صحيح كما قال: المنذري في ((الترغيب)) (٥٣١٩)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٦٣٤) .

قَلْبُـهُ لِسـانَهُ))[١٧] واتـه: (......تکا کردنم بـۆ ئەو کەسـەیە کە شـاهیدی بـدات کە هـیچ خوایەك نی یە تـەنها (الله) نـەبێت وە موحەمـەد نێردراوی خوایە بـە دڵسـۆزانە، زمـانی دڵی بە ڕاست خستبێتەوە وە دڵیشی زمانی بە ڕاست خستبێتەوە).

**٤- ئەو موسوڵمانانەی کە لەسەرەمەرگدا شایەتمانیان هێناوە:**

ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەفەرموێت: أنَّ غلاماً يَهَودياً كانَ يَخـدَمُ النبـيَّ (ﷺ) فَمـرضَ فقال رسول الله (ﷺ) لأصحابِهِ: (( اذهَبُوا بِنا إِليهِ نعودُهُ )) قال: فأتَوهُ و أبـوهُ قاعِـدٌ عِنْـدَ رأسِـهِ فَقالَ له النبي (ﷺ): ((قُلْ لا الهَ الا الله أشْفَعُ لَكَ بها يَومَ القَيامَةِ)) فقال: أَشهَدُ أن لا الهَ إلا الله و أنَّ مُحَمَّداً رسولَ الله... فقال النبـي (ﷺ): الحَمـدُ للهِ الـذي أَنْقَـذَهُ مِـنْ نـارِ جَهَـنَّمَ))[١٨] واتـه: (کوڕێکی جولەکە کە خزمەتی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد نەخۆش کەوت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: ((بابچین بۆ لای و سەری لێ بدەین)) دەفەرموێت: چووین بۆ لای و باوکی لای سەری کوڕەکەیەوە دانیشتبوو، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) پێـی فـەرموو: (واتـە: بـە کوڕەکـەی فـەرموو) ((بڵـێ: لاالـه الا الله))، تـا تکـای پـێ بکـەم بـۆت لـە ڕۆژی کۆتاییدا)) کوڕەکە وتـی: (اشهد ان لااله الا الله وان محمـداً رسـول الله)، ئینجـا پێغەمبـەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەڕزگاری کرد لە ئاگری دۆزەخ)) .

هەر لەبەر ئەوە بوو کە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) داوای لـە ئـەبو طـالبـی مـامی کـرد کـە ئەو شایەتمانە بڵێ لە سەرە مەرگدا تا بتوانێت تکای بۆ بکات بەو شایەتمانە لـە ڕۆژی کۆتاییـدا، لـە سـەعیدی کـوڕی مسـەیەب لـە باوکیـەوە (رضـي الله عنهمـا) دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبەر (ﷺ) بە مامی فەرموو لە کاتی سەرەمەرگیدا: (( یا عمِّ قل: لا اله إلا الله أحاج – وفي رواية– (أشهد) لـك بهـا عنـد الله))[١٩] واتـە: ئـەی مامـە بڵـێ (لاالـه الاالله) تـا بیکـەم بـە بەڵگە بۆت لای خوا) ، لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((...قـل

---

[١٧] أخرجه: أحمد (٣٠٧/٢) رقم (١٠٧١٣) و قال محققة الأرنـاؤوط: حـديث صـحيح، و الحـاكم (٧٠/١) و صـححه و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٦٤٦٦): و قال محققهُ: حديث حسن .

[١٨] أخرجه: أحمد (٢٨٠/٣)، و البخاري (٥٦٥٧) و (٢٩٦٠)، و أبو داود (٣٠٩٥)، و ابـن حبـان (٢٩٦٠) و اللفـظ له، و صححه الشيخ الالباني في: ((صحيح أبي داود)) (٢٦٥٣) .

[١٩] أخرجه: أحمد (٤٣٣/٥)، و البخاري (٣٨٨٤) و (١٣٦٠)، و مسلم (٢٤)، و النسائي (٩٠/٤) .

كلمة تجب لك عليّ بها الشفاعة يوم القيامة قل لا اله الا الله))[٢٠] واتە: (...وشەیەك بڵێ کە تکا کردن بۆت پێویست بێت لە سەرم لە ڕۆژی کۆتاییدا بڵێ (لااله الاالله)).

**٥- تکا کردنی تایبەت بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ):**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکا دەکات بۆ ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی خۆی کە تووشی کوشتن و کوشتار و ئاژاوە هاتوون لە دوای خۆی هەرچەندە خوای گەورە لە هەموو هاوەڵان خۆشبووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ (التوبة: ١٠٠) **واتە: ﴿ خوای گەورە لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەمینەکان بوون لە ئیسلام بووندا لە کۆچکردووەکان و پشتیوانانن وئەوانەی بە چاکترین شێوە شوێنیان کەوتوون هەموو ئەوانە خوا ڕازی یە لێیان و ئەوانیش ڕازین لێی، وە چەندەها بەهەشت ئامادەکراوە بۆیان کە بەژێریاندا چەندەها ڕووبار دەڕوات، کە بە هەتاهەتایی تیایدا دەمێننەوە ئەوە سەرکەوتنی هەرە گەورەیە﴾.**

**ئەم تکا کردنەش بە هۆی داوا کردنی هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.عەوفی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژدەی تکا کردنی بە هاوەڵانی ڕاگەیاند وئەوانیش فەرموویان:** (... فقالوا (أي الصحابة الموجودون عند رسول الله (ﷺ) ): يا رسول الله نُنشِدُكَ الله و الصحبة لما جعلتنا من أهل شفاعتك؟ قال رسول الله (ﷺ): (( فأنتم من أهل شفاعتي )) )[٢١] **واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەلاڵێینەوە لێت بە خوا و هاوەڵایەتیمان بۆت کە بمانکەیت بە ئەهلی تکا کردنت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئێوە لە ئەهلی تکا کردنی منن)) (واتە: ئێوە لەو کەسانە دەبن کەتکای من دەتان گرێتەوە) .**

---

[٢٠] و أخرجه: الحاكم (٢/٣٣٦) و صححه و وافقه الذهبي .

[٢١] أخرجه: أحمد (٦/٢٩)، و الترمذي (٢٤٤١)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٦)، و ابن حبان (٢١٠): وقال محققه: إسناده صحيح .

**٦-تکا کردن بۆ ئەو کەسانەی کە ئارامیان گرتووە لە ناڕەحەتی ژیان بەسەربردن لە شاری مەدینەی پیرۆزدا:**

**ئەبی سەعیدی خدری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( لا يَصبِرُ أحد على لِأوائها في رواية:على لأواء المدينة و شِدَّتِها الِّا كُنتُ له شهيداً أو شفيعاً يوم القيامة إذا كان مسلماً ))[٢٢] **واتە: (هەر کەسێك ئارام گربێت لەسەر سەختی و ناڕەحەتی ژیان بەسەر بردن لە مەدینەدا ئەو کەسە من شایەت و تکا کار دەبم بۆی لە ڕۆژی کۆتاییدا گەر موسوڵمان بووبێت).**

**٧- تکا کردن بۆ ئەو کەسانەی کە لە شاری مەدینەی پرشنگداردا مردوون:**

**ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەفەرموویەتی:** ((من إستطاع أن يموت بالمدينة فليفعل فإِني الشَفع لمن يموت بها ))[٢٣] **واتە: (هەر کەسێك لە ئێوە گەر دەتوانێت بمرێت لە مەدینەدا با وابکات، چونکە من تکا دەکەم بۆ ئەو کەسەی کە مردبێت تیایدا).**

**٨- تکا کردن بۆ ئەو کەسانەی کە سڵاوات دەدەن لە پێغەمبەر (ﷺ) بەیانیان و ئێواران: ئەبو دەرداء (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( من صلى عليّ حين يُصبح و حين يَمسي عشراً، أدركته شفاعتي يوم القيامة ))[٢٤] **واتە: (هەر کەسێك دەجار سڵاواتم لەسەر بدات بەیانیان و ئێواران تکا کردنی من پێی دەگات لە ڕۆژی کۆتاییدا).**

---

[٢٢] أخرجه: أحمد (٢/٢٨٧)، و مسلم (١٣٧٨)، و الترمذي (٣٩١٨) و قال حديث حسن صحيح غريب، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٣٠٧٧)، و ابن حبان (٣٧٤٠) و قال المحقق: إسناده صحيح . و قال السيوطي: (إختصاص أهل المدينة بهذا أن هذه شفاعة أخرى غير العامة التي هي إخراج أمته من النار ... و تكون هذه الشفاعة بزيادة الدرجات أو تخفيف السيئات أو بما شاء الله من ذلك) أنظر: ((تنويرالحوالك)) (٣/٨٤) .

[٢٣] أخرجه: أحمد (٤/٧٤)، و الترمذي (٣٩١٧) و قال حديث حسن غريب، و صححه الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٠٧٦)، و ابن ماجة (٢٥٢٦) و في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٥٢٦) و في ((المشكاة)) (٢٧٥٠)، و الطبراني في ((الكبير)) ( ٢٤/٨٢٥)، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٣/٣٠٦): إسناده حسن، و ابن حبان (٣٧٤١) و قال محققه: إسناده صحيح على الشرط الشيخين .

[٢٤] أخرجه: الطبراني في ((الكبير))، و قال المنذري في ((الترغيب و الترهيب)) (٩٧٦) : إسناده جيد، و قال الهيثمي أيضاً في ((المجمع)) (١٠/١٢٠): رواه الطبراني بإسناد جيد، و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٦٢٣٣)، وضعفه اخيراً في ((ضعيف الترغيب)) (٣٩٦) .

**۹- تکاکردنی بۆ ئەو کەسە کە داوای وەسیلە و (المقام المحمود)ی کردووە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای هەموو بانگێك:**

**جابر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((من قال حين يسمع النداء: اللّهم ربّ هذه الدعوة التّامة و الصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة و الفضيلة و ابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته حلّت له شفاعتي في (رواية:الشفاعة) يوم القيامة))[٢٥] **واتە: (هەر کەسێك کاتێك کە گوێی لە بانگ دەبێت بڵێت: (خوایە ئەی پەروەردگاری ئەم بانگە تەواوە و نوێژە بەرپا بووە (الوسیلة والفضیلة) (جێگەیەکە لە بەهەشتدایە) ببەخشە بە موحەمەد (ﷺ) و بیگەیەنەرە ئەو جێگە سوپاس کراوەی کە پەیمانت پێداوە) ئەو کەسە تکای من دەیگرێتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا)، لەڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:** (( سلوا الله لي الوسيلة فانهُ لم يسألها لي عبدٌ في الدنيا الا كنتُ له شهيداً أو شفيعاً يوم القيامة))[٢٦] **واتە: (داوای (الوسیلە)م بۆ بکەن چونکە هەر بەندەیەك لە دونیادا ئەوەم بۆ داوا بکات من دەبمە شایەت وتکاکار بۆی لە ڕۆژی کۆتاییدا) .**

**یاخود دەتوانین داوی شەفاعەت بکەین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وەك دوعاکەی عەبدوڵای کوڕی عەباس (ﷺ) کە دەفەرموێت:** "اللهم تقبل شفاعة محمد الكبرى وارفع درجته العليا و اعطه سؤله في الأخرة والاولى كما أتيت ابراهيم وموسى"[٢٧] **واتە: (خوایە شەفاعەتی گەورەی پێغەمبەر قبوڵ بکە و پلە بەرزەکەی بڵند تر بکەو داوا و تکاکانی دونیا و قیامەتی لێ وەبگرە وەك چۆن لە ئیبراهیم وموسات (عليهما السلام) وەرگرت.**

**۱۰- تکا کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ خزمانی موسوڵمانی خۆی:**

**هەموو نەژاد و خزمایەتی یەك نامێنێت لە ڕۆژی کۆتاییدا تەنها نەژاد و خزمایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبێت وەك ئیمامی عومەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە**

---

[٢٥] أخرجه أحمد (٣/٣٥٤)، و البخاري (٦١٤) و مسلم (٣٨٤)، و أبو داود (٥٢٩)، و النسائي (٢/٢٦)، و الترمذي (٢١١)، و ابن ماجة (٧٢٢)، و ابن حبان (١٦٨٩) و قال المحقق: اسناده صحيح على شرط البخاري .

[٢٦] أخرجه الطبراني ((الأوسط)) (٦٣٣) وقال الشيخ مقبل في ((كتاب الشفاعة)) (رقم: ١٨٦) سنده حسن .

[٢٧] أخرجه: ابن خزيمة (٣٨٥)، وعبد الرزاق ((المصنف)) (٢/٢١١)، والسخاوي ((القول البديع)) (٤٦) وقال: اسناده قوي، وابن كثير ((التفسير)) (١٧/٥١٣) وقال: اسناده جيد قوي صحيح، وقال: الشيخ مقبل في ((كتاب الشفاعة)) (٥٥): اسناده صحيح على شرطهما.

(ﷺ) کە فەرموویەتی: (( كلّ نسب و سبب ينقطع يوم القيامة الا ما كان من سببي و نسبي))[٢٨]. واتە: هەموو نەژاد و هۆرێك دەپچڕێت لە ڕۆژی کۆتاییدا تەنها ئەوانە نەبێت کە لە نەژاد و هۆزی منن).

عەبدولاّی کوڕی عەمەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((كلّ نسب و صهر ينقطع يوم القيامة الا نسبي و صهري))[٢٩]. واتە: هەموو نەژاد و زاوایەتیەك (واتە: خزمایەتی لە ڕێگەی ژن و ژن خوازیەوە) دەپچڕێت لە ڕۆژی کۆتاییدا تەنها نەژاد و خزمایەتی من نەبێت).

## پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی تکاکردندا چی دەفەرموێت؟

لە دوو فەرموودەدا هاتووە دەربای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی تکاکردندا چی دەفەرموێت:

یەکەم / ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:(( إذا كان يوم القيامة شفعت فقلت: يارب ادخل الجنة، من كان في قلبه خردلة من إيمان، فيدخلون، ثم يقول ادخل الجنة من كان في قلبه أدنى شيء))[٣٠] واتە: (کاتێ کە ڕۆژی کۆتایی دەبێت تکا دەکەم دەڵێم: ئەی پەروەردگارم، بیکەرە بەهەشتەوە ئەو کەسەی کە بەئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕی لەدڵدا هەبوو، ئینجا دەچنە ناو بەهەشت، پاشان دەڵێم: بیکەرە ناو بەهەشتەوە ئەوانەی کەمترین شت لە باوەڕ لە دڵیاندا هەبووە).

---

[٢٨] اخرجه: أحمد (٣٣٢/٤)، و أحمد في ((فضائل الصحابة)) (١٠٦٩) و قال محققه: إسناده صحيح عند أبي نعيم، في ((الحلية)) (٣٤/٢)، و الحاكم (١٤٢/٣)، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٢٧٢/٤): رواه الطبراني و رجاله رجال الصحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٣٦)، وصححه محقق ((فتح القدير)) (٧٠٩/٣) .

[٢٩] أخرجه: عبد الرزاق (١٠٣٥٤)،و ابن عساكر (١٢٨/٦)، واحمد ((الفضائل)) (٦٩)،والحاكم (١٤٢/٣)، وسعيد بن منصور (٥٢٠) ، الطبراني ((الكبير)) (٢٦٣٣- ٢٦٣٥)، والبيهقي ((الكبرى)) (٦٤/٧)، و البزار (٢٤٥٥)، وصححه الاحدب في ((زوائد تأريخ بغداد)) (٩٠١)، وصححه الشيخ الالباني في ((الصحيحة)) (٢٣٦) و((صحيح الجامع)) (٤٥٦٥) .

[٣٠] اخرجه أبن أبي عاصم ((السنة)) (٨٤٢،٨٤٩) وقال محققه الشيخ الالباني: صحيح، وصححه ايضا في: ((صحيح الجامع)) (٧٨٠) .

دووەم: ئەبو هورەیرە (ﷺ) فەرموویەتی: ((أنا أعلم الناس بشفاعة نبينا محمد (ﷺ) يقول: اللهم أغفر لكل عبد مسلم لقيك يؤمن بي و لا يُشرِك بك))[٣١] واتە: ((من شارەزاترین کەسم بە تکا کردنی پێغەمبەرمان (ﷺ) لەو ڕۆژەدا دەفەرموێت: (خوایە خۆش بیت لە هەموو بەندەیەکی موسوڵمان کەپێت گەیشتووە و باوەڕیٚ بەمن بووە و هاوتای بۆ تۆ بڕیار نەداوە).

**تێبینی:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکا دەکات بۆ ئومەتەکەی دوای ئەوەی کە خوای گەورە ڕێگەی پیٚ دەدات کە تکا بکات و هیچ کەسێك بەبیٚ ئیزنی خوا ناتوانێت تکا بکات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ .....مَن ذَا ٱلَّذِى يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ ..... ﴾ (البقرة: ٢٥٥ ).

بیٚ گومان تکا بۆ کراویش دەبێت لەو کەسانە بێت کە خوای گەورە ڕێگەی بدات بە تکا کردن بۆی: شێخ محمد بن عبدالوهاب التميمي لە نوسراوەکەیدا (القواعد الاربعة) سەبارەت بە بنەڕتی دووەمیان (ل٣٢) دەفەرموێت: " و الشفاعة المثبتة هي التي تطلب من الله و الشافع مكرم بالشفاعة، و المشفوع له من رضي الله قوله و عمله بعد الإذن، ولا تكون الا لأهل التوحيد و الأخلاص" [٣٢] واتە: (تکا کردنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە داوا دەکرێت لە خوای گەورە وتکا کارەکەش ڕێز لێگیراو بێت و تکا بۆ کراویش لەوانە بێت کە خوای گەورە ڕازی یە لە قسە و کرداری دوای ڕێگە پێدان، ئەم تکا کردنەش تەنها بۆ خەڵکی

---

[٣١] أخرجه أحمد (٤٩٩/٢)(١٠٤٧٣) و قال محققة الأرناؤوط: إسناده حسن، و قال حذيفة (ﷺ): يتكلم محمد (ﷺ) فيقول: لبيك و سعديك و الخير في يديك و الشر ليس اليك و المهديُ من هديت و عبدُك بين يديك و منك و اليك لا ملجأ و لا منَجى مِنكَ الّا اليك تباركت و تعاليت سبحانك رب البيت، فهذا قوله (عسى أن يبعثك ربك مقاماً محموداً) . أخرجه بهذا اللفظ: الطيالسي (٤١٤)، و الطبري (٩٧/١٥)، و النسائي ((السنن الكبرى)) (١١٢٩٤)،: ((التفسير)) (٣١٤) و قال محققه: إسناده صحيح، والبزار (٣٤٦٢) ((كشف الأستار))، والحاكم (٣٦٣/٢) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، وابو نعيم ((الحلية)) (٢٧٨/١)، و اللالكائي (٢٠٨٦)، وابن ابي عاصم (٨٠٨) مرفوعاً وقال محققه: اسنده صحيح، و قال الهيثمي في: ((المجمع)) (٣٧٧/١٠): رواه البزار و رجاله رجال الصحيح، وقال الحافظ في ((الفتح)) (٢٥١/٨):رواه النسائي باسناد صحيح، واورد القاضي عياض ((الشفا)) (٥٩٧) وقال محققه: صحيح موقوفاً، و قال الشيخ الألباني في: ((ظلال الجنة)) (٧٨٩): حديث صحيح، وأخرجه الطيالسي بإسناد صحيح على شرط الشيخين، وهو وإن كان موقوفاً فانه في حكم المرفوع لأنه لا يقال من قبل الرأي.

[٣٢] انظر:((شرح لمعة الأعتقاد))(ص:٧٥)،و((فقه العبادات)) (ص٩٤-٩٥) للعثيمين،و(الشفاعة) للشيخ مقبل (ص: ١٩).

یەك خوا پەرستی دڵسۆز دەبێت) ، خوای گەورە (تبارك وتعالى ) سەبارەت بە تکا کردن لە ڕۆژی کۆتاییدا لە چەندین ئایەتدا ئەم ڕاستیەی دووپات کردۆتەوە فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴾ (مريم: ٨٧) واتە: ﴿ئەوانە خاوەنی تکا نین و کەس تکایان بۆ ناکات، مەگەر ئەوکەسەی کە لەکاتی خۆیدا خوای میهرەبان بەڵێنی پێداوە کە تکا بکات یان تکای بۆ بکرێت﴾ وە دەفەرموێت:﴿ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴾ (طه: ١٠٩) واتە: ﴿لەو ڕۆژەدا تکا و شەفاعەت بێ سوودە و وەرناگیرێت، مەگەر لە کەسێك خوای میهرەبان مۆڵەتی بدات و ڕازی بێت بەوەی قسەی بۆ بکرێت و قسەی لێ وەربگرێت﴾ وە دەفەرموێت: ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴾ (الأنبياء: ٢٨) واتە: ﴿هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە ڕابردوو دا چیان ئەنجامداوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن فریشتەکانیش تکا کارنابن مەگەر خوا پێی ڕازی بێت، ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەك ئەنجامدەن﴾ وە دەفەرموێت: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴾ (النجم: ٢٦) . واتە: ﴿زۆر فریشتەش لە ئاسمانەکاندا هەن کە تکاو پاڕانەوەیان بێ سوودە، مەگەر خوا مۆڵەت بدات بۆ هەر کەسێك کە شایستەیە و ڕازی بێت کە تکا بکات، یان تکای بۆ بکرێت﴾ .

وەئەوانەی کە بەر تکا کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناکەون دوو کۆمەڵن کۆمەڵی سەرۆکە زاڵمە ( ستەم کارەکان ) و تاقمە سەر لێ شێواوە خاوەن داهێنراوەکان کە دەرچوون لە ئیسلام ( واتە:دەرچوونە لە ئەهلی سونەت و جەماعەت ) .

ئەبو ئومامە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((صنفان من أمتي لن تنالهما شفاعتي إمام ظلومٌ غشوم، و كل غال في الدين مارق منه ))[٣٣] واتە: ((دووبەش هەن لە ئومەتەکەمدا تکا کردنی من نایان گرێتەوە: سەرۆکێکی ستەم

[٣٣] أخرجه: الطبراني ((الكبير)) ٢٠/(٤٩٦)، و قال صاحب ((المجمع)) (٢١٥/٥) رجاله ثقات، و صّحح إسناده الشيخ الألباني في ((السنة)) (٤١) لإبن أبي عاصم، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٤٧٠) .

کاری خوێن ڕێژ، و هەموو زیادەڕەوێکی دەرچوو لە ئایین) وە ئەنەسی کوڕی مالك (ﷺ) دەفەرموێت: "من من كذب بالشفاعه فليس له فيها نصيب"[٣٤] واتە: "هەرکەسێك تکاکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بەدرۆ بزانێت بەشی نابێت لەو تکاکردنەدا".

ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکایان بۆ دەکات لە ڕۆژی کۆتاییدا ژمارەیان یەکجار زۆرە تەنها خوا خۆی باشتر دەزانێت بەڵام لە فەرموودەیەکی لاوازدا هاتووە، کە بورەیرە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( إني لأشفع يوم القيامة لأكثر مما على وجه الأرض من حجر و مدر ))[٣٥] واتە: (من تکا دەکەم لە ڕۆژی کۆتاییدا بۆ ژمارەیەکی زیاتر لەوەی لەسەر زەویدا هەیە لە بەرد ودار ، ئەم فەرمودەیە (ضعيف)ە وتەنها بۆ زانیاری هێناومە) .

بەختەوەرترین کەسان کەبەر تکا کردنی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەون دڵسۆزانن (المخلصين) لە ڕۆژی کۆتاییدا . ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەفەرموێت: (( قلت: يا رسول الله من أسعد الناس بشفاعتك يوم القيامة ؟ قال رسول الله(ﷺ): (( ...أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا اله إلا الله خالصاً من قلبه أو نفسه )) )[٣٦] واتە: (وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کێ لە خەڵکان بەختەوەرترین کەسە بە تکا کردنت لە ڕۆژی کۆتاییدا ؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (( ..... بەختەوەر ترین کەسان بە تکا کردنی من لە ڕۆژی کۆتاییدا ئەو کەسەیە کە وتویەتی (لا اله الاالله) بە دڵسۆزیەوە لە ناخی دڵیەوە).

---

[٣٤] أخرجه: الاجرى ((الشريعة)) (٨٢٩) وقال محققه: رجاله ثقات، وقال الحافظ في ((الفتح)) (٤٢٦/١١): أخرجه سعيد بن منصور بسند صحيح.

[٣٥] أخرجه: أحمد (٣٤٧/٥)، و الطبراني (٥٣٥٦) يسند حسن " كما قال الحافظ العراقي في تخرجه ((لإحياء علوم الدين)) (٥١٠/٤) و اورده القاضي ((الشفا)) (٤٢٥) وقال محققه: اسناده ضعيف، وضعّفهُ الشيخ الالباني من طريق الامام احمد فقط – انظر: ((ضعيف الجامع)) (٢٠٩٥) .

[٣٦] اخرجه: أحمد (٣٠٧/٢)، و البخاري (٩٩) (٦٥٧٠)، و في ((الصحيح الجامع)) (٩٧٦) .

# جۆرەکانی تری تکا کردن و شایەتی دەرانی تر بۆ ئادەمیزاد لە ڕۆژی کۆتاییدا

لەگەڵ تکا کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئومەتەکەی چەندەها جۆر تکا کاری تر دەبێت لە ڕۆژی کۆتاییدا، بەڵکو هەموو یەکێکیش دەمە قاڵە و بەرگری لەسەر خۆی دەکات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ (النحل: ١١١) .

**لەو جۆرە شایەتی دانە و تکا کردنانەی تر:**

**یەکەم: شایەتی دانی جنۆکە و ئادەمیزاد و بێ ڕۆحەکان بۆ موسوڵمانێکی بانگ بێژ.**

**ئەبی سەعید (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەپێی فەرمووە:** (( إني أراك تُحِبّ الغَنم و البَادية، فإذا كنت في غَنمِك أو باديتك، فأذنت بالصلاة، فارفع صوتك بالنداء، فإنه لا يسمع صوت المؤذن جن ولا إنس ولا شيء إلا شَهِدَ له يوم القيامة ))[٣٧] **واتە: (من وادەبینم کە مەڕ ولادێت پێ خۆش بێت، گەر تۆ لە نێو مەڕ ولادێ کەتدا بوویت و بانگت دا بۆ نوێژ دەنگت بڵند کرد، چونکە هەر شتێ گوێی لە دەنگی بانگ بێژ بێت جنۆکە و ئینسان و شتانی تر ئەوانە هەموو شایەتی بۆ دەدەن لە ڕۆژی کۆتاییدا).**

**دووەم: شایەتی دانی سەرە پەنجەکان.**

**بوشرەی کچی یاسر** (رضي الله عنها) **دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( ...وأعقِدَن بالأنامِل فإنّهنَ مسؤولاتٌ و مستُنطِقات ))[٣٨] **واتە: (...یادی خوا بە گرێی سەر پەنجەکان بکەن چونکە ئەوانە پرسیار لێ کراون و دەهێنرێنە زمان).**

---

[٣٧] أخرجه: أحمد (٣/٣٥)، والبخاري (٦٠٩)، والنسائي (١٢/٢)، وابن حبان (١٦٦١) قال المحقق: إسناده صحيح على شرط البخاري . و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٦٢٥) .

[٣٨] أخرجه: أحمد (٦/٣٧٠)، ابن سعد (٣١/٨)، والطبراني ((الكبير)) (١٨١/٢٥)، والترمذي (٣٤٨٦)، و أبو داود (١٥٠١)، ابن حبان (٨٤٢)، وحسنه النووي ((الأذكار)) (ص:١١١)، و الحاكم (٥٤٧/١) و سكت عنه و صححه الذهبي، وقال ابن حجر ((نتائج الأفكار)) (٨٤/١):حديث حسن. و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترمذي)) (٢٧٧٢)، و ((صحيح سنن أبي داود)) (١٣٢٩) .

**سێیەم: تکا کردنی قورئان بە گشتی.**

**ئەبو ئومامە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( إقرؤوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعاً لأصحابه))[٣٩] **واتە: (قورئان بخوێنن چونکە قورئان لەڕۆژی کۆتاییدا دێت و تکاکار دەبێت بۆ خاوەنەکەی).**

**چۆنێتی تکا کردنەکەی لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە عەبدولڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( ...يقول القرآن: منَعتُه النَومَ باللّيلِ فشفعِنِي فيه ))[٤٠] **واتە: (... قورئان دەڵێت: خەوتنم لێ قەدەغە کردبوو بە شەو بمکە بەتکاکار بۆی) .**

**بێ گومان ئەو قورئان خوێنانە دەبێت ڕەفتاریان بە قورئان کرد بێت ئینجا تکایان بۆ دەکات لە ڕۆژی کۆتاییدا.**

**نەواسی کوڕی سەمعان (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (( يأتي القرآن و أهله الذين يعملون به في الدنيا... ))[٤١] **واتە: (قورئان و خاوەنەکانی دێن کە کاریان پێ کردوون لە دونیادا ... ).**

**چوارەم: تکاکردنی سورەتی ( البقره، ال عمران ) بە تایبەتی.**

**ئەبو ئومامە (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی:** ((...إقرؤوا الزهّراوين البقرة و آل عمران فإنهما يأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان سوداوان و بينهما شَرفٌ[٤٢] أو كأنهما ظلةٌ من طير صوآفّ تجادلان في رواية تحاجان عن أصحابهما ))[٤٣] **واتە: (دوو گوڵاوی یەکە بخوێنن ....: دوو سوڕەتی( البقرة وال عمران ) چونکە ئەو دوانە دێن لە ڕۆژی کۆتاییدا، وەك دوو پەڵە هەوری ( ڕەش)، یاخود وەك پۆلە باڵندەیەکی**

---

[٣٩] أخرجه: أحمد (٢٤٩/٥)، مسلم (٨٠٤) .

[٤٠] أخرجه: أحمد، و الحاكم (٥٥٤/١) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و قال الهيثمي في ((المجمع)) (٣٨١/١٠ ): إسناده حسن، و صححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (١٩٦٣)، و ((تمام المنة)) (ص:٣٩٥) .

[٤١] أخرجه: الترمذي (٢٨٨٣) و قال حديث غريب، وصححه الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٣١٢) .

[٤٢] في رواية: الترمذي (٢٨٨٣)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٣١٢) .

[٤٣] أخرجه: أحمد (٢٤٩/٥)، و مسلم (٨٠٤)، و الطبراني ((المعجم الكبير)) (٧٥٤٧)، والبيهقي ((الكبرى)) (٣٩٦/٢)،و ((الصغرى)) (٨٧٧) .

ڕیزکراو دێت و بەڵگە دەهێننەوە بۆ خاوەنەکەیان ( واتە: تکا دەکەن بۆ خاوەنەکانیان)، وە ئەم دوو سورەتە بەڕێزە دێن لە پێش سەرجەم سورەتەکانی تری قورئان و پێشیان دەکەون لە ڕۆژی کۆتاییدا .نەواسی کوڕی سەمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( یأتي القران و أهلَه الذين يعملون به في الدّنيا تُقدِّمهُ سورةُ البقرةِ وآل عمران كأنهما غَيايتان))[٤٤]واتە: ( قورئان و قورئان خوێنەکان دێن کە کاریان پێ کردووە لە دونیادا سورەتی ( البقرة وال عمران) وەك دوو پەڵە هەور پێشیان دەکەون (واتە: پێش سورەتەکانی قورئان دەکەون )).

**پێنجەم: تکا کردنی سورەتی ( تبارك ) بۆ خاوەنەکەی.**

ئەبی هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:(( إن سورة في القران ثلاثون أيةً شفعت لرجل حتى غُفِرَ له وهي: سورة تبارك))[٤٥] واتە: (سورەتێك هەیە لە قورئاندا کە سی ئایەتە تکای کرد بۆ پیاوێك تا خوا لێی خۆش بوو ئەویش سورەتی( تبارك )ە .

**شەشەم: شایەتی دانی بەردە ڕەشەکە (الحجر الاسود ) بۆ ئەو کەسەی بەڕاستی دەستی لێداوە.**

ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ليبعثن اللهُ هذا الرّكْنَ الحَجَر يوم القيامة له عينان ينظر بهما، و لسان ينطق به يشهد لمن استلمه بحق))[٤٦] واتە: خوای گەورە ئەو بەردە دەهێنێت لە ڕۆژی کۆتاییدا و دوو چاوی هەیە

---

[٤٤] أخرجه: الترمذي (٢٨٨٣) و قال غريب، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٣١٣) .

[٤٥] أخرجه: أحمد (٢/٢٩٩)، و ابوداود (١٤٠٠)، والترمذي (٢٨٩) وقال: حديث حسن، ابن ماجة (١٣٧٨٦)،و الحاكم (٥٦٥) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان (٧٨٧) و قال المحقق: إسناده حسن، و البيهقي((الصغرى)) (٨٨٨)، و قال الحافظ في ((التلخيص)) (١/٢٣٤) له شاهد عند الطبراني بإسناد صحيح، وصححه الشيخ الالباني في: ((صحيح سن ابي دادود)) (١٢٦٥)، و((صحيح سنن الترمذي)) (٢٣١٦)، و((صحيح سنن ابن ماجه)) (٢٥٣)، و((المشكاة)) (٢١٥٣) .

[٤٦] أخرجه: احمد (١/٢٦٦) و قال محققه الأرناؤوط (٢٦٤٣): إسناده صحيح على شرط مسلم، و الترمذي (٩٦١) و قال: حديث حسن، و ابن ماجة (٢٩٤٤)، و الدارمي (١٨٤٦)، و الحاكم (١/٤٥٧) وصححه ووافقه الذهبي، والبيهقي (٥/٧٥)، وابن حبان (٣٧١٢) و قال المحقق: حديث صحيح، وصححه الشيخ الاليانى في: ((صحيح سنن الترمذي)) (٧٦٨)، ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٣٨٢)، ((المشكاة)) (٢٥٧٨) .

تەماشای پێ دەکات و زمانێکی هەیە قسەی پێ دەکات و شایەتی دەدات بۆ ئەو کەسەی کە دەستی لێ داوە بەڕاستی ) .

**حەوتەم: تکا کردنی ڕۆژوو بۆ خاوەنەکەی.**

عەبدولڵای کوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((الصيام و القران يشفعان للعبد، يقول الصيام: أي رب اني منعته الطعام و الشراب بالنهار فشفعني فيه ... فيشفعان))[٤٧] واتە: (ڕۆژوو وە قورئان هەردووکیان تکا دەکەن بۆ بەندە، ڕۆژوو دەڵێت: ئەی پەروەردگاری من خواردن و خواردنەوەم لێ قەدەغە کردبوو بەڕۆژ، تکام لێ وەرگرە بۆی، و قورئانیش دەڵێت: ( ئەی پەروەردگار) خەوتنم لێ قەدەغە کردبوو بەشەو تکام لێ وەربگرە بۆی، ئینجا هەردووکیان تکایان لێ وەردەگیرێت).

**هەشتەم: تکا کردنی خاوەن باوەڕان هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان.**

هەندێك لەو جۆرە تکا کردنانە بەم شێوەیە دەبن:

**١ ) تکا کردنی شەهید:**

شەهید تکا دەکات بۆ حەفتا کەس لە خزمانی، میقدام دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( للشهيد عند الله ست خصال: يغفر له في أول دمعه من دمه ... و يُشفَعُ في سبعين إنساناً من أقاربه ))[٤٨] واتە: (شەهید لای خوا شەش شتی بۆ هەیە: خوا لێی خۆش دەبێ بە دەرچوونی یەکەم دڵۆپی خوێنی...... و تکا دەکات بۆ حەفتا کەس لە خزمانی) .

---

[٤٧] أخرجه: أحمد (١٧٤/٢)، و الحاكم (٥٥٤/١) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و قال الهيثمي في: ((مجمع الزوائد)) (٣٨١/١٠ ): رواه أحمد و إسناده حسن، و قال الشيخ الألباني في تحقيقه على ((المشكاة)) (١٩٦٣): صحيح على شرط مسلم، وأنظر: ((صحيح الجامع)) (٣٧٧٦) .

[٤٨] أخرجه: أحمد (١٣١/٤)، والترمذي (١٦٦٣) و قال: حديث حسن صحيح غريب، و ابن ماجة (٢٧٩٩)، وقد صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٣٥٨)، و ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٢٥٧)، و ((صحيح الجامع)) (٣٧٤٧)، و ((المشكاة)) (٣٨٣٤)، و ((مختصر شرح العقيدة الطحاوية)) (ص:٢٦٠) .

**ب ) تکا کردنی ڕاست گۆیان :**

ڕاست گۆیانیش (الصدیقین) وەك مەلائیکە بەڕێزەکان تکا دەکەن بۆ موسوڵمانان، وەك ئەبو بەکری صدیق(ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( ...ثم یقال أدع الصدیقین فَیَشفَعُون))[٤٩] واتە: (.... ئینجا دەوترێت: ڕاست گۆیان بانگ بکەن ئەوانیش دێن و تکا دەکەن).

تکا کردنی خاوەن باوەڕانی ڕاست گۆ بۆ موسوڵمانان بە گوێرەی پلەی ڕاست گۆیی و باوەڕیان دەبێت هەتا ڕاستگۆی وا هەیە تکا بۆ سەرجەم عەشیرەتێك دەکات، عەبدولاّی کوڕی جەدعان (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( لیدخلن الجنة بشفاعة رجل مِن أمتي أكثر من بني تميم ))[٥٠] واتە: (بە تکا کردنی پیاوێك لە ئومەتەکەم زیاتر لە بەنو تەمیم دەچێتە بەهەشت (بەنوتەمیم: یەکێکە لە هۆزە گەورەکانی عەرەب))، بڕواداران تکا بۆ یەکتر دەکەن تەنها ئەوانە نەبێت کە وشەی لەعنەتیان بە زۆری بەکار هێناوە لە دونیادا، زەیدی کوڕی ئەسلەم (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( ... إن اللّعانين لا يكونون شهداء ولا شفعاء يوم القيامة))[٥١] واتە: ( .... لەعنەتکاران نابن بە تکا کار و شایەتی دەر لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**ج ) تکا کردنی خاوەن باوەڕان بۆ برایانی مردووی خۆیان لە کاتی نوێژ کردن لە سەریان لە دونیادا :**

ئەمەش ئەو موسوڵمانە مردووانە دەگرێتەوە کە برایانی بڕواداری خۆیان نوێژیان لەسەر کردوون وداوای لێ خۆش بوون و پلە بەرزیان بۆ کردوون. ئیبنو عەباس (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((ما من مُسلم يموت فيقوم على

---

[٤٩] أخرجه: ابن حبان (٦٤٧٦) و قال الأناؤوط في تحقيقه: إسناده جيد .

[٥٠] أخرجه: أحمد (٤٦٩/٣)، و الدارمي (٣٢٨/٢)، و الترمذي (٢٤٣٨) و قال: حديث حسن صحيح غريب، و ابن ماجة (٤٣١٦)، و الحاكم (٧٠/١) و صححه و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٧٣٧٦) و قال المحقق: إسناده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٥)، و ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٨٤)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٢١٧٨)، و ((المشكاة))(٥٦٠١) .

[٥١] أخرجه: البخاري ((الأدب المفرد)) (٣١٦) و صححه العلاّمة الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (٢٤٠)، و مسلم (٢٥٩٨)، و ابن حبان (٥٧٤٦) و قال المحقق: إسناده قوّي .

جنازته أربعون رجلاً [٥٢] لا يشركون بالله شيئاً فيشفعون إلا شَفعُهم الله فيه))[٥٣] واتە: (هەر موسوڵمانێك بمرێت و ( چل پیاو ) (لە ڕیوایەتێکی تردا: سەدکەس) نوێژ بکەن بەسەر تەرمەکەیەوە وهاوتایان بۆ خوا بڕیار نەدابێت ئەوانە چی داوا بکەن بۆ مردووەکە خوای گەورە تکا کردنەکەیان لێ وەردەگرێت).

**نۆیەم: شایەتی دانی پارە بەسەر خاوەنەکەیەوە.**

ئەبی سەعیدی خودری (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( ... وإنه من يأخذه (أي المال) بغير حقه كان كالذي يأكل ولا يشبع و يكون عليه شهيداً يوم القيامة ))[٥٤] واتە: (... هەر کەسێك ئەو پارەیە وەربگرێت کە مافی خۆی نەبێت وەك ئەوە وایە کە دەخوات و تێرنابێت و دەبێت بە شایەت بە سەریەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**دەیەم: شایەتی دانی زەوی.**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴾ (الزلزلة: ٤) (ابن كثير ) دەفەرموێت: ((أي: تحدث بما عمل العاملون على ظهرها))[٥٥] واتە: (زەوی شایەتی دەدا لەسەر ئەوانەی لەسەر پشتی ژیاون وەچ کارێکیان ئەنجام داوە) .

سەبارەت بەم باسە فەرموودەیەکی (ضعيف) هاتووە تەنها لەبەر زیاتر بە ئاگابوون دەیهێنین. ئەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴾ و فەرمووی ((أتدرون ما اخبارها ؟ قال قالوا: الله و رسوله اعلم . قال: (( فان اخبارها ان تشهد على كل عبدٍ و أمة بما عمِل على ظهرها أن تقول: عمل كذا وكذا

---

[٥٢] في رواية مسلم (٩٤٧): ((يَبلغُونَ مئة)) .

[٥٣] أخرجه مسلم (٩٤٨)، و أبو داود (٣١٧٠)، و ابن ماجة (١٤٨٩)، وابن حبان و قال محققه: (٣٠٨٢): إسناده حسن على شرط مسلم . و انظر: ((السلسلة الصحيحة)) (٢٢٦٧) .

[٥٤] رواه مسلم (٤١٩/١)(٢٤٢٠) .

[٥٥] انظر: ((تفسير القرآن العظيم)) لابن كثير (٤٥٨/٦).

في يوم كذا وكذا، قال: فهذا اخبارها))[٥٦]. واتە: ئایە دەزانن هەواڵەکانی زەوی چی یە ؟ ئەوانیش وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، ئینجا فەرمووی: هەواڵەکانی زەوی ئەوەیە کە شایەتی لەسەر هەموو پیاو و ئافرەتێك دەدات بەو کارەی کە ئەنجامی داوە لەسەر پشتی و دەڵێت: ئەو کارە و ئەو کارەی ئەنجامدا لە ڕۆژی ئەوەندە و ئەوەندەدا.ئەوەش هەواڵەکانی زەوی یە).

وە سەبارەت بەم باسە: موجمەعی تەیمی (رحمه الله) فەرموویەتی: ((كان عليٌّ يكنس بيت المال ويتخذه مسجداً يصلي فيه رجاء ان يشهد له يوم القيامة))[٥٧] واتە: (ئیمامی عەلی (بيت المال)ی گسك دەدا و کردبوویە شوێن نوێژ و نوێژی تیدا دەکرد بەو هیوایەی ئەو جێگەیە شایەتی بۆ بدات لە ڕۆژی کۆتاییدا). وە هەروەها (عطاء الخراساني ) (رحمه الله) دەفەرموێت: (( ما من عبد يسجد سجدة في بقعة من بقاع الارض الا شهدت له بها يوم القيامة و بكت عليه يوم يموت))[٥٨] واتە: (هەر بەندەیەك لە هەر جێگەیەك لە جێگەکانی زەویدا سوجدە و کڕنوشی بۆ خوا تیادا بردبێت، ئەو جێگەیە شایەتی بۆ دەدات لە ڕۆژی کۆتاییدا و دەگری بۆی لەو ڕۆژەدا کە دەمرێت).

---

[٥٦] أخرجه: أحمد (٢/٣٧٤)، والحاكم (٢/٢٥٦)، والترمذي (٣٣٥٣)، والنسائي ((الكبرى)) (١١٦٩٣) و ((التفسير)) (٧١٣) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن حبان (٧٣٦٠) وقال محققه / اسناده ضعيف، و ضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف الترغيب)) (٢١٠٤)، و((الضعيفة)) (٤٨٣٤).

[٥٧] أخرجه: أحمد ((الزهد)) (ص: ١٣٠-١٣١)، و الاصبهاني ((سير السلف)) (٢٠٢/١) وقال محققه: اسناده صحيح

[٥٨] أخرجه: ابو نعيم ((الحلية)) (١٩٧/٥)، وابن المبارك ((الزهد)) (٣٢٤) وقال محققه: اسناده صحيح .

# پێدانی نامەی کردەوەکان

**خوای گەورە (تبارك و تعالی) لە ڕۆژی کۆتاییدا هەموو کردەوەکانی ئادەمیزادی لە کتێبێکدا کۆکردۆتەوە و نیشانی بەندەکەی خۆی دەدات تا لێی ڕوون و ئاشکرا بێت کە خوای گەورە لە هەموو کارەکانی ئاگادار بووە[1]، و لە ڕۆژی کۆتاییشدا پاداشت و سزا بە گوێرەی کردەوەکانی دەبێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴾ (الإسراء: ١٣).

**بێ گومان نامەی کردەوەکان هەموو کارەکانی ئەو کەسەی تێدایە لە بچوك و گەورە کە ئەنجامی داون لە ژیانی دونیادا، خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾ (الكهف: ٤٩).

**واتە: ﴿نامەی کردەوەکان دادەنرێت، تاوانباران دەبینیت کە دڵەڕاوکێیانە لە کارو کردەوەی ناپەسەندی تۆمارکراویان، بۆیە دەڵێن هاوار لە ئێمە ئەم نامە و دۆسیەیە چییە؟! هیچ گوناهێکی ورد و درشت بەجێ ناهێڵت و هەمووی تۆمار کردووە، ئەوخەڵکە هەرچیان کردووە، ئامادەیە، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات﴾. هەروەها دەفەرموێت:** ﴿ وَكُلُّ شَىْءٍ فَعَلُوهُ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴾ (القمر: ٥٢ – ٥٣) . **واتە: ﴿هەر چی کارو کردەوەیەك کە ئەنجامیان داوە لە** (لوح المحفظ) **و لە لای فریشتەچاودێرەکان تۆمارکراوە ﴿٥٢﴾ هەرچی وردو درشت هەیە، لە کارو کردەوەیان نوسراوە و تۆمارکراوە﴾.**

**هەموو بەندەیەك نامەی کردەوەکانی پێ دەبەخشرێت لە نووسراوێکدا و خوای گەورە ستەم لە کەس ناکات بە نووسینی خراپەیەك کە نەیکردبێت، وەك خوای گەورە**

---

[1] عن أنس ﷺ قال: (يومين و ليلتين لم تسمع الخلائق مثلهما: يوم تأتيك البشرى من الله تبارك و تعالى، إما بعذابه و إما برحمته، و يوم تعطى كتابك إما بيمينك أو بشمالك، و ليلة تبيت في القبر وحدك ... و ليلة صبيحتها يوم القيامة ... ) أخرجه:ابن المبارك في ((الزهد))(ص:٨٥)، و البيهقي في: ((الشعب)) (٦٩٧)، و الدينوري في ((المجالسه)) (١٩) و قال محققه: إساده حسن

دەفـەرموێت: ﴿ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ (الجاثيـة: ٢٩) هـــــەروەها: ﴿ يَوۡمَ نَدۡعُواْ كُلَّ أُنَاسِۭ بِإِمَٰمِهِمۡۖ فَمَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقۡرَءُونَ كِتَٰبَهُمۡ وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلٗا ﴾ (الإسـراء: ٧١) واتـه: ﴿لـەو ڕۆژەدا هـەموو خـەڵکان بـانگ دەکرێن بە نـاوی پێشـەواکانیانەوە، جـا ئـەوەی نامـەی کردەوەکـانی بدرێتـە دەسـتی ڕاستی، ئەوانە سەیری نامەی کردەوەکانی خۆیان دەکەن و دەیخوێنـەوەو هێندەی تاڵی ناوکی خورما ستەمیان لیٚ ناکرێت﴾، لەو ڕۆژەدا داوا لە هەموو کەس دەکرێت کە نامـەی کردەوەکـانی بخوێنێتـەوە و خـۆی حـوکمی خـۆی بـدات، وەك خـوای گـەورە دەفەرموێت:﴿ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴾ (الإسراء:١٤) .

کردەوە چاکەکانی باوەڕداران تـەنها ئـەو کارە چاکانەی تیا تۆمار کراوە کە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەنجام دراوە.

## چۆن باوەڕداران و بیٚ باوەڕان نامەی کردەوەکانیان پیٚ دەدرێت؟

خـوای گـەورە هـەموو بەندەیـەکی خـاوەن بـاوەڕ نزیـك دەکاتـەوە و لـە خـەڵکانی دەشارێتەوە و وای لیٚ دەکات کە دان بە هەموو گوناهەکانیدا بنێت ئینجا لێی خۆش دەبێـت ، وەك ئیبنـو عومـەر(ﷺ) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: (( يدنو [2] المؤمن من ربه يوم القيامة حتى يضع عليه كنفه [فيستُره مِن النّاسِ]، ثم يُقرّرِهُ بذنوبه فيقولُ: [أتعرِفُ ذنب كذا و كذا؟ فيقول: نعم [رّبِ اعرف] فيقول: اتعرِفُ ذنبَ كذا و كذا؟ فيقول: نعـم [ربِ أعـرِفُ] حتّى اذا بلـغ مـا شاء ان يبلـغ [و في روايـة البخـاري (٢٤٤١): حتى اذا قرّره بذنوبه و ظن في نفسه أنّه قَد اِستَوجَبَ أي: (هلك)] قال الله تعالى: فإنّي قد سَترتها عليك في الدّنيا، و انّي اغفِرُها لك اليوم " ثم يعطى صحيفة حسـناته [3]...))[4] واتـه:

---

[2] في رواية: البخارى (٢٤٤١): ((إن الله يُدنى المؤمن منه يوم القيامة حتى يضع عليـه كنفـه)) في روايـة: ((... لايسـتر الله عبداً في الدنيا الا ستره يوم القيامة)) أخرجه: أحمد (٦٥/٥)، وصححه الشيخ اللبـاني في ((صـحيح الجـامع)) (٣٠٢١)، و((الصحيحة)) (١٣٨٧)..

[3] عن أبي عثمان الهندي (ﷺ) قال: ((يَعطى الرّجل صحيفته يوم القيامة، فيقرأ أعلاها، فإذا سيئاته، فـإذا كـاد يَسـوُء ظَنّـه، نظر في أسفلها، فإذا حسناته، ثم نظر في أعلاها فإذا هي قد بُدّلِت حسنات)) أخرجه:ابن المبـارك ((الزهـد)) (١٤١٥)، و قال ابن كثير ((البداية)) ٢٤١/٨: سنده صحيح رجاله رجال الشيخين .

(خوای گەورە خاوەن باوەڕ لە ڕۆژی کۆتاییدا نزیک دەکاتەوە لە خۆی هەتا دەیخاتە ژێر سایەی خۆی (و دای دەپۆشێت لە پێش چاوی خەڵکی) ئینجا وای لێ دەکات کە دان بە هەموو گوناهەکانیدا بنێت و پێی دەفەرموێت (ئایا تاوانی ئەوە و ئەوەت دەناسیتەوە) ؟ ئەویش دەڵێت: (بەڵێ پەروەردگارم دەیناسمەوە) هەتا دەیگەێنێتە ئەو شوێنەی کە خوا دەیەوێت پێی بگات (لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا ژمارە -٢٤٤١- هەتا ئەگەر دانی بە گوناهەکانیدا نا و گومانی وابوو لە دەروونی یەوە کە ئیتر لە ناو چووە، خوای گەورە دەفەرموێت: من لە دونیادا بۆم پۆشیبوویت ئەمڕۆش لێت دەبوورم ئینجا نامەی کردەوەکانی پێ دەدرێت). ئائەمە لێپرسینەوەی سووک و ئاسانە کە خوای گەورە لە بەندە باوەڕدارەکانی دەپرسێتەوە، وە تەماشای نامەی کردەوەکانیان دەکات و لێیان خۆش دەبێت وەك هاتووە لە فەرمووده پیرۆزەکاندا ، لە عائشەوە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((اللّهم حاسبني حساباً يسيراً)) قلت: يا رسول الله: ما الحسابُ اليسُير ؟ قال: ((أن ينظر في كِتابه [سيئاته] وفي رواية: فيتجاوز له عنها))[5] واتە: (گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو: (خوایە لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکە بە لێپرسینەوەیەکی ئاسان)، دەفەرموێت منیش وتم: (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێپرسینەوەی سووك چی یە ؟) ئەویش فەرمووی:(ئەوەیە کەتەماشای (کارە خراپەکانی) لە کتێبەکەیدا بکات و دواتر لێی ببورێت) .

خاوەن باوەڕان بە وەرگرتنی نامەی چاکەکانیان زۆر بە خۆش حاڵی و کامەرانیەوە دەگەڕێنەوە لای خزمانیان و مژدەیان پێ دەدەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ۝٧ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۝٨ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴾ (الانشقاق: ٧ -٩) خاوەن باوەڕ کارە چاکەکانی لە ناو نامەی کردەوەکانیدا نیشانی برایان و خزمانی خۆی دەدات و بیریان دێنێتەوە کە ئەو هەر لە دونیادا باوەڕی بە

---

[4] أخرجه: أحمد (٧٤/٢)، و البخاري (٢٢٧٦) (٦٠٧٠)، و مسلم (٥٠٠/٢) كتاب الرقاق (قبول توبة القاتل)، و ابن حبان ٧٣٥٥ و قال المحقق: إسناده صحيح على شرط البخاري، و ابن ماجة (١٨٣)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٥١) .

[5] أخرجه: أحمد (٤٨/٦)، و الحاكم (٥٧/١) صححه و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٧٣٧٢): و قال الأرناؤوط في تحقيقه: إسناده حسن، و قال الشيخ الألباني في تحقيقه لكتاب ((السنة)) ابن أبي عاصم (٤٢٩/٢): إسناده صحيح .

زیندوبوونـەوە و پێـدانی نامـەی کردەوەکـانی بـووە، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت:
﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾ (الحاقة: ١٩ – ٢١)

بـەڵام بـێ بـاوەڕان و دووڕووان بانگیـان لێ دەکرێـت و دەسـت نیشـان دەکـرێن و ئابڕوویان دەبرێت وەك ئیبنـو عومـەر (رضي الله عنه) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: (( ... و أما الكفـار و المنـافقون [فيُنـادى علـى رؤوس الأشـهاد] - و في روايـة: فيقـــول الأشـــهاد: ﴿ .... وَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾ (هـود: ١٨) ))[٦] واتـە: (..... بـەڵام بـێ بـاوەڕان و دووڕووان (بانگیـان لێ دەکرێت لە پێش چاوی ئامادەبووان)، لەڕیوایەتێکدا: و ئامادەبووان دەڵێن: ئـا ئەوانـە بوون کە درۆیان بەناوی خوا وە دەکرد، هەی نەفرەتی خوا لە ستەمکارەکان بێت) .

بێ باوەڕان لەو ڕۆژەدا نامەی کردەوەکانیان بە دەستی چەپ لـە پشـتیانەوە پێیـان دەدرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ ﴾ (الانشقاق:١٠).

ئەم بێ باوەڕانە کەبـەم جۆرە نامـەی کردەوەکانیـان پـێ دەدرێـت ئەوانـە بـوون کـە باوەڕیـان بـە خـواو پێغەمبـەرانی خـوا نـەبووە و شـوێن نـەفس و ئـارەزووی خۆیـان کـەوتبوون لـە دونیـادا، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ ...... ﴾ (الجاثية :٢٣)

بێ باوەڕان نامەی کردەوەکانیان وەردەگرن و دەترسێن لە کردەوەکانیان و دەبینن کە هەموو تاوانێکی بچوك و گەورە کە لە دونیادا ئەنجامیان داوە تۆمار کراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ۚ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾ (الكهف: ٤٩ ) بێ باوەڕان دوای وەرگرتنی نامەی کردەوەکانیان دەست دەکەن بە شیوەن و هاوار، وەك خوا یگەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰ إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ

---

[٦] أخرجه: البخاري (٢٢٧٦) (٦٠٧٠) .

بَصِيرًا ﴾ (الانشقاق: ١٠ – ١٥ ). واتە ﴿ئەوەی نامەی کردەوەکانی لە پشتەوە درایە دەستی﴿١٠﴾ ئەوە لەمەولا هاوار و دادی لێبەرز دەبێتەوە و دەڵێت: خوایە مەرگ، خوایە بمکوژە، ﴿١١﴾ دەخرێتە ناو دۆزەخ ﴿١٢﴾ چونکە بەڕاستی ئەو جۆرە کەسە کاتی خۆی لە ناو ماڵ و خێزانیدا بە ئاهەنگی ناشەرعی بە بەرپاکردنی سفرەوە خوانی حەرام دڵخۆش بوو﴿١٣﴾بڕوای وا بوو کە هەرگیز زیندوو بوونەوە و گەڕانەوە و لێپرسینەوە نی یە ﴿١٤﴾ نەخێر بەگومانی ئەو نەبوو، پەروەردگاری چاك ئاگاداری کردەوەکانی بوو وە دەیبینی چی دەکات﴾

بێ باوەڕان لەو ڕۆژەدا خۆزگە بەوە دەخوازن کە هەرگیز نامەی کردەوەکانیان پێ نەدرایە، وە حسابی خۆیان نەزانیایە، وە خۆزگە دەخوازن کە مردنەکەی دونیایان یەکجاری بوایە وە زیندوو نەبوونایەتەوە و خۆڵ بوونایە پاشان خوای گەورە کۆت و زنجیر دەکاتە گەردنی بێ باوەڕان و فەرمان دەکات کە بخرێنە ناو دۆزەخەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾ ( الحاقة: ٢٦ – ٣٠ )

هەروەها هەریەك لەو بێ باوەڕانە بە کۆت و زنجیرەکانیانەوە لە گەڵ فریشتەیەکدا دەبرێت بۆ لای خاوەن باوەڕێك و پێی دەوترێت ئائەم بێ باوەڕە لە جێگەی تۆ دەخرێتە دۆزەخ و شوێنەکەی تۆی پێ پڕدەکرێتەوە لە دۆزەخ .

وەك ئەبی بوردە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (( إذا كان يوم القيامةِ بُعِثَ [٧] الى كل مؤمن بملك معه كافر فيقول الملك للمؤمن: يا مؤمن هاك هذا الكافر، فهذا فداؤك من النار))[٨] واتە: (کاتێك ڕۆژی کۆتایی هات دەنێررێت بۆ لای هەموو خاوەن باوەڕێك (لە ڕیوایەتێکدا: موسوڵمانێك) فریشتەیەك کە کافرێکی لەگەڵدایە، فریشتەکە بە خاوەن باوەڕەکە دەڵێت: ئەی خاوەن باوەڕ بگرە ئەو کافرە فیداکارتە و لە جێی تۆ لە دۆزەخ دادەنرێت .

---

[٧] و في رواية: مسلم (٦٩٤٢): ((اذا كان يومُ القيامة، دفع الله عزّوجل الى كُلّ مُسلمٍ، يهوديّاً او نصرانيّاً، فيقول: هذا فِكاكَ مِن النّار)) .

[٨] أخرجه: ابن عساكر (٤٣/١٨)، و قال الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٨١): إسناده صحيح .

# ڕوو سپی و ڕوو ڕەش بوون

ئا لەو ڕۆژەدا خاوەن باوەڕانی دڵسۆزی یەکخوا پەرست لە پەیڕەوانی ئەهلی سونەت و جەماعەت کە ڕێنموویی ڕێبازی پێغەمبەرەکەی خۆیان کردووە وە ڕێنمووی هەڵسوکەوتی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) کردووە، ڕووگەش و ڕوو سپی دەبن، وبێ باوەڕان و هەندێك لە ئەهلی قیبلەی تاوانبار لە کۆمەڵانی بیدعەچی و لادەر لە ڕێ نموویی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خەلیفە ڕاشیدە هیدایەت دراوەکان، ئەوانەی کە لەسەر هەوا و ئارەزووە خراپەکانیان و گۆڕینە ناڕەواکانیان و گومانە گومڕاکانیان بەردەوام بوون، و لادەر بوون لە ڕێگەی ڕاست و شوێن ئەو ڕێچکانە کەوتوون کە ڕازاندویانەتەوە بە بیر و بۆچوونە گومڕاکارانەی خۆیان ئەوانە هەموو ڕوویان ڕەش دەبێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ﴾ (عبس: ٣٨ - ٤٢). واتە: ﴿لە وڕۆژەدا ڕوخسارانێك هەن کە گرژ وتاڵ و تۆزاوی و پەست و غەمگینن﴿٤٠﴾ دێزی و ڕەشی و تاریکی دایپۆشیون ﴿٤١﴾ ئا ئەوانە بێ باوەڕو خوانەناس و تاوانبارە گوناهکارەکانن﴾.

خوای گەورە لەسورەتی (آل عمران)دا فەرمان بە خاوەن باوەڕان دەکات کە لانەدەن لە ڕێنموویی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) هەتا وەکو ئومەتە پێشووەکان نەبن کە لایان دا لە ڕێنموویی پێغەمبەرەکانیان وە لە کتێبەکەی خوای گەورەیان کە بوو بە هۆی ئەوەی کافر ببن دوای باوەڕ هێنانیان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ ۚ وَأُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللَّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (آل عمران: ١٠٥ - ١٠٧)

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەفەرموێت: ((تَبيضُ وجَوه أهل السنة و الجمَاعة و تَسوّدُ وجُوه أهلُ البدعَـةِ و الفرقـة))[1] واتـە: (ڕووی ئـەهلی سوننە و جەماعەت سپی دەبێـت وە ڕووی کۆمـەلآنی ئـەهلی بیدعەچـی وجیاوازخواز و ئـاژاوەگێڕ ڕەش دەبێت) .

ئیمامی پایە بەرز (ابن کثیر) لە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا دەفەرموێت: " و قولـه تعالی ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾ يَعْني يَومَ القِيامَةِ، حينَ تَبيَّض وُجُـوه أهـلَ السُـنَةِ و الجَماعَـةِ، و تَسوَّدُ وجُـوُهُ أَهـلِ البِدْعَـةِ و الفِرقَـةِ"[2] واتـە: (خـوای گـەورە دەفەرموێت ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾ ئەمـەش لـە ڕۆژی کۆتاییـدا دەبێـت کاتێـك کـە ڕووی ئـەهلی سـوننە و جەماعە سپی دەبێت و ڕووی کۆمەڵی بیدعەچی و جیاوازکار ڕەش دەبێت .

ئیبن کـثیر لـە درێـژەی تەفسـیرکردنی ئـەم ئایەتـەدا ئـەم فەرموودەیـەی هێنـاوە وەك بەڵگەیەك بۆ جوانتر ڕوون کردنـەوەی ئـەم ئایەتـە پیرۆزە ئـەبو غالـب (ﷺ)دەفەرموێت: ((رأى أبو أُمامَة رؤوُساً منصُوبَةً على دَرجِ مَسْجِدِ دِمشقَ، فقالَ أبو أُمامَةَ: كِلابُ النّـارِ شـرُّ قتلـى تحتَ أَديمِ السَّماءِ، خيرُ قتلى مَنْ قَتلوُهُ، ثُـمّ قَـرأَ ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ (إلى قولـه تعـالى) بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ قلتُ لأبي أُمامَة أَنْتَ سَمِعتهُ مِنْ رسول الله (ﷺ) ؟ قـال أبـو أُمامـة: لَـو لَـمْ أَسمعهُ إِلاّ مَرَّةً أَو مَرَّتَينِ أَو ثَلاثـاً أو أَربَعـاً –حتـى عَـدّ سَبْعاً– مـا حَـدَّثتكموُ))[3] واتـە: (ئـەبو ئومامە هەندێك سەری چەقێنراوی لەسـەر پـێ پلیکەکانی مزگـەوتی دیمەشـق بەرچـاو کـەوت و فەرمووی: سەگەکانی ئاگرن خراپترین کوژراوان لە ژێـر پـەردەی ئاسماندانن، چاکترین کـوژراوان ئەوانـەن کـە ئەمانـە کوشـتویانن، ئینجـا ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە:

---

[1] اخرجه: اللالكانى (٧٤)، وقال السيوطى في: ((الدّر المنثور)) و (٢/٦٣): أخرجه ابن أبي حاتم وابـن نصـرو الخطيـب في تأريخه. وانظر: ((قاعدة في جمع كلمة المسلمين)): لشيخ الإسلام إبن تيمية (ص:١١) .

[2] ابن كثير في ((تفسير القران العظيم)) (١/٥٥٤) .

[3] اخرجه: أحمد (٥/٢٥٣) (٢٢٢٥٩) وقال محققه: ثابت موقوفاً. و عبـد الـرزاق (١٨٦٦٣)، و الطبراني في ((الكـبير)) (٨٠٣٣)، و الترمذي (٣٠٠٠) و قال حديث حسن، و حسنه العلامـة الشـيخ الألبـاني في ((صـحيح سـنن الترمـذي)) (٢٣٩٨)، و في ((المشكاة)) (٣٥٥٤) .

﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ (آل عمران: ١٠٦).

ئەبو غالب دەفەرموێت من بە ئەبو ئومامەم وت: ئایا ئەمەت لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بیستووە ؟ ئەبو ئومامە (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر نەم بیستایە جارێك یان دوو جار یان سێ جار یا چوار جار ........(هەتا حەوتی ژمارد) بۆم نەدەگێڕانەوە (واتە: ئەگەر حەوت جار ئەم وتەیەم نەبیستایە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆم نەدەگێڕانەوە)...... بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم وتەیەی تا حەوت جار دوو بارە کردۆتەوە بۆ ئەوەی موسوڵمان ئاگادار بکات لەو گوناه و ترسە گەورەیە کە خاوەن باوەڕ لە بازنەی ئیسلام دەردەکات و دەیخاتە ناو بازنەی کوفرەوە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت تا لە دواییدا کارەکانی پوچ دەبێتەوە و ڕووی ڕەش دەکرێت و کارەکانی وەك خۆڵەمێش پەرش و بڵاو دەبێتەوە لە کاتێکدا کە بایەکی زۆر بەهیز لێی دەدات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴾ (إبراهيم: ١٨).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا ڕوونی کردۆتەوە دیسان کە سەگەکانی ئاگر (کلاب اهل النار) تاقمەکانی (خەواریج)ن کە لە ئایین دەرچوون: ئەوانەی کە لە شەودا شەو نوێژیان دەکرد وە لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبوون و ئەوانەی کە موسوڵمانیان دەکوشت و بت پەرستیان واز لێ دەهێنا و ئەوانەی کە ئایەتەکانی خوایان دەخوێندەوە و لە قوڕ قوڕاگەیان بەرەو ژوورتر نەدەچوو،وە لە ئیسلام دەرچوون وەك چۆن تیر لە نیشانە و (نێچیر) دەردەچێت .

ئیبنو ئەبی ئەوفا (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((الخَوارِجُ كِلابُ النّار))[٤] واتە:(خەواریج سەگەکانی ئاگرن)، چۆن ئەو کۆمەڵانە ڕوویان ڕەش نابێت هەر ئەوان بوون کە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەریان (ﷺ) ڕوون دەکردەوە بە بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆیان و بە خەڵکانیان ڕادەگەیاند کە ئەو بۆ

---

[٤] أخرجه: الطبراني في ((الكبير)) (٨٠٤٢)،وابن أبي شيبة (٣٠٧/١٥)،وابن ماجة (١٧٣)،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٤٣)، و في ((المشكاة)) (٣٥٥٤)، و في ((الروض)) (٩٠٦)، و في ((الظلال)) (٩٠٤)

چوونانە ڕاستە و جگە لە خۆیان کەسی تریان بەڕاست نەدەزانی و دڵخۆش بوون بە جیاوازی و بە تاقم و کۆمەڵانەیان، ئەم ڕەفتارانەیان هەموو درۆکردن بوو بە ناوی خوا و پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴾ (الزمر: ٦٠)
واتە:﴿ لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینیت، ئەوانەی درۆیان بە ناوی خواوە دەكرد (شتی ناڕەوایان تێکەڵ بەدین دەکرد) ڕوخساریان ڕەش و تاریکە، ئایا شوێن و جێگەی ئەو خۆ بەزل زانانە دۆزەخ نی یە ؟!﴾.بۆیە ئیمامی مالیك (رحمه الله) دەفەرموێت:" ما آية في كتاب الله أشدّ على أهل الاهواء من هذه الاية: ﴿ يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾ (آل عمران: ١٠٦)"[٥] واتە: (هیچ ئایەتێك نیە سەختتر بێت لای تاقمە گومڕاکان وەك ئەم ئایەتە:﴿ يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ ..... ﴾)

ئیبن كثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: " يُخبرُ الله تعالى عَنْ يَوم القيامَةِ أنّهُ تَسوَّدُ فيهِ وُجُوهٌ و تبيضُ فيه وجوهٌ، تسود وجوه أهل الفرقة و الاختِلافِ، و تبيض وجُوهُ أهلِ السُنةِ و الجَماعة﴾[٦] واتە: (خوای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێت کە لە ڕۆژی دواییدا هەندێ لە ڕووەکان سپی دەبێت و هەندێکی تریان ڕەش دەبێت و ڕووی کۆمەڵێ جیاواز کار (تفرقـە) ڕەش دەبێت و ڕووی ئەهلی سوننە و جەماعەت سپی دەبێت ، ئەمانە هەمووی لە ڕێگەی بیدعەچێتیەوە گەیشتنە کوفر وەك ئیبنو تیمیە دەڵێت: ﴿البِدعُ بريدُ الكُفر﴾[٧] واتە: (بیدعە پۆستە و گەیەنەرە بۆ کوفر) ، کەواتە بە هۆی زیاد کردنیان لە ئاینی ئیسلام و بە گژاچونەوەی ڕێنمایی یەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەتایبەتی وە لادان لە قورئان و سوننەت بەگشتی وای لێکردن کە ڕوو ڕەش بن: وەك هاوەڵی پایەبەرز ئەبو ئومامە (رضي الله عنه) لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا جوان ئەم ڕاستی یە ڕوون دەکاتەوە .

---

[٥] أخرجه: الاصبهاني ((سير السلف))(١٠٤٥/٣)، وابو نعيم ((الحلية)) (٣٢٦/٦).
[٦] ابن كثير في ((تفسير القران العظيم)) (١٦٩/٥) .
[٧] ابن تيمية في ((مجموعة الرسائل و المسائل)) (٢٥٠/٤) .

لە ئەبو غالبەوە ئەبو ئومامە (ﷺ) فەرموویەتی: ((شر قتلى قتِلوا تحت أدِيم السَّماءِ، و خيرُ قَتيلٍ مَنْ قَتلوا، كِلابُ أهلِ النَّارِ، قَدْ كان هؤلاءِ مُسلِمينَ فصارَوا كُفّاراً، قُلتُ يا أبا أُمامَة: هذا شَيءٌ تَقُولُهُ ؟ قالَ: بَلْ سَمِعتُهُ مِنْ رَسولُ الله (ﷺ) ))[٨] واتە: (ئەمانە خراپترین کوژراوانن کە کوژرابن لە ژێر پەردەی ئاسماندا و چاکترین کوژراوانیش ئەوانەن کە ئەمانە کوشتوویانن، سەگەکانی ئەهلی دۆزەخن، ئەمانە موسوڵمان بوون و ئێستاش کافر بوون ئەبو غالب دەڵێ: منیش وتم: ئەی ئەبو ئومامە ئەمە قسەی خۆتە ؟ فەرمووی: بەڵکو بیستوومە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) .

ئیبنو کثیر (رحمه الله) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴾ (عبس: ٤٢) واتە: (ئەوانەی کە دڵیان کافر بووە و ڕەفتارەکانیشیان خراپ بووە) ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرۡهُمۡ يُضِلُّواْ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓاْ إِلَّا فَاجِرٗا كَفَّارٗا ﴾ (نوح: ٢٧) واتە:﴿ خوای گەورە لە سەر زمانی نوح (عليه السلام) دەفەرموێت: بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت هەموو بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەن و کەسیشیان لێ نابێت (لە نەوەی تازە) مەگەر خراپەکارو تاوانبار نەبێت﴾ .

لە فەرموودەیەکی (لاواز)دا هاتووە کە ناکرێت بە بەڵگە کە (ڕووسپی کردن و ڕوو ڕەش کردنی خەڵکان دوای وەرگرتنی نامەی کردەوەکانیان دەبێت)[٩] .

---

[٨] أخرجه: الحميدي (٩٠٨)، و الطبراني في ((الكبير)) (٨٠٣٦)، و ابن ماجة (١٧٦)، و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٤٦)، و في ((المشكاة)) (٣٥٥٤) .

[٩] أخرجه: الترمذي (٣١٣٦)، و الحاكم (٢/٢٤٢)، و ابن حبان (٧٣٤٩)، وضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف الجامع الصغير)) (٦٤٢٤) و في ((سلسلة الأحاديث الضعيفة)) (٤٨٢٧)، و قال الشيخ شعيب الأرناؤوط في تخريجه ل((صحيح ابن حبان)) (٧٣٤٩): إسناده ضعيف .

# تەرازووی کردەوەکان

دوای لێپرسینەوە و تکا کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ تکا کردنی تکاکاراندا و دوای بەخشینی نامەی کردەوەکان و ڕوو سپی کردن و ڕوو ڕەش کردن ئینجا باس دێتە سەر تەرازووی کردەوەکان وەك ئیمامی قرطبي (رحمه الله) دەفەرموێت: ((قالَ العُلَماءُ: إذا انْقَضَى الحِسابُ كانَ بَعدَهُ وَزنُ الأعمالِ لأن الوزن للجزاء، فينبغي أن يكون بعد المحاسبة، فإن المحاسبة لتقرير الأعمال، و الوزن لإظهار مقاديرها، ليكون الجزاء بحسبها))[1] واتە: (زانایان فەرموویانە ئەگەر لێ پرسینەوە کۆتایی پێ هات وتەرازوو کردنی کردەوەکان بە دواییدا دێت چونکە لێ پێچینەوە بۆ جێگیرکردنی کردەوەکانە وتەرازوو کردن بۆ پاداشت وەرگرتنەوە و بۆ ئاشکراکردنی ئەندازەکانیانە بۆ ئەوەی پاداشتەکان بەگوێرەی ئەندازەی کردەوەکانیان بێت).

باوەڕبوون بە تەرازووی کردەوەکان پێویستە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ..... ﴾ (الأعراف:٨)، باوەڕبوون بە تەرازوو کردنی کردەوەکان یەکێکە لە پایەکانی باوەڕبوون بە ڕۆژی کۆتایی، وەك ئیمامی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((الإيمان أن تؤمن بالله و ملائكته... و تؤمن بالجنة و النار و الميزان...))[2] واتە: (باوەڕ ئەوەیە کە باوەڕت هەبێت بە خواو بە مەلائیکەکان ... و باوەڕت هەبێت بە بەهەشت و دۆزەخ و میزان و تەرازووی کردەوەکان ...) .

زانای خوا ناس ئیبن ئەبو العز (ﷺ) لە باس کردنەکەیدا لەسەر عەقیدەی طحاوي دەفەرموێت: ((...والذي دَلَّت عليه السُّنَّة: إنَّ ميزان الأعمال له كفَّتان حسِّيتان مُشاهِدتان كما دلّت عليه حديث البِطاقة))[3] واتە: (... ئەوەی سوننەت بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە لەسەری ئەوەیە کە تەرازووی کردەوەکان دوو تای هەیە کە هەستی پێ دەکرێت و دەبینرێت وەك چۆن فەرموودەی مەشهور (البطاقة) ڕوونی کردۆتەوە ، بێگومان خوای گەورە

---

[1] أنظر: ((التذكرة في أحوال الموتى و الأمور الآخرة)) (ص: ٣٠٩)، وهو قول الإمام البيهقي ((شعب الإيمان)) (٢٥٧/١).

[2] أخرجه: البيهقي في ((الشعب)) (٢٧٨)، و صححه الشيخ الألباني ((صحيح الجامع)) (٢٧٩٨) .

[3] أنظر: ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٦٠٩/٢) .

هەموو کردەوەکانی ئینسان بچووك بێت یان گەورە تەرازووی دەکات بە دادپەروەرانە، و ستەم لە هیچ کەسێك ناکات و هیچ خراپە و چاکەیەك ون ناکات و پاداشت و سزای لەسەر دەداتەوە وەك دەفەرموێت: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾ (الأنبياء: ٤٧).

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پیاو کردەوەکانی دەخرێتە تاکانی تەرازووەکە دەقەکەشی ئەمەیە کە ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتیەوە: ((يوضع الموازين يوم القيامة فيؤتى بالرجل فيوضع في كَفَّةٍ فيُوضع ما أُحصِي عليه، فتَمايلُ بهِ الميزانُ، قال فيُبعَثُ بهِ إلى النّار فإذا أدبَر بهِ إذا صائحٌ يصيح مِن عند الرحمن يقول: لا تعجلوا لا تعجلوا فإنَّه قد بَقِي له فيؤتى ببطاقة فيها لا اله الا الله، فتوضع مع الرجل في كفة حتى يميل بهِ المِيزانُ))[٤] .

واتە: (تەرازوو دادەنرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا پیاوێك دەهێنن دەیخەنە تایەکی تەرازووەکەوە و کردەوەکانیشی کە لە سەری ژمێردراوە دەخرێتە تاکەی تریەوە ئینجا کردەوە خراپەکانی قورستر دەبێت و دەنێردرێت بۆ دۆزەخ ، کە کاتێ پشتی پێ هەڵدەکرێت و دەبرێت بەرەو دۆزەخ بانگ کارێك لەلایەن خواوە بانگ دەکات و دەڵێت: پەلە مەکەن، پەلەمەکەن چونکە ئەوەشتی تری ماوە ئینجا بیطاقەیەك دێنن کە (لا الـه الا الله)ی تێدا لەگەڵ پیاوەکەدا دەخرێتە تای تەرازوەکەیەوە هەتاوەکو قورستر دەبێت لە کردەوەکانی پیاوەکە).

هەروەها فەرموودەکەی ئیبن مەسعود لای ئیمام ئەحمەد و فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە لای بوخاری شایەتی بۆ ئەمە ئەدەن و هەموویان فەرموودەی (صحیحن)، وە لە فەرموودەی (صحیح)ی تر دا هاتووە کە کردەوە چاکەکان و خراپەکانی مرۆڤ دەکرێتە ناو هەردوو تای تەرازووەکەوە، وەك فەرموودەی (بطاقة) وکێشی کردەوەکان ڕوونی کردووەتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((و الحمد لله تملأ الميزان))[٥] واتە: (ستایش کردنی خوا تەرازوو پڕ دەکات).

---

[٤] اخرجه: الإمام أحمد (٢/٢٢١)،(٧٠٦١) وقال محققه: اسناده حسن.

[٥] اخرجه: احمد (٥/٣٤٢)، ومسلم (٥٣٣)، والنسائي (٢٤٣٦)، والترمذي (٣٥١٧)، ابن ماجة (٢٨٠)، وابن حبان (٨٤٤)، وصححه الشيخ الالباني في: ((صحيح النسائي)) (٢٢٨٦)، و ((صحيح ابن ماجة)) (٢٢٦)، و ((صحيح الجامع)) (٩٢٥) .

زانای پایەبەرز (السفارینی) دەفەرموێت: ((و الحق إن الموزون صحف الأعمال و صححه ابن عبد البر و غيرهما، و صوبه الشيخ مرعي في بهجته و ذهب اليه جمهورٌ من المفسرين))[٦] واتە: (لە ڕاستیدا ئەوەی دەکێشرێت نامەی کردەوەکانە و ئەمەش ابن عبدالبر القرطبی بەڕاستی خستۆتەوە هەروەها شێخ (المرعی) لەکتێبی (البهجة)دا و ئەمەش وتەی کۆمەڵێکی زۆر لە (مفسر)ە کانە .

لێرەدا شتێکی گرنگ ماوە ئەویش ئەوەیە ئایا: تەرازووەکان یەك تەرازووە یاخود چەندین تەرازوون؟

زانا ئیبن ئەبی العز (رحمه الله) دەفەرموێت: ((و قوله تعالى (و نضع الموازين القسط) يحتمل أن يكون ثَمَ موازين متعددة توزن فيها الأعمال و يحتمل أن يكون المرادُ الموزُونات، فجُمِعَ باعتبار تَنُوع الأعمال المُوزنة، و الله أعلم))[٧] واتە:(خوای گەورە دەفەرموێت: (ونضع موازين القسط) ئەوە هەڵدەگرێت کە چەندین تەرازووی جۆراوجۆر هەبێت کە کردەوەکانی پێ دەکێشرێت، ئەوەش هەڵدەگرێت کە مەبەستی جۆری کردەوەکان بێت نەك جۆراوجۆری تەرازووەکان، خوا زاناترە)، شێخ السفارینی (رحمه الله) دەفەرموێت: ((اختلف في الميزان هل هو واحد أو أكثر فالأشهر انّه ميزانٌ واحد لجميع الأمم و لجميع الأعمال كفّتاه كأطباق السماوات و الأرض))[٨] واتە: (مەشهور وایە کە تەرازووی کردەوەکان یەك تەرازووە بۆ سەرجەم ئومەتەکان و بۆ سەرجەم کردەوەکان و دوو تایەکەیشی بە ئەندازەی زەوی وئاسمانەکانن)، بەڕاستی قسەکەی شێخ سفارینی (راجح)ە و بەڵگەی فەرموودەی صەحیحی لەسەرە، سەلمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يُوضَعُ الميزان يوم القيامة فلو وزن فيه السماوات و الأرض لوسعت، فتقول الملائكة: يا رَبُّ لِمن يزن هذا ؟ فيقول الله تعالى: لمن شئت من خلقي، فتقول الملائكة: سبحانك ما عبدناك حق عبادتك))[٩] واتە: (تەرازوو دادەنرێت لەڕۆژی کۆتاییدا ئەگەر ئاسمانەکان و

---

[٦] أنظر: ((اللوامع)) (١٨٧/٢) .

[٧] أنظر: ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٦٠٩/٢) .

[٨] أنظر: ((اللوامع)) (١٨٦/٢) .

[٩] أخرجه: الحاكم (٥٨٦/٤) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة))(٩٤١).

زەوی تیا بکێشرێت جێگایان تیا دەبێتەوە، مەلائیکەتەکان دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئەمە بۆ کێشانی کێ یە (واتە: کێ دەتوانێ ئەوەندە کردەوەی چاکی هەبێت کە ئەم تەرازووەی پێ پڕ بکاتەوە) خوای گەورەش دەفەرموێت: بۆ ئەوانەیە کە خۆم دەمەوێت لە دروست کراوانم، مەلائیکەکان دەڵێن: پاکی بۆ تۆیە ئێمە نەمان پەرستوویت بەپەرستنێك کە تەواو شایستەی تۆ بێت) .

دوای دانانی کردەوەکان لە دووتای تەرازووەکەدا سەنگی کردەوەی خاوەن باوەڕ قورس دەبێت بە کردەوە چاکەکانی،وە سوك دەبێت بە کردەوە خراپەکانی تاوانبار، وەهەر کەسێك تای تەرازووەکەی قورس بێت ئەوە سەرفراز دەبێت وەهەر کەسێك تای تەرازووەکەی سوك بێت ئەوە ڕەوانەی جەهەنم دەکرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَـٰلِدُونَ ﴾ (المؤمنون: ١٠٢ - ١٠٣).

و لەلای تەرازووەکەدا خەڵکان دەمە قاڵەیەکی توندیان دەبێت وەك ئیبنو مەسعود(ﷺ): ((يُجاء بالنّاسِ يوم القيامة الى المِيزان فيُجادِلُون عنده أشَدَ الجدال))[١٠] واتە: (خەڵکان لە ڕۆژی کۆتاییدا دەهێنرێن بۆلای تەرازووەکە و لەوێشدا دەمە قاڵەیان دەبێت بە توندترین جۆری دەمەقاڵە).

---

[١٠] أخرجه: ابن أبي شيبة ((المصنف)) (١٧٨/١٣) (٣٥٣٣٦) وقال محققه: اسناده حسن، و عبد الله بن أحمد في ((كتاب السنة)) (١٠٧٧) و قال محققه إسناده حسن، و الدينوري ((المجالسه)) برقم (١٠) و قال محققه إسناده صحيح .

# هەندێ لەو کردەوانەکە تەرازووی موسوڵمانی پێ قورس دەبێت لە ڕۆژی کۆتاییدا

**١- ووشەی یەکخوا پەرستی کە (لا اله الا الله) یە:-**

عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: ((إن الله سَيُخَلّصُ رَجُلاَ من أمتي على رؤوس الخلائِق يوم القيامة فَيُنشَرُ عليه تسعةً و تسعين سِجلاً (أي: الكتاب الكبير)،كُلُّ سجلٍ مَد البَصِر، ثم يَقُولُ (الله عز وجل) لَـه: أتُنكِـرُ مـن هـذا شيئاً؟ (اظْلَمَكَ كَتَبتي الحافِظُون)؟ فيقول: لا ياربِّ، فيقول: بلى إن لك عندنا حسنة (واحدة) فإنه لا ظلم عليك اليوم، فيخرج له بطاقة فيها: أشهد أن لا إله إلا الله و أن محمداً رسول الله، فيقول: في رواية: (احضروه) احضر وزنك، فيقول: يا رب ما هذه البطاقة مع هذه السجلات ؟ فيقولُ: انكَ لا تُظلم، قال: فَتُوضَعُ السَّجلاتُ في كفّةٍ و البطاقة في كفـة، قـال: فطاشَـتِ السـجلات و ثقلت البِطاقَةُ، فلا يثقل مع اِسم الله شيء))[١١] واتە: (خوای گەورە پیاوێك لە ئومەتەکەم ڕزگار دەکات لە پێش چاوی دروستکراوان لە ڕۆژی کۆتاییدا نەوەد و نۆ پەرتوکی گەورەی بۆ دەکاتەوە هەموو پەرتوکێ مەودای چاو بینینێك دەبێت (واتە: هەتا دوورترین شوێن کە چاو بیبینێت)، ئینجا خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا نکوڵی لە هیچ شتێ لە مانە دەکەیت؟ (ئایا مەلائیکەی نووسەری کردەوەکان ستەمیان لێ کردوویت؟) دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەدگار، خوای گەورە دەفەرموێت:ئایا هیچ پاساوێکت هەیە یاخود هیچ چاکەیەکت هەیە ؟ پیاوەکە لە زمان دەکەوێت و دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگار، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بەڵێ تۆ لای ئێمە یەك چاکەت هەیە ئەمڕۆ ستەمت لێ ناکرێت، بیتاقەیەکی بۆ دەردەکات کە تیایدایە (اشهد ان لا الـه الا الله و ان محمدا رسول الله) دەفەرموێت: (ئامادەی بکەن) و تۆش ئامادەی کێشەکانت ببە، ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار دەبێت ئەم پارچە وەرەقەیە چی بێت بەرانبەر ئەو

[١١] هذا ((الحديث)) مشهور بحديث البطاقة أخرجه: أحمد (٢/٢١٣)، و الترمذي (٢٦٣٩) و قال حديث حسن غريب، و ابن ماجة (٤٣٦٩)، و ابن حبان (٢٢٥): إسناده صحيح، و صححه الشيخ الالباني في ((السلسلة الأحاديث الصحيحة)) (١٣٥)،و ((المشكاة)) (٥٥٥٩)، و((صحيح الجامع)) (١٧٧٦)، و قال الشيخ شعيب الأرناؤوط في تخريجه لـ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٢/٦١٠): إسناده صحيح، و في ((جامع الأصول)) (٧٩٨١): إسناده صحيح.

پەرتوکـە گەورانـە ؟ خـوای گـەورە دەفـەرموێت: تـۆ ئـەمڕۆ سـتەمت لێ ناکرێـت، دەفـەرموێت: (واتـە پێغەمبـەر): دواتـر پەرتووکـە گـەورەکان دەکرێنـە تایـەکی تەرازووەکـەوە و پارچـە وەرەقەکـەش دەکرێتـە تاکـەی تـرەوە، دەفـەرموێت: ئینجـا پەرتووکە گەورەکان بـە ئاسماندا دەبات و پارچە وەرەقەکەش قورس دەبێت و هیچ شتێك قورس نابێت بەرامبەر ناوی خوا) .

بەڵێ ئەی ئیماندار چۆن (لا اله الا الله) تەرازوو قورس ناکات؟ بەڵێ قورسی دەکات چونکە ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی بکرێتـە تایەکیـەوە (لا الـه الا الله)ش بکرێتـە تاکەی دیکەیەوە (لا اله الا الله) لە هەموویان قورس تر دەبێت .

لە فەرموودەیـەکی (ضعیف) دا هـاتووە ئـەبو سـەعیدی خـودری (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: ((... قـال (الله تعـالى): يـا موسـى لـو أنَّ أهـلَ السماواتِ السَبعِ و الأرضين السبع في كفَّةٍ، ولا إلـه إلا الله في كفـة مالـت بهـم لا إلـه إلا الله))[١٢] واتـە: (خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ئـەی موسا گـەر نیشتـەجێی هـەر حـەوت ئاسمان و هـەر حەوت زەویەکان لە تایەکدا بن و (لا الـه الا الله) لـە تاکـەی دیکـەدا بێـت تـای (لا الـه الا الله) قورس تر دەبێت).

عەبـدوڵای کـوڕی عـەمر (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویـەتی: (( إن نبـي الله نوحـاً (عليه السلام) لمّـا حضَـرته الوَفـاةُ قـال لأبنِـه: إنّـي قـاصٌ عليـك الوَصّيَة.... آمُركَ بلا إله إلا الله، فإن السماوات السبع و الأرضين السَبع لو وضِـعَت في كفَّـةٍ، و وضعِت لا اله إلا الله في كفّة رَجَحَت بهنَّ لا إلـه إلا الله، ولـو أنَّ السـمّاوات السَـبعُ و الأرضِـين السَبع كُنَّ حَلقَةً مُبهَمَةً قصمتهن لا اله إلا الله ...))[١٣]. واتە: (نـوح پێغەمبـەری خـوا (عليه السلام) پێش ئەوەی وەفات بکات بە کوڕەکەی فەرموو: من وەسێتەکەت بۆ دەگێڕمـەوە .......

---

[١٢] أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (١٤٨١)، و أبو يعلى (١٣٩٣)، و قال ابن حجر الهيثمي ((المجمـع)) (٨٢/١٠) رواه أبـو يعلى و رجاله و ثقوا و فيهم ضعف، و الحاكم (٥٢٨/١) و صححه و وافقه الذهبـي، و صـححه الحـافظ في ((الفـتح)) (٢٠٨/١١) و قال: إسناده صحيح، و صـححه أيضـاً ابـن حبـان في ((صـحيحه)) (٦٢١٨)، و صـححه ابـن كـثير في ((البداية) (١١٢/١)، وضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف الترغيب)) (٩٢٣) . وأردناه للعلم فقط.

[١٣] أخرجه: البخاري ((الأدب المفرد)) (٥٤٨)، وأحمد (١٦٩/٢)، و قال الحافظ العراقي في تخريجه على الأحياء (٣٠٠/١) أخرجه أحمد بإسناد صحيح، و قال الهيثمي ((المجمع)) (٢٠/٤): رجال أحمد ثقات، و صححه الشيخ الألباني في ((صـحيح الأدب المفرد)) (٤٢٦)، و ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٤) .

و فەرمانت پێ دەکەم بە (لا اله الا الله) چونکە هەر حەوت ئاسمان و هەر حەوت زەوی یەکە ئەگەر بکرێتە تایەکی یەوە و (لا اله الا الله)ش بکرێتە تاکەی تر ئەوا (لا اله الا الله) قورستر دەبێت لە هەموویان و ئەگەر هەر حەوت ئاسمان و هەر حەوت زەوی کە ئەڵقەیکی داخراوبن (لا اله الا الله) تێکیان دەشکێنێت) ، لەبەر ئەمەش بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناڕازی بوو لە ئوسامەی کوڕی زەید کاتێك کە ئەو بێ باوەڕەی کوشت کە هەڵ هاتبوو لە شەڕەکەدا و بە دوایدا ڕای کردوو کە پێ‌ی گەیشت وتی (لا اله الا الله) و ئوسامەش کوشتی، ئەوە بوو کە ئەمەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بە ئوسامەی فەرموو (ﷺ): ((من لك بلا إله إلا الله يوم القيامة))[١٤] واتە: (کێ هەیە بتپارێزێت لە (لا اله الا الله) لە ڕۆژی کۆتاییدا).

لە ڕیوایەتی موسلیم دا هاتووە: ((كيف بلا إله إلا الله إذا جاءت يوم القيامة (ثلاثاً)...))[١٥] واتە: (چی دەکەیت بەرامبەر بە (لا اله الا الله) ئەگەر ڕۆژی کۆتایی هات (سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە)).

### ٢- خوڕەوشتی جوان:

ئەبو دەرداء (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إن أثقل (شيء) وُضِعَ في ميزان المؤمن يوم القيامة: خلق حَسنٌ...))[١٦] واتە: (قورسترین شتێك کرابێتە ناو تەرازووی باوەڕدار لە ڕۆژی کۆتاییدا: خوڕەوشتی جوانە ....).

### ٣- یادکردنی خوای گەورە (تبارك و تعالى):

ا-بەتایبەت یادی (سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم):

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((كلمات خفيفتان على اللسان ثقيلتان في الميزان، حبيبتان عند الرحمن: سبحان الله و بحمده سبحان الله

---

[١٤] أخرجه: أبو داود (٢٦٤٣)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح أبي داود)) (٢٣٠٢) .

[١٥] أخرجه: مسلم (١٥٩) .

[١٦] أخرجه: أحمد (٦/٤٤٢)، و أبو داود (٤٧٩٩)، و الترمذي (٢٠٠٣) و قال حديث حسن صحيح، و ابن حبان (٥٦٩٣) و قال الأرناؤوط في تخريجه: حديث صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (٥٠٨١) و ((الصحيحة)) (٨٧٦) و((صحيح ابي داود)) (٤٠١٤).

العظـــیم))[١٧] واتــە: (دوو وشــە هــەن ئاســانن لەســەر زمــان قورســن لــە تــەرازوودا، خۆشەویستن لای خوا: (سبحان الله وبحمده سبحان الله العظیم)) .

ب- (سبحان الله والحمد لله):

ئــەبو مــالیکی ئەشــعەری (رضي الله عنه) دەگێڕێتــەوە لــە پێغەمبــەری خــواوە (ﷺ) کــە فەرموویــەتی: ((الطهور شطر الایمان ...و الحمد لله تملأ المیزان و سبحان الله و الحمـد لله تمـلان أو تمــلأ مــا بــین الســماء و الأرض))[١٨] واتــە: (دەســت نوێــژ نیوەی بــاوەڕە (والحمــد لله) تەرازوو پڕ دەکات و (سبحان الله والحمد لله) تەواو پڕی دەکات یاخود نێوان ئاسمان و زەوی پڕ دەکات).

ج- وتنـی:(سـبحان الله، الحمـد لله، الله اکـبر) (١٠) دوای نوێژە فەرزەکان و (١٠٠) جار پێش نوستن:

عەبدوڵای کوڕی عەمر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: ((خَصلَتان (لا یَحافُظَ علیهما) رجلٌ مسلم إلاّ دخَلِ الجَنة، ألا وهما یسیرٌ و مَن یَعمَلُ بهمـا قلیـلٌ، یُسَبّحُ الله في دُبر کلّ صلاةٍ عشراً و یَحمَدُه عشراً و یُکبّرهُ عشراً ... فتِلكَ خَمسُـونَ و مائـةُ باللّسان، و ألفٌ و خمسمائةٍ في المیزانِ، و إذا أخذت مضجعك تُسّبحُه و تُکبّره و تَحمُـده مائـة، فتلــكَ مائــةٌ باللّســـانِ و ألـــفٌ في المیـــزان...))[١٩] واتــە: (دوو شــت هــەن موســوڵمان پارێزگارییان بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە ئەو دوو شتە ئاسانن و ئەوانەی کاری پــێ دەکــەن کــەمن: (سـبحان الله) بڵێـت لـەدوای هـەموو نوێژێکـەوە دەجـار (الحمـد لله) بڵێت و دە جار وە(الله اکبر) بڵێت دەجار...... ئـەوا سەدو پەنجایە بەزمان و هـەزار و پێنج سەدە لـە تـەرازوودا وە هـەر کاتێك چووە سەر جێگا بۆ نوستن: (سـبحان الله، الحمد لله، الله اکبر) سەد جار بڵێت ئەوا صەدە بەزمان و هەزارە بە تەرازوو ...).

---

[١٧] أخرجه: البخاري (٧٥٦٣)، و مسلم (٢٦٩٤) .

[١٨] أخرجه: أحمد (٣٤٢/٥)، و مسلم (٥٢٣) .

[١٩] أخرجه: أحمد (١٨٤/٥)، و الدارمي (٣١٢/١)، و النسـائي (٧٦/٣)، و الترمذي (٣٤١٠) و قال حديث حسـن صحيح، و ابن ماجة (٩٢٦)، و صححه الشيخ الألباني في ((صـحيح الترمذي)) (٢٧١٤)، و ((صـحيح ابـن ماجـة)) (٧٥٤)، و((المشكاة)) (٢٤٠٦) .

د- وتنی (سبحان الله، الحمد لله، لا اله الا الله، الله اكبر):

ئەبو سەلەمە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((بَخٍ، بَخٍ – و أشار بيدِه بخمسٍ – ما أثقَلهُن في الميزانِ، سبحان الله و الحمد لله و لا اله إلا الله و الله أكبر...))[٢٠] واتە: ((بەخ بەخ)) و دەستی ڕاکێشا بۆ لای پەنجەکانی و فەرمووی: ((چەند قورسن لە تەرازوودا: (سبحان الله، الحمد لله، لا اله الا الله، الله اكبر)).

ه- وتنی: ((سبحان الله و بحمده عدد خلقه ورضاء نفسه وزِنةَ عرشه و مداد كلماته)):

ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە (جوەیریە)ی خێزانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: أنَّ النبي (ﷺ) خرج من عندها بُكرةً حين صلّى الصُبحَ، و هي في مَسجِدها، ثُمَّ رجع بَعد أن أضحَى، وهي جالِسةٌ فيه، فقال: مازلتِ اليومِ على الحالِ التي فارقتك عليها ؟ قالت: نعم، فقال النبي (ﷺ): لقد قُلتُ بَعدَكَ أربعَ كلمات ثلاث مرّات لو وزنتِ بما قُلتِ مُنذ اليوم لوزَنَتهنَ: سبحان الله و بحمده عدد خلقه و رضا نفسه وزنة عرشه و مداد كلماته))[٢١] واتە: (پێغەمبەر (ﷺ) چووە دەرەوە لە لای جوەیری بۆ کاتی نوێژی بەیانی، و جوەیرییە هەر لە شوێنی نوێژکردنەکەیدا بووە، ئینجا چێشتەنگاو گەڕایەوە هێشتا هەر جوەیرییە لە شوێنی نوێژکردنەکەی خۆیدا بووە پێی فەرموو: ((ئەمڕۆ بەردەوام لە سەر ئەو شێوەیە بوویت کە بەجێم هێشتیت تیایدا)) ؟ ئەویش وتی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لە دوای تۆ چوار وشەم وتووە سێ جار ئەگەر بکێشرێت بەوەی کە تۆ وتووتە لە ئەمڕۆدا (واتە: ئەو یادانە کە کردوویەتی هەر لە دوای نوێژی بەیانی یەوە هەتا کاتی چێشتەنگاو) ئەوا یەکسان دەبێ:چوار وشەکەش ئەمەیە (سبحان الله وبحمده عدد خلقه ورضاء نفسه وزنة عرشه و مداد كلماته) .

هەروەها ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من دخل السوق فقال: لا اله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك و له الحمد، يحيي و يميت وهو حيٌّ لا يَمُوت، بيدِه الخَيرُ، وهو على كلّ شيءٍ قدير، كَتَبُ اللهُ لَهُ ألفَ ألفَ حسنةٍ، و مَحا عَنهُ ألفَ

---

[٢٠] أخرجه: الطبراني (٢٢/ ٣٤٨)، و الحاكم (٥١١/١) وصححه و وافقه الذهبي ، و ابن حبان (٩٣٣): و قال المحقق: إسناده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٢٠٤) .

[٢١] أخرجه: أحمد (٣٢٥/٦)، و مسلم (٢٧٢٦)، و الترمذي (٣٥٥٥)، و ابن ماجة (٣٨٠٨) .

ألفَ سيئة، و رُفِعَ لَهُ ألفَ ألـفَ درَجـةٍ و بَنـى لَـهُ بَيتـا في الجنــة))[٢٢] واتـه: (هـەر كـەس بچێتـه بازاڕەوه و بڵێت: (لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحي و يميت وهو حـي لا يموت بيده الخير وهو علـى كـل شـيء قـدير)، ئـەوا خـوای گـەوره هـەزار چاکـەی بـۆ دەنووسێت و هەزار هەزار خراپەی بۆ دەسڕێتەوه و هەزار هەزار پله بـەرزی دەکاتـەوه و خانوویەکی بۆ دەکرێتەوه له بەهەشتدا .

**٤- مردنی کوڕی چاکی کەسێکی خاوەن باوەڕ:**

ئەبو سەلەمە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوه له پێغەمبەری خواوه(ﷺ) که فەرموویەتی: ((بَـخٍ، بَـخٍ – و أشَار بيدِهِ لِخَمسٍ– ما أثقَلهُنَّ في الميزان: سـبحان الله و الحمـد لله و لا الـه إلا الله و الله أكـبر، و الوَلَـد الصـالِحُ يُتَـوَّفى للمَـرءِ المُسـلِم فَيَحتَسِـبُهُ))[٢٣] واتـه: ((بـەخ بـەخ)) و ئیشـارەتی کـرد بـۆ پێـنج پەنجەی، ((چەند قورسن لـه تـەرازوودا: سبحان الله، الحمـد لله، لا الـه الا الله، الله اکـبر، وه کوڕی چاك بۆ موسوڵمانێك که دەمرێت و چاوەڕێی پاداشتەکەی دەکات لای خوا)).

خـاوەن بـاوەڕ لەسـەر هـەموو شـتێك پاداشـتی دەدرێتـەوه لـه کردەوەکانیـدا هـەتا دڕکێکیش بچێت به پێیدا بەڵکو هەتا لەسـەر نـان خواردن و خواردنـەوه و نوستنیش، بەڵکو هەتا لەسەر تێری ئەو ئەسپەش که ئامادەی کـردووه بـۆ جیهـاد کـردن لـه پێنـاو خـوادا، ئـەبو هـوڕەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتـەوه لـه پێغەمبـەری خـواوه (ﷺ) کـه فەرموویـەتی: ((من اِحتَبَسَ فرَسَاًفي سَبيلِ الله، إيماناً بالله، و تصديقاً لموعده، كان شبعه و روثه حسنات في ميزانـه يوم القيامـة))[٢٤] واتـه: (هـەر کەسـێك ئەسـپێك ڕابگرێـت بـۆ جیهـاد لـه ڕێـی خـوادا لەبـەر بـاوەڕبوونی بـه خـوا و بەڕاسـت خسـتنەوەی پاداشـتەکانی ئـەوا تێـر ئـاڵف و ئـاو وخواردن و سەنێرەکەشی بەچاکە کردن دەژمێررێت له تەرازووی ئەو کەسەدا له ڕۆژی کۆتاییدا).

---

[٢٢] أخرجه: الترمذي (٢٩١/٥) رقم (٣٤٢٨) و قال حديث غريب، و الحـاكم (٥٣٨/١) و سـكت عنـه، و ابـن السـني (١٧٨)، وحسنّه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٥٢/٣) (٢٧٤٦)، و ((صـحيح ابـن ماجـة)) (٢١/٢) (١٨١٧)، و((الكلم الطيب)) (٢٢٩) .

[٢٣] أخرجه: أحمد (١٥١٦٢) و قال محققه: حديث صحيح، والنسائي ((الكبرى)) (٩٩٩٥)، والحاكم (٥١١/١) وصححه و وافقه، و ابن حبان (٩٣٣) وقال محققه: إسناده صحيح، وقال: الشيخ الألبـاني في ((سلسـلة الأحاديـث الصـحيحة)) (١٠٢٤): إسناده صحيح .

[٢٤] أخرجه: أحمد (٣٧٩/٢) (٢٣٢٣٠) وقال محققه: اسناده صحيح، و البخاري (٢٨٥٣) .

**ئادەمیزاد تەرازووی چاکەی بە کارە چاکەکانی قورس دەبێت نەك بە قەبارە و کێشی کاری خراپی، هەندێ لەو خراپ کارە زەبەلاحانە لای خوای گەورە قورس نابن بە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەك، وەك ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((إنه ليأتي الرّجلُ العَظيمُ السَّمِين يوم القيامةِ لا يزِنُ عند الله جَناح بعوضة —و قال– اقرؤوا إن شئتم﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا ﴾ (الكهف: ١٠٥)))[٢٥] **واتە: (پیاوی گەورەی قەڵەوی وا هەیە لە ڕۆژی کۆتاییدا دێت و کێشەکەی لای خوای گەورە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەك نابێت . بخوێننەوە ئەو ئایەتە ئەگەر ویستتان لێ یە ﴿** فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا **﴾) .چونکە لە ڕاستیدا تەرازووەکان بە دەست خوای گەورەیە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:** ((ان الميزان (رواية الموازين) بيد الرحمن يرفع قوماً و يخفض آخرين))[٢٦] **واتە: (تەرازووەکان بەدەست خوای گەورە یە کەسانێك بەرزدەکاتەوە و کەسانێکیش نزم دەکاتەوە) .**

**هەروەها ئەگەر ئادەمیزادی موسوڵمان لەڕ و لاواز و قاچ باریکیش بێت لە دونیادا ئەوا لای خوای گەورە کێشێکی یەکجار قورسی دەبێت . وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە** ((انه كان يجتني لرسول الله (ﷺ) سواكاً من أراك و كان دقيق الساقين، فجعلتِ الرِّيحُ تَكفَؤه، فضحِكَ القَوْم منِه، فقال رسول الله (ﷺ): مِمَ تضحكون؟! قالوا: يا نبي الله مِن دِقة ساقيه، فقال: في رواية ابن حبان: (( ما يُضحِككم مِن دقة ساقية، و الذي نفسي بيده لَرجُل عبد الِله اثقلُ في الميزان من أحد))[٢٧]. **واتە: (کاتێ کە عەبدولای کوڕی مەسعود چووەتە سەر دارێکی ئاراك بۆ**

---

[٢٥] أخرجه: البخاري (٤٧٢٩)، و مسلم (٢٧٨٥) .

[٢٦] اخرجه: ابن ابي عاصم ((السنة)) (٧٩٦)وقال محققه: حديث صحيح، ابن ماجة (٩٩)، احمد (١٨٢/٤)، والطبري (٦٥٥٧)، والنسائي ((الكبرى)) (٧٧٣٨)، و ابن حبان (٩٤٣) .

[٢٧] أخرجه: ابن سعد (١٥٥/٣)، و أبي نعيم ((الحلية)) (١٢٧/١)، و ابو يعلى (٥٣١٠)، و الطيالسي (٣٥٥)، و أحمد ((المسند)) (٤٢١/١)، و أحمد ((الفضائل)) (١٥٥٢)، والبخاري ((الأدب المفرد)) (٢٧٣)، والبزار (٢٦٧٨)، والطبراني (٨٤٥٢)، و ابن حبان (٧٠٦٩) و قال محققه: إسناده حسن، و الحاكم (٣١٧/٣) وصححه و وافقه، وقال ابن كثير ((النهاية)) (٢٩/٢): تفرد به أحمد بإسناد جيد قوي، و قال الحافظ ((الإصابة)) (٣٧٠/٢) (٤٩٥٤): أخرجه أحمد بإسناد حسن، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (١٧٦) ، و((ارواء الغليل)) (٦٥)، و((السلسلة الصحيحة)) (٢٧٥٠)، و ((الطحاوية)) (ص: ٢٦٧)، و ((غاية المرام)) (٤١٦)، و قال محقق كتاب ((فضائل الصحابة)) أحمد (١٥٥٢): إسناده حسن .

ئەوەی سیواکێك ببڕێت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و کەسێکی قاچ باریك بوو لەسەر دارەکە بایەك هەڵی کرد و وەخت بوو بەملا و بە ولادا بیخاتە خوارەوە و هاوەڵانی پێغەمبەریش پێکەنینیان پێی هات و پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: ((بەچی پێ دەکەنن)) ؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پێکەنینمان دێت بە باریکی هەردوو قاچی، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: (پێکەنینتان بە چی دێت ؟ ئایا بە هەردوو قاچە باریکەکەی ؟ سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە،تەنها قاچێکی عەبدولاّ قورس ترە لە تەرازوودا لە کێوی ئوحود) سەبارەت بەم باسە ئیمامی عەلی (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((من كان ظاهره أرجح من باطنه خفَّ ميزانه يوم القيامة، ومن كان باطنه أرجح من ظاهره ثقل ميزانه يوم القيامة))[٢٨].واتە: (هەر کەس ڕووکەشی باشتر بێت لە ناوەڕۆکی تەرازووی سوك دەبێت لە ڕۆژی کۆتاییدا، وە هەرکەسێك ناوەڕۆکی باشتربێت لە ڕووکەشی تەرازووی کردەوەکانی قورس دەبێت لە ڕۆژی کۆتاییدا).

پێویستە لەسەر ئادەمیزادی ژیر کە تێبکۆشێت بۆ ئەوەی تەرازووەکەی قورس بکات بە کاری چاکە، و دووره پەرێزی بکات لەو تاوانانەی کە سەرجەم کردەوەکانی پووچ دەکاتەوە و هیچ کێشێك بۆ کارەکانی دانانێت و لەو تاوانانەش بە تایبەت ئەنجام دانی ئەو شتانە کە حەرام و قەدەغە کراون دوور لە چاوی خەڵکان، واتە بە پەنامەکی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لأعلَمَن أقواماً مِن أُمتي يأتُون يَوم ألقيامة بحسنات أمثَال جِبال تُهامَة بيضاً، فَيَجعَلها الله عز وجل هَباءً منثوراً قال ثوبان: يا رسول الله صِفهم لَنا، جَلِّهمْ لناً، ان لاتكون منهم ونَحن لا نعلمُ قال: اما إنهم إخوانكم و من جلِدتِكم " و يأخذون من اللّيلِ كما تأخذونَ و لكِنّهُم أقوامٌ، إذا خَلوا بِمحارِمِ الله، انتهكُوهَا))[٢٩]واتە: (کەسانێك لە ئومەتەکەم دەزانم کە دێن لە ڕۆژی کۆتاییدا و چاکەکانیان بە نموونەی چیاکانی توهامە گەورە و سپین خوای گەورەش دەیکات بە تۆزی با بردوو، ثوبان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمان وەصف کە و بۆمان ڕوون بکەرەوە نەوەك ئێمەش لەوان بین وبە خۆمان نەزانین، فەرمووی: ((بەلاّم ئەوانە براتانن وە لە ئێوەن و ئەو

---

[٢٨] أخرجه: ابن أبي الدنيا ((كتاب الاخلاص)) (رقم: ٢٣).

[٢٩] أخرجه: ابن ماجة (٤٢٤٥)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٢٣)، و((السلسلة الصحيحة)) (٥٠٥)، و ((صحيح الجامع)) (٥٠٢٨) .

شەونوێژانەی ئێوە دەیکەن ئەوانیش دەیکەن، بەلأم ئەوانە کۆمەلأنێکن ئەگەر شتە حەرامەکانیان بۆ ڕێك کەوت بە پەنا مەکی ئەنجامی دەدەن و خۆیانی لێ ناپارێزن)) .

هەروەها پێویستە باش بزانین کە ئێمە گەر چی هەر کارێکی چاکە ئەنجام بدەین بۆ ئەوەی تەرازووی کارەکانمانی پێ قورس بکەین ئێمە ناتوانین ئەوە ئەنجام بدەین تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە میهرەبانی خۆی بڕژێنێت بە سەرماندا وکارەکانمانی پێ قورس بکات کەواتە زۆر پێویستە بپارێینەوە لە خوای گەورە کە تەرازووی کارەکانمان قورس بکات لە ڕۆژی کۆتاییدا، ئەو پاڕانەوەیەشمان بەو پاڕانەوەیە بێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردوویەتی، زوهەیری ئەنصاری(ﷺ) دەفەرموێت کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەچووە سەر جێگە نوستنەکەی دەیفەرموو: ((بسم الله وضعْت جنبِي، اللّهم اغفِرلي ذنبي، و أخسِئ شيطاني، و فُك رِهَاني، و ثقِّل ميزاني، و اجعلني في النّدِي الأعلى))[٣٠] واتە: (خوایە لێم خۆش ببە و شەیتانەکەم بچووك و لاڵ بکە و کۆت و زنجیرەکانمان لێ بکەرەوە (واتە: ئەو کارە خراپانەی کەرێگە دەگرێت لەو کارە چاکانەی کە ئادەمیزاد دەیەوێت پێی هەڵبستێت) و تەرازووی کارەکانم قورس بکە و بمخەرە ناو هاوەڵانی ژوورو (واتە: جبریل و میکایل و ...).

---

[٣٠] أخرجه: أبوداود (٥٠٥٤) و الحاكم (١/٥٤٠) وصححه و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٤٥٢٥، ٤٦٤٩)، و ((صحيح أبي داود)) (٤٢٢٦)، و ((المشكاة)) (٢٤٠٩) .

# تاریکایی پێش پردی (صراط)

تاریکیەکی زۆر دێت بەسەر خەڵکاندا پێش پردی (صراط) و هیچ کەسێك ناتوانێت هیچ کەسێکی تیا ببینێت، دواتر خوای گەورە نوور و ڕووناکی دەبەخشێت بە خاوەن باوەڕان بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت: هاوەڵی بەڕێز ئەبو ئومامە (ﷺ) دەفەرموێت: ((... ثم تنتقلون منه إلى مواقف يوم القيامة فانّكم لفي بعضِ تلك المواقف، حين يَغشى النّاس أمرُ الله فتَبيضُ وجوه، و تَسودُ وجُوه، ثم تَنتقِلون منِه إلى منزِلٍ آخر يَغشَى النّاسَ ظلمةٌ شديدَة، ثم يُقسّم النُور ...))[1]. واتە: (......دواتر دەگوازرێنەوە بۆ لای چەند جێگە وەستانێك لە ڕۆژی کۆتاییدا، کاتێك کە ئێوە لە هەندێك لەو جێگە وەستانانەدان لەناکاو خەڵکان فەرمانی خوا دەیانگرێتەوە هەندێکیان ڕوویان ڕەش دەبێت وەهەندێکیان ڕوویان سپی دەبێت پاشان لەوێوە دەگوازرێنەوە بەرەو جێگەیەکی تر خەڵکان تاریکایی یەکی زۆر تاریك دەیانگرێتەوە پاشان نوور دابەش دەکرێت ...).

کەوا بوو هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو ئومامە ڕوونی کردەوە کە پێ بەخشینی نوور لە دوای ڕوو سپی کردن و ڕوو ڕەش کردن دەبێت، لەو فەرموودەیەی کە ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...ثم يقول: ارفعوا رؤوسكم (أي بعد سجودهم للرب جل و علا)، فيرفعون رؤوسهم فيعطيهم نورهم...))[2] واتە: (... ئینجا دەوترێت سەرتان بەرز بکەنەوە (واتە: لە دوای سوجدە بردنیان بۆ خوای گەورە)،سەریان بەرز دەکەنەوە و نووریان پێ دەدرێت ...).

کەوابوو دەتوانرێت بوترێت خەڵکان لە مەیدانی مەحشەرەوە دەڕۆن بەرەو پردی (صراط) و ئەو تاریکی یە لە پێش پردی (صراط) وەك لە فەرموودەکەی ثەوباندا

---

[1] أخرجه: الحاكم (٢/٤٠٠) وصححه و وافقه وقال محقق ((المستدرك)) (٣٥٦٣): اسناده صحيح، وابن ابي الدنيا ((الاهوال)) (١٤٠)، وقال الارناؤوط في تحقيق ((نهاية البداية)) (ص:٣٣٥): وهو حديث صحيح .

[2] أخرجه: الطبراني (٩٧٦٣) وهو حديث صحيح .

هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((... هم في الظلمة دون الجسر))[٣] واتە: (... خەڵکان لە تاریکایی پێش پردی (صراط)دان).

لە م جێگە تاریکەدا خوای گەورە نور دابەش دەکات بەسەر خاوەن باوەڕاندا و بێ باوەڕان و مونافیقان نوریان پێ نابەخشرێت، ئەبو ئومامە (ﷺ) دەفەرموێت: ((... ثم يقسّم النّور، فيُعطى المؤمن نوراً و يُترك الكافِرُ و المنافِقُ فلا يُعطيان شيئاً ...))[٤]. واتە: (...ئینجا نوور دابەش دەکرێت خاوەن باوەڕ نوری پێ دەدرێت و بێ باوەڕ و مونافیق هیچیان پێ نادرێت) .

بەلاّم جابر (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە مونافقیش نوری پێ دەبەخشرێت بەلاّم کە گەیشتە پردی صراط خوای گەورە نورەکەی دەکوژێنێتەوە: جابر (ﷺ) دەفەرموێت: ((... و يُعطي كُلّ إنسانٍ مِنهُم مُنافِقٌ أو مؤمنٌ نُوراً، ثم يَتبَعُونه، و على جسرِ جهنم كلاليبٌ ... ثم يُطفأُ نور المنافِقين، ثُمَ يَنجُو المؤمنين ...))[٥] واتە: ((... هەموو ئادەمیزادێك مونافیق بێت یان باوەڕدار نووری پێ دەدرێت .. ئینجا نووری مونافیقەکان دەکوژێنەوە و خاوەن باوەڕان ڕزگاریان دەبێت ...)).

وە خاوەن باوەڕانیش نووریان پێ دەدرێت بە گوێرەی کردەوە و پلەکانیان: عەبدولاّی کوڕی مەسعود (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...فيعُطِيهم نُورَهم على قِدر أعمالِهم، فمِنهُم مَن يُعطى نُورُه مِثل الجَبلِ العظيم يَسعى بَين يدِيه، و مِنهُم مَن يُعطى نورُه أصغَرَ مِن ذلك))[٦] ((و مِنهُم مَن يُعطى نُوراً مِثل النَخلة بيمينه، و مِنهم من يُعطى نوراً أصغرَ مِن ذلك حتّى يَكون رَجُلاً يعُطى نورهُ على إبهام قدمه، يضيُء مرةً و (يطفئ)

---

[٣] أخرجه: مسلم (٣١٥) .

[٤] أخرجه: الحاكم (٢/٤٠٠) و صححه و وافقه الذهبي، وقال محقق ((المستدرك)) (٣٥٦٣):اسناده صحيح، ونظر الموضوع مفصلا في كتاب ((التخويف من النار))لابن رجب (ص ١٨٩–)١٩٠

[٥] أخرجه: مسلم ((كتاب الإيمان)) باب (أدنى أهل الجنة منزلة فيها) (١/٩٩) رقم (٣١٦)، و أحمد (٣/٣٨٣) رقم (١٤٧٢١) و قال محققه: حديث صحيح، و عبد الله بن أحمد في: ((كتاب السنة)) رقم (٤٥٧) .

[٦] وفي رواية: ((...مثل القصر ... (و) مثل البيت ...)) أخرجه: إسحاق بن راهويه بسند صحيح كما قال الحافظان: العسقلاني ((المطالب العالية)) (٤٦١١)، و البوصيري((الإتحاف)) (١٠٠٣٩) .

مـرةً، فـإذا أضـاء قَـدَم قَدَمـهُ فَمشـي، و إذا طفـئ قـام......))[٧]. واتـه: (... نووریـان پـێ دەبەخشرێت بـه ئەنـدازەی کارەکانیـان هـی وایـان هەیـه نوورەکـەی پـێ دەدرێـت وەك شـاخێکی گـەورە لـه پێشـیەوە دەڕوات، و هـی وایـان هەیـه نوورەکـەی دەدرێتـێ لـەوە بچوکترە و هـی وایـان هەیـه کـه نوورەکـەی پـێ دەدرێـت وەك دارخورمـا بەدەسـتی ڕاستییەوەتی و هی وایان هەیه نووری پێ دەدرێت لـەوە بچوکترە هـەتاکو پیاو هەیه نووری پـێ دەدرێـت لەسـەر پەنجه گـەورەی قاچی جارێك ڕووناك دەبێتەوە و جارێك دەکوژێتەوە، کـه ڕووناك دەبێتـەوە، قاچی پـێش دەخـات و دەڕوات و ئەگـەر کوژایـەوە دەوەستێت ...).

زانا ابن ابی العز (ﷺ) دەفـەرموێت: ((يفترق المنافقون عن المؤمنين و يَتخَلفُوُن عنهم، و يَسبِقُهم المؤمنون، و يُحالُ بَينهُم بسورٍ يَمنعُهم من الوصول اليهم))[٨]. واتـه: (ئالـەو جێگایـەدا (واته: تاریکی پێش پردی صراط) مونافیقەکان جیا دەکرێنەوە لـه خـاوەن بـاوەڕان و بـەجێ دەمێـنن لێیـان و خـاوەن بـاوەڕان پێشـیان دەدەنـەوە و شـورایەك لێکیـان جیـا دەکاتەوە و ناتوانن خۆیان بگەیەننە ناو ڕیزی موسڵمانان).

لـەو باروو دۆخـە تاریکـە ناهـەموارەدا کـه خـاوەن بـاوەڕان بـه نـووری خۆیـان پـێش دەکەون و کافران و مونفیقان دوا دەکەون لەوێدا بەربەستێك (سد) دادەنرێت لـه نێـوان خـاوەن بـاوەڕان و مونافیقانـدا وەك هـاوەڵی بـەڕێز ئـەبو ئومامـه (ﷺ) دەفـەرموێت: ((...فمن لم يجعل الله له نوراً فماله من نور، ولا يستضيءُ الكافر و المنـافق بنـور المـؤمنين كمـا لا يستضيء الأعمى ببصر البصير، يقول المنافق للـذين آمنـوا: انظرونـا نقتـبس مـن نـوركم، ﴿قِيلَ ٱرْجِعُواْ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُواْ نُورًا﴾ (الحديد: ١٣) و هي خدعه الله التي خدع بهـا المنـافق، قـال الله عـز و

---

[٧] أخرجه: الطبراني في ((الكبير)) (٩٧٦٣)، و الحاكم (٣٧٦/٢) و صححه و وافقـه الذهبـي، وقـال صـاحب ((المجمع)) (٣٤٣/١٠) رواه الطبراني من طُرقٍ أحدها رجاله رجال صحيح، وصحّحه المنذري في ((الترغيـب)) كما في ((تهـذيب الترغيـب)) (٣٤٩٤)، وصـححه الشـيخ الألبـاني في ((مختصـر شـرح العقيـدة الطحاويـة)) (ص: ٤٧٠)، وفي ((مختصر العلو)) (ص: ١١٠) رقم (٦٩)، وصححه الشـيخ شـعيب الأرنـاؤوط في ((شـرح العقيدة الطحاوية)) (٦٠٦/٢)، واخرجه عبدالله بن احمد بن حنبل في كتاب ((السنة)) (١٢٠٣) وقـال المحقـق: إسناده حسن، وقال ابن القيم ((حادي الآرواح)) حديث حسن كما في ((مختصر حادي الأرواح)) (ص: ٢٨٢).

[٨] كما قال الإمام ابن أبي العز في ((شرحه للعقيدة الطحاوية)) (٦٠٥/٢) .

جل يخادعون الله وهو خادعهم، فيرجعون إلى المكان الذي قُسِم فيه النور فلا يجدون شيئاً، فينصرفون اليهم و قد ضُرِبَ بَينَهُم بسورٍ))[٩] واتە: ((.. هەر کەسێك خوا نووری پێ نەدابێت ئەوا نووری نی یە و بێ باوەڕ و مونافیق سوود لە ڕووناکی نووری خاوەن باوەڕان وەرناگرن وەك چۆن کوێر سوود لە ڕووناکی چاوی چاوساغ وەرناگرێت مونافیقان بە خاوەن باوەڕان دەڵێن: لە سەرمان بوەستن تا لە سایەی ڕووناکیتاندا ئێمەش ببێین، پێیان دەوترێت:بگەڕێنەوە دواوە و بەدوای نووردا بگەڕێن، ئەوەش ئەو فێڵەیە کە خوای گەورە دەیکات لە مونافیق: خوای گەورە دەفەرموێت:﴿يخادعون الله وهو خادعهم ...﴾ واتە: ئەوان دەیانەوێ فێل لە خودا بکەن بەلاَم فێڵیان بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە، ئینجا دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگەیەی کە نووری تیادا بەش کراوە و هچیان دەست ناکەوێت و دەگەڕێنەوە بۆ لای خاوەن باوەڕان و شورایەك دروست دەکرێت لە نێوان ئەمان و ئەواندا) .

لەو کاتەدا کە نووری مونافیقەکان دەکوژێتەوە و نووریان دەست ناکەوێت و دەمێننەوە لە تاریکی و ترس دا، ئالەو کاتەدا خاوەن باوەڕانیش دەترسن کە نوورەکانیان کز ببێت یاخود لە دەستی بدەن بۆیە داوا دەکەن لە خوای گەورە و دەپاڕێنەوە کە نوورەکانیان بۆ بەردەوام بکات . وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ لَا يُخْزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (التحريم: ٨)، وە خوای گەورە شورایەك لە نێوان باوەڕدار و مونافیقدا دادەنێت کە دەرگایەکی هەیە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴾ (الحديد: ١٣)

ئیبن کثیر(ﷺ) لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: ((... المراد بذلك سورٌ يُضرَبُ يوم القيامة ليحجز بين المؤمنين و المنافقين فإذا انتهى إليه المؤمنون، دخلوه من بابه، فإذا استكملوُا دخوهم أُغلِقَ الباب، و بَقىَ المنافقون من ورائه في الحيرة و الظلمة و العذاب، كما كانوا

[٩] أخرجه الحاكم (٢/٤٠٠) و صححه و وافقه الذهبي، وقال محقق ((المستدرك)) (٣٥٦٣): اسناده صحيح، وابن المبارك ((الزهد)) (١/٣٦)، وابن ابي الدنيا ((الاهوال)) (١٤٠) وصححه الارناؤوط في تحقيق ((نهاية البداية)) (ص:٣٣٥) .

في دار الدنيا في كفُر و جهلٍ و شكٍ و حيرةٍ: (ينادُونهم ألم نكن معكم) أي ينادي المنافقون المؤمنين: أما كنا معكم في دار الدنيا، نشهد معكم الجمعات، و نصلي معكم الجماعات: و نقف معكُم بعرفات، و نحضر معكم الغزوات، و نؤدي معكم سائر الواجبات (قالوا بلى) أي: فأجاب المومنون المنافقين قائلين: بلى قد كنتم معنا (ولكنكم فتنتم أنفسكم و تربصتم) أي بالحق و أهله (و إر تبتم) أي: بالبعث بعد الموت (و غرَّتكم الأماني) أي: قلتم سيغفر لنا، و قيل: غرتكم الدنيا (حتى جاء أمر الله) أي: مازلتم في هذا حتى جاء الموت، (و غرتكم بالله الغرور) أي: الشيطان: قال قتادة: كانوا على خدعة من الشيطان و الله مازالوا عليها حتى قذفهم الله في النار .و معنى هذا الكلام من المؤمنين للمنافقين انكم كنتم معنا أي بابدان لا نية لها ولا قلوب معها و إنما كنتم في حيرة وشك فكنتم تراءون الناس ولا تذكرون الله إلا قليلاً)) واتە: (مەبەست لەو شورایەیە کە دادەنرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا بۆ ئەوەی خاوەن باوەڕان جیا بکاتەوە لە مونافیقەکان، کاتێك خاوەن باوەڕان دەگەنە بەردەم ئەو شورایە دەرگاکەی دەکرێتەوە و لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە کاتێك هەموویان چوونە ژوورەوە دەرگاکە دادەخرێت، ومونافیقەکان لە پشتی شوراکەوە لە تاریکی و ترس و سزادا دەمێننەوە، وەك چۆن لە دونیادا لە بێ باوەڕی و نەزانین و گوماندا مابوونەوە، وەمونافیقەکان هاوار دەکەن لە باوەڕداران و دەڵێن: ئایا لە گەڵتاندا نەبووین لە نوێژی جەماعەتەکاندا و لەگەڵتاندا نەدەوەستاین لە عەرەفاتدا ؟ و ئامادە نەدەبووین لە غەزاکاندا ؟ و لەگەڵتاندا پێویستیەکانی ترمان ئەنجام نەدەدا ؟ خاوەن باوەڕانیش لە وەڵامی مونافیقەکاندا دەڵێن:بە لێ ئێوە لەگەڵماندا بوون بەڵام خۆتان بە هیلاك بردوو (فەوتان) و چاوەڕێی نەمانی حەق و لایەنگرانی حەقتان دەکرد و بە گومان بوون لە زیندوو بوونەوە لە دوای مردن و ئاواتەکانتان هەڵی خەڵەتاندن کەدەتان وت خوالێمان خۆش دەبێت بەم جۆرە بەردەوام بوون تاوەکو مردنتان پێ گەیشت و شەیتان بە فریوی دان (قەتادە) دەفەرموێت: شەیتان فێڵی لێ کردن و هەڵی خەڵەتاندن وە لەسەر فێڵی شەیتان بەردەوام بوون تا خوا فڕێی دانە ناو ئاگرەوە و مانای وتەی خاوەن باوەڕان بۆ مونافیقەکان ئەوەیە کە ئێوە لەگەڵماندا بوون بەڵام بە لاشەیەکی بێ نیەت و بێ دڵ . بەڵکو لەسەر سوڕمان و گوماندا بوون و ڕیابازیتان دەکرد لەگەڵ خەڵکان و زۆر بەکەمی یادی خواتان دەکرد).

## هەندێك لەو کردەوانەی کە نوور دەبەخشێت بە ئادەمیزاد لە ڕۆژی کۆتاییدا

١- چوون بۆ نوێژی مەغریب و عیشا و بەیانی لە تاریکیدا بۆ مزگەوت:

بورەیدەی ئەسلەمی (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((بشّر المشّائين في الظّلم إلى المساجِد بالنّور التّام يوم القيامة))[10]. واتە: (مژدە بدە بە هاتوو چۆکارانی مزگەوت لە تاریکاییدا بە نووری تەواو لە ڕۆژی کۆتاییدا).

٢- سەر و ڕیش سپی کردن لە ئیسلامەتی دا:

کەعبی کوڕی مورە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من شاب شيبة في الإسلام كانت له نوراً يوم القيامة))[11] واتە: (هەر کەسێك موویەك سپی بکات لە ئیسلامەتیدا دەبێت بە نوور بۆی لە ڕۆژی کۆتاییدا). وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((... كتب له بها حسَنة، و حُطَّ عَنهُ بها خطيئة، و رُفِعَ له بها درجة))[12] واتە: (...هەر کەسێك تەنها موویەك سپی بکات لە ئیسلامەتیدا بەو تەنها مووە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت و خراپەیەکی بۆ لادەبرێت و پلەیەك بەرز دەکرێتەوە)، وەهەر کەسێك لە دونیادا موو سپییەکانی دەربهێنێت چاکەکانی لەگەڵ و ڕووناکیەکەی کەم دەبێتەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((من شاب شيبة في سبيل الله كانت

---

[10] أخرجه: أبوداود (٥٦١)، و الترمذي (٢٢٣)، وابن ماجة (٧٨١)، والحاكم (٢١٢/١) وصححه و وافقه الذهبي، و البيهقي في ((الصغرى)) (٤١٦) وفي ((الكبرى)) (٦٣/٢)، وابن الجوزي في ((العلل المتناهية)) (٤٠٦/١) رقم (٨٦٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٥٧٠)، و في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٨٥)، و في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٦٣٣) و في ((المشكاة)) (٧٢١)، و في رواية: ((إن الله ليضيءُ للذين يتخللون إلى المساجد في الظُلَمِ بالنور التام يوم القيامة)) رواه الطبراني في الأوسط و إسناده حسن – كما قال الهيثمي: ((المجمع)) (٣٠/٢) .

[11] أخرجه: أحمد (٢٠/٦)، و البزار (١٨٠/٢)، و الطبراني في ((الكبير)) ٧٨٣/١٨)، و الترمذي (١٦٣٤)، وابن حبان (٢٩٨٣) و قال محققه: إسناده قوي، و صححه شيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٣٣٤)، و في ((المشكاة)) (٣٨٧٣) .

[12] أخرجه: أبو داود (٤٢٠٢)، و الترمذي (٢٨٢١)، و حسن إسناده الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (٤٤٥٨)، و ابن حبان (٢٩٨٥) و قال محققه: أسناده حسن .

نوراً له يوم القيامة، فقال رجل عند ذلك، فان رجالا ينتفون الشيب؟ فقال ﷺ ((من شاء فلينتف نوره))[١٣] واتە: (هەر کەسێك تاڵە موویەکی لە ڕێگەی خوادا سپی کردبێت ئەو تاڵە مووە دەبێتە ڕووناکی بۆی لە ڕۆژی کۆتاییدا. پیاوێك وتی: هەندێك پیاو هەن مووە سپییەکان دەردەهێنن ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك وابکات ڕووناکییەکەی خۆی ناهێڵێت).

**٣- هاویشتنی تیر لە پێناوی خوا:**

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من رمى بسهمٍ في سبيل الله كان له نوراً يوم القيامة))[١٤]. واتە: (هەر کەسێك تیرێك بهاوێژێت لە پێناوی خوادا دەبێت بە نوور بۆی لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**٤- شایەتی هێنان لە کاتی مردندا:**

طەلحەی کوڕی عەبدولا (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنّي لأَعلمُ كَلِمةً لا يَقُولها عبد عند موته، إلاّ كانت له نوراً لصحيفته، و إنَّ جَسَدَه و روحه ليجدان لها رَوحاً عِند الموت))[١٥]. واتە: (من وشەیەك دەزانم هەر بەندەیەك لە کاتی مردنیدا بیڵێت دەبێت بە نوور بۆ نامەی کردەوەکانی وەجەستە و ڕوحی حەوانەوەیەك هەست پێ دەکەن لە کاتی مردنیدا). وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: ((...إلاّ اشرَق لَها لونه، و نَفّس الله عَنهُ كُربَته))[١٦] واتە: (ڕووی ڕووناك دەبێتەوە و خوای گەرەوە ناڕەحەتی بەسەرەوە لادەبات)، عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) وتی: (من دەیزانم ئەو وشەیە چی یە ئەوەیە داوای کرد لەمامی کە بیڵێت گەر پێغەمبەر (ﷺ)

---

[١٣] أخرجه:أحمد(٢٣٩٥٣)وقال محققه: حديث حسن،والطبراني (رقم: ١٨)(٧٨٣)،والبيهقي(شعب) (٦٣٨٨).

[١٤] أخرجه: البزار (١٧٠٧) بإسناد حسن، كما قال المنذري في ((الترغيب)) (١٩٤٦)، وحسنه الشيخ الالباني في ((صحيح الترغيب)) (١٢٩٢) .

[١٥] أخرجه: أحمد (١٦١/١)، وأبو يعلى (٤٣/٢)، وابن ماجة (٣٧٩٥)، والحاكم (٣٥٠/١) وصححه و وافقه الذهبي، وابن حبان (٢٠٥) وقال محققه: إسناده صحيح، و قال السيوطي في ((شرح الصدور)) (ص: ٣٩): إسناده صحيح، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٦٢)، و في ((صحيح الجامع)) (٢٤٩٢).

[١٦] أخرجه: أحمد (١٣٨٤)، و قال الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص: ٣٤): إسناده صحيح.

شتێکی تری بزانیایە ڕزگار تر بێت بۆ مامی لەو وشەیە فەرمانی پێ دەکرد کە بیڵێت)، لە ڕیوایەتێکی تردا عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((من قال في دبر كل صلاة واذا اخذ مضجعه: الله اكبركبيراً عدد الشفع والوتر.... ولا اله الا الله مثل ذلك كن له في قبره نوراً وعلى الجسر نوراً وعلى الصراط نوراً حتى يدخلنه الجنة))[١٧]، واتە: (هەر کەسێك لە دوای هەموو نوێژێك و پێش خەوتن بڵێت: ((الله اكبركبيراً عدد الشفع والوتر.... ولا اله الا الله مثل ذلك)) ئەو کارە دەبێتە نور بۆی لە ناو گۆڕەکەی ودەبێتە نور بۆ سەر پردی صراط تا دەگاتە ناو بەهەشت).

**٦- ئاگادار بوون لە نوێژە فەرزەکان:**

عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من حافظ عليها (أي الصلوات المفروضة) كانت له نوراً و برهاناً و نجاة يوم القيامة))[١٨] واتە: (هەرکەسێك ئاگاداری (نوێژە فەرزەکانی) بێت ئەو کارەی دەبێتە نوور و بەڵگە و ڕزگار بوون بۆی لە ڕۆژی کۆتاییدا).

**٧- داواکردنی ئادەمیزاد لە خوای گەورە کە نووری پێ ببەخشێت:**

ئەویش لە کاتی شەو نوێژو و چوون بۆ نوێژی بەیانی، ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((اللهم اجعل في قلبي نوراً، و في لساني نوراً، و في سمعي نوراً، و في بصري نوراً، و من فوقي نوراً، و من تحتي نوراً، و عن يميني نوراً، و عن شمالي نوراً و من أمامي نوراً، و من خلفي نوراً، و اجعل في نفسي نوراً، و أعظم لي نوراً، و عظم لي نوراً و اجعل لي نوراً، و اجعلني نوراً: اللهم أعطني نوراً، و اجعل في عصبي نوراً، و في لحمي نوراً، و في دمي نوراً، و في شعري نوراً، و في بشري نوراً))[١٩]. واتە: (خوای

---

[١٧] اخرجه: ابن ابي شيبة ((المصنف)) (٢٩٨٦٦) وقال محققه: رجاله ثقات، و اورده صاحب ((موسوعة الىار الصحابه)) (٦٩٣)، وقال السيوطي: سنده حسن كما ((كنز العمال)) (٤٩٦٤).

[١٨] اخرجه: أحمد (١٦٩/٢) (٦٥٧٦) وقال محققه: اسناده حسن، والدارمي (٣٠١/٢)، والطحاوي (٢٢٩/٤)، و قال الهيثمي ((المجمع))(٢٩٢/١)رجاله أحمد رجال ثقات، و ابن حبان (١٤٦٧) وقال محققه: إسناده صحيح، و البيهقي في: ((شعب الأيمان)) رقم (٢٨٢٣)، وقال الشيخ: احمد شاكر في تحقيقه لـ: ((المسند))(٨٣/١٠) اسناده صحيح، وحسن اسناده ايضاً الشيخ الالباني في ((الثمر المستطاب)) (٥٣/١).

[١٩] اخرجه: البخاري (١١٦/١١)(٦٣١٦)، ومسلم (٥٢٦/١، ٥٢٩، ٥٣٠) برقم (٧٦٣) و رقم (٧٦٨).

گەورە نوور بکەرە دڵمەوە، وەبیکەرە زمانمەوە و نوور بکەرە ناو گوێمەوە، نوور بکەرە ناو چاومەوە، نوور بکەرە لای سەرمەوە، نوور بکەرە لای خوارمەوە، نوور بکەرە لای ڕاستمەوە، نوور بکەرە لای چەپمەوە، نوور بکەرە لای پێشمەوە و نوور بکەرە لای پاشمەوە، نوور بکەرە ناو نەفسمەوە، نوورم بۆ گەورە بکە، و نوورم بۆ دابنێ، وبمکە بە نوور، خوایە نوورم پێ ببەخشە، وە نوور بکەرە ناو دەمارەکانمەوە، و بیکەرە ناو گۆشتمەوە، و بیکەرە ناو خوێنمەوە، وبیکەرە ناو پێست وموووەکانمەوە).

**٨- خوێندنی سورەتی الکهف):**

ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من قرأ سورة الكهف (كما أنزلت) كانت لـه نـوراً يـوم القيامـة مـن مقامـه إلى مكـة...))[٢٠] واتە: (هەر کەسێك سوورەتی (الکهف) بخوێنێتەوە وەك چۆن هاتۆتە خوارەوە نورێکی پێ دەدرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا لە جێگەکەیەوە بۆ مەککە ....).

سەبارەت بەم باسە عەبدولای کوڕی عباس (ﷺ) دەفەرموێت: ((مـن اسـتمع ايـة مـن كتاب الله كانت له نورٌ يوم قيامة))[٢١] واتە: (هەر کەسێك گوێ بیستی تەنها یەك ئایەتی کتێبەکەی خوا ببێت دەبێتە ڕووناکی بۆی لە کۆتاییدا).

**٩- شەیتان ڕەجم کردن لە حەج دا:**

ئیبنو عەباس (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إذا رميت الجمار كان لك نـورا يـوم القيامـة))[٢٢]. واتە:(گەر بەردە وردەکانی ڕەجمت گرتە شەیتان دەبێتە ڕووناکی بۆت لە ڕۆژی کۆتاییدا) .

---

[٢٠] أخرجه: النسائي في ((عمل اليوم و الليلة)) (٨١) و (٥٩٢)، و اخرجه الحاكم (٥٦٤/١) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و البيهقي في ((الصغرى)) (٨٨٧) و قال محققه: إسناد بعض طرقه جيد، و قال الهيثمي ((المجمع)) (٥٣/٧) أخرجه الطبراني ((الأوسط)) و رجاله رجال صحيح، و قال المنذري ((الترغيب)) (٩٧/٢) إسناده لا بأس به، و صححه العلامة الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٦٥١)، و((صحيح الترغيب)) (٢٢٥) .

[٢١] أخرجه: عبدالرزاق (المصنف) (٦٠١٢).

[٢١] أخرجه: البزار (١١٤٠)، و حسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة))(٢٥١٥)، و((صحيح الترغيب)) (١١٥٧) .

# گۆڕینی ئاسمانەکان و زەوی

دوای ئەوەی کە خاوەن باوەڕەکان و مونافیقان جیا دەکرێنەوە بەو شورایەی کە خوای گەورە ناوی بردووە لە قورئانی پیرۆزدا کە پێی دەچێت ئەو شورایە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا بێت وەك لە فەرموودەیەکی صحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( ... إذا أدخَلَ اللهُ أهلَ الَجنَّةِ الجَنَّةِ و أهلَ النّارَ النّارَ أُتي بـالموتِ ملبَّبًا، فَيُوقَفُ على السور الذي بين أهلِ الجنَّة و أهل النّـارِ ...))[1] واتە :(کاتێك خوای گەوری خەڵکانی بەهەشتی دەباتە ناو بەهەشت و خەڵکانی دۆزەخ دەخاتە ناو دۆزەخ مردن دەهێنرێت ڕادەوەستێنرێت لە سەر ئەو شورایە کە هەیە لە نێوان خەڵکانی بەهەشت و خەڵکانی دۆزەخدا). دوای دەرچوونی خاوەن باوەڕان لە تاریکی یەکەدا و بە ڕێکەوتنیان بەرەو پردی صراط سەرەتاکانیان دەگاتە سەر پردەکەوە کۆتاییەکانیشیان لە تاریکی یەکەوە بەڕێ کەوتون بەرەو پردی صراط ئا لەو کاتەدا ئاسمان و زەویەکان دەگۆڕێن ئەمەش بەکۆکردنەوەی بەڵگەکانی سەبارەت بەم باسە وا دەبێت، وە دوو فەرموودەی (صحیح)ی لەسەر هەیە :

**یەکەمیان:** فەرموودەکەی ثەوبانە (ﷺ) کە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((كُنتُ قائماً عند رسول الله (ﷺ)، إذ جاء حِبرٌ مِن أحبارِ اليَهود، فَقالَ: ... جِئتُكَ أسـألك ... فَقـالَ اليهـوديُّ : أين يَكونُ النّاسُ يَومَ تُبدَّلُ الأرضُ غيرَ الأرضِ و السماواتُ ؟ فقـال رسـول الله (ﷺ) : (( هُـم في الظُّلمةِ دُونَ الجِسرِ))[2] واتە : ( وەستا بووم لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك کە زانایەك لە زاناکانی جولەکەکان هات و وتی : ... هاتووم پرسیارت لێ بکەم .. ئینجا جولەکەکە وتی : خەڵکان لە کوێ دەبن لەو ڕۆژەدا کە ئاسمانەکان و زەوی تیایدا دەگۆڕێت ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (ئەوان لەو کاتەدا لە تاریکایی پێش پردەکەدان).

**دووەمیان:** فەرموودەکەی عائشەی دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها) کە دەفەرموێت : ((قلتُ: يـا رسـول الله ، أرَأيـتَ قـول الله عـز و جـل: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ

[1] اخرجه : الترمذي (٢٦٩٥)، وصححه الشيخ الالبـاني في : ((صـحيح سـنن الترمـذي)) (٢٠٧٢)، ((صـحيح الجـامع)) (٧٨٨٢)، ((الطحاوية)) (٥٧٦) .

[2] أخرجه : مسلم (٣١٥) .

وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾( إبراهيم: ٤٨) أينَ يَكونُ النَّاسَ يومئذٍ؟ قال (( على الصراطِ ))[٣].

**واتە: ( وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ خەڵکان ئەو ڕۆژە لە کوێ دەبن ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (لەسەر پردی صراط دەبن).**

**دەتوانرێت بوترێت کە سەرەتای گۆڕینی ئاسمانەکان و زەوی لە کاتێکدا دەست پێ دەکات کە خەڵکان لە تاریکیەکەوە بەرەو پردەکە کەوتوونەتە ڕێ ، و کۆتایی گۆڕینی ئاسمانەکان و زەوی لە کاتی گەیشتنی سەرجەم خەڵکان بۆ سەر پردی صراط و پەڕینەوەیان لە سەری دەبێت، ئەمەش بۆچوونی (ابن رجب)ە لەکتێبی (التخويف من النار ص: ١٨٧) یان پێ دەچێت کە دوو گۆڕانکاری هەبێت :**

**یەکەمیان : کاتێك خەڵکان کەلەتاریکیەکەدان .**

**دووەمیان : کاتێك کە خەڵکان لەسەر پردی صراط دەبن .**

**تەنها خوای گەورە دەزانێت کە ئەو گۆڕانکاریە چۆنە ئایا ئەو گۆڕینەیە کەلە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا (ﷺ) هاتووە ؟ کە دەفەرموێت:** (( يقبض الله الأرض يوم القيامة ، و يطوي السماء بيمينه ... ))[٤]. **واتە : (خوای گەورە زەوی دەگرێت لەڕۆژی کۆتاییدا و ئاسمان دەپێچێتەوە بە دەستی ڕاستی).**

**یاخود فەرموودەکەی ئیبنو عومەر (ﷺ) کە دەفەرموێت :** ((ان رَسُول اللهِ (ﷺ) قرأ هذه الآيات يوماً على المِنبَرِ : ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ .... ﴾ (الزمر: ٦٧) **واتە : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێك ئەم ئایەتانەی لەسەر مینبەر خوێندەوە : ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ..... ﴾. و پێغەمبەری خوا ئاوای دەکرد :** (( بإصبعه [وَ قَبضَ بيدهِ فَجَعَلَ يقبضُها و يَبسُطها][٥] يُمَجّدُ الرَبُّ جَلَّ وَ عَلا نَفْسَهُ ، ثُمَّ

---

[٣] أخرجه : أحمد (٦/٣٥)، و مسلم (٢٧٩١)، و الترمذي (٣١٢١) : حسن صحيح، و ابن ماجة (٤٢٧٩)، و صححه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن ابن ماجة )) (٣٤٥٢) .

[٤] أخرجه : احمد (٢/٣٧٤)، والبخاري (٦٥١٩)، ومسلم (٢٧٨٧) .

[٥] أخرجه : ابن ماجة (١٩٨)، و صَحّحه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن ابن ماجة )) (١٦٤) .

يَقُول [أنا الله ، أنا الرَّحمن][٦] أنا المَلِكْ [اينَ ملُـوكِ الأرضِ][٧] انا الجَبَّـار [أيـنَ الجَبَّـارون][٨] أنـا المُتَكبِّر [أين المتكبرون][٩] أنا العَزيز ، انا الكَريمُ ، فَرَجفَ برسُولِ اللهِ (ﷺ) المِنبَر حتى قُلنا لَيَخِـرَّنَ بـهِ))[١٠] واتـه : (دەستی دەگوشـی و دەیکـردەوە و دەیفـەرموو ، خـوای گـەورە خـۆی شکۆمەند دەکات و دەفەرمویت (( من (الله)م : مـن (رحمـان)م ) ، مـن پاشـام (پاشـاکانی زەوی لە کوێن ؟) ، من جەبارم (جەبارەکان لـەکوێن ) ، مـن (متکبرم) (موتەکەبیرەکان لـە کوێن) ، من عەزیزم من کەریمم) مینبەرەکە لـەریوە بـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) هـەتاکو وتمان دەیخاتە خوارەوە) ، پاشـان خـوای گـەورە ئاسمانـەکان وزەویـەکان دەپێچێتەوە وەك پەرتووك و پەڕە (ابن كثير (رحمـه الله)) فەرمویەتی : (( والصحيح عـن ابـن عبـاس ان السجل هي الصحيفة ( وقول تعـالى : ﴿ يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾( الأنبياء: ١٠٤): ومعنـى الكـلام : يـوم نطـوي السماء كطيّ السجل للكتاب اي على الكتاب بمعنى المكتـوب))[١١] واتـه : (ڕاست ئەوەیە کە ئـیبن و عبـاس (ﷺ) فەرموویـەتی : وشـەی (السـجل) بـەمانای پـەڕە دێـت ومانـای ئایەتەکەش: لەو ڕۆژەدا ئاسمان دەپێچێتەوە وەك چۆن پـەڕە نوسـراوەکانی نـاو خـۆی دەپێچێتەوە .

---

[٦] أخرجه : ابن حبان (٧٣٢٤) وَ قال محققه : إسناده صحيح .

[٧] أخرجه : ابن ماجة (١٩٢)، و صححه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن ابن ماجة )) (١٥٩) .

[٨] أخرجه : ابن ماجة (١٩٨)، و صححه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن ابن ماجة )) (١٦٤) .

[٩] أخرجه : ابن ماجة (١٩٨)، و صححه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن ابن ماجة )) (١٦٤) .

[١٠] أخرجه :احمد (٢/٣٧٤)، والبخاري (٦٥١٩)، ومسلم (٢٧٨٧) .

[١١] انظر : (( تفسير القرآن العظيم )) (٣/٢١٠)، وفي رواية ضعيفة عن ابن عمر قال: كان للنبـي (ﷺ) كاتـب يقـال لـه : السجل فانزل الله (كطي السجللكتب ) وقال : السجل هو الرجـل . وقـال ابـن عبـاس : والسـجل هـو الرجـل بلغة الحبشة)، أخرجه : ابن جرير (١٧/٧٩) وقال : لايعرف لنبينا كاتب اسمه السجل ولا في الملائكـة ملـك ذلـك اسمـه )، و الطبراني ((الكبير)) (١٢/١٧٠)، والبيهقي ((الكبرى)) (١٠/١١٦)، وابن عـدي ((الكامـل)) (٧/٢٦٦٢) وقـال :غـير محفوظ، وابو داود (٢٩٣٥) وضعفه الشيخ الالبـاني في ((ضـعيف ابـي داود)) (٦٣٠)، والنسـائي ((التفسـير)) (٣٥٥) وقال محققه : ضعيف منكر، والخطيب ((التأريخ)) (٨/١٧٥) وقال محققه : موضوع (انظـر : زوائـد تـأريخ بغـداد) رقـم (١٢٠٢)، وصححه الحافظ في ((الاصابة)) (٢/١٥) رقم (٣٠٩٤)، وقال ابن تيمية الموضـوع، و قـال الحـافظ المـزي : منكر جداً . انظر ((البداية النهاية )) لابن كثير (٥/٣٤٧) و ((تهذيب السنن)) لابن القيـم (٤/١٩٦)، وحكـم الذهبـي بوضعه((مسائل طلاب العلم)) (ص: ٢٠٦)، و اوردناه للعلم الاعتبار فقط .

# پردی صراط

**پێناسەی صراط:** ئەو پردەیە کە دادەنرێت لەسەر دۆزەخ، و هەموو کەسێك دەبێت بەسەریدا بڕوات و لەوێشەوە خوای گەورە باوەڕداران ڕزگار دەکات و ستەمکاران و مونافیقان بەردەدرێنەوە خوارەوە بۆ ناو دۆزەخ.

وەصفی (صراط): پردی صراط دانراوە لەسەر دۆزەخ و لەکاتێکدا کە خەڵکان مەحشەر جێ دەهێڵن و بەرەو دۆزەخ دەڕۆن ئالەو کاتەدا پردی صراط دەهێنرێت و دادەنرێت لەسەر دۆزەخ.

ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...ثُمَّ يُؤتى بِالجِسرِ فَيُجعلَ بين ظَهرانَي جَهَنَّم))[1]. واتە: (ئینجا پردەکە دەهێنرێت و دادەنرێت لەسەر ئەم لاو ئەولای دۆزەخ واتە: لەسەری). پێغەمبەر(ﷺ) بەوردی باسی پردی صراطی کردووە کە پردێکی زۆر باریکە و زۆر تیژە و خەڵکان بە گوێرەی کردەوەکانی خۆیان دەتوانن بەسەریدا تێپەڕن، پردی صراط پردێکی یەکجار باریکە وەك لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((... كَحَدِّ السيفِ))[2] واتە: (... باریکە وەك تیژی شمشێر).

ئیبنو مەسعود (ﷺ) دەفەرموێت: ((مِثْلَ حدِّ السيفِ المُرهِف))[3] واتە: (باریکە وەك دەمی شمشێرێ یەکجار تیژ) ، بەهۆی باریکی پردی صراط مەلائیکەکان سەریان دەسوڕمێت لەوەی کە کێ دەتوانێت بەسەریدا بپەڕێتەوە، وەك لە فەرموودەکەی سەلمانی فارسی (ﷺ)دا هاتووە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە

---

[1] أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، و مسلم (١٨٣).

[2] أخرجه: الطبراني ((الكبير))(٩٧٦٣)، و الحاكم (٣٧٦/٢) وصححه و وافقه الذهبي، و قال ابن حجر الهيثمي ((المجمع))(٣٤٣/١٠): رواه الطبراني من طرق أحدها رجاله رجال صحيح، وقال الشيخ الألباني في ((شرح العقيدة الطحاوية))(ص: ٢٦٤)، و ((مختصر العلو))(٦٩):حديث صحيح.

[3] أخرجه: الطبراني ((الكبير))(٨٩٩٢)، و قال الهيثمي ((المجمع))(٣٦٠/١٠) رجاله رجال الصحيح غير عاصم و قد و ثق، وقال المنذري: رواه الطبراني بإسنادٍ حسن، كما في ((الترغيب)) (٥٣١٠)، وقال العلامة السفاريني ((اللوامع)) (١٩٠/٢): إسناده حسن، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٦٢٧).

فەرموویەتی: ((... و يُوضَعُ الصِراطُ مِثل حدّ الموسي، فَتقولُ الملائكـة: مَـنْ تُجيـزُ علـى هـذا ؟ فَيقولُ (الله تعالى): مَنْ شِئتُ مِنْ خَلقي، فَيَقولُ (الملائكة): سُبحانَكَ ما عَبـدناكَ حـقَّ عِبادَتِـكَ))[٤] واتە: (... پردی صراط دادەنرێت وەك دەمی تیژی موس وایە، مەلائیکەکان دەڵێن: کێ دەتوانێت بەسەریدا بڕوات ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوانەی کە خۆم دەمەوێت لە دروست کراوەکانمدا، مەلائیکەکانیش دەفەرموون: پاکی شایەنی تۆیە: نەمان پەرستوویت بە پەرستنێکی تەواو شایستە بە تۆ).

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبوبکر (ﷺ) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يُحمل الناس على الصراط يوم القيامة فتقادُعَ بهم جنبتا الصراط تقادعَ الفراش في النار)) قال: ((فَيُنجيُ الله برحمته من يشاءُ))[٥] واتە: (خەڵکان دەچنە سەر پردی صراط وهەڵیان دەگرێت وبەم لاولادا و بەسەر یەکدا دەیانخاتە خوارەوە وەك چۆن پەپوولە بەسەر یەکدا دەکەونە ئاگرەوە پاشان خوای گەورە ئەوانەی ویستی لێ یەتی لە بەندەکانی بەبەزەیی خۆی ڕزگاریان دەکات).

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە پردی صراط دەفەرموێت: (پردێکە خەڵکان خۆناگرن لەسەری و چەند قولاپێکی هەیە کە خەڵکان دەگرێت و فڕێیان دەداتە ناو دۆزەخەوە و دڕکاوی و زبرە).

ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەفەرموێت: ((... قُلنا يا رسول الله: ما الجِسرُ ؟ قال: ((مَدْحَضـةٌ مَزلـةٌ عليـه خطـاطِيفٌ)) [٦] واتە: (وتمان ئەی پێغەمبەری خوا پردی صراط چییە؟ فەرمووی: (فڕێدەرێکی خلیسکە چەند قولاپێکی بەسەرەوەیە)، هەروەها ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەفەرموێت: ((تَخطفُ النـاسَ (بأعمـالِهم...)[٧] يَمينـاً و شَـمالاً))[٨]

---

[٤] أخرجه: ابن ابي شيبة ((المصنف)) (٣٥٣٣٥) وقال محققه: اسناده صحيح موقوفاً، و الحاكم (٤/٥٨٦) و قال: صحيح على شرط مسلم، و وافقه الذهبي. و صححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٩٤١)، وأخرجه أيضا: اللالكائي: ((شرح إعتقاد أهل السنة و الجماعة)) (٢٢٢٠).

[٥] أخرجه: أحمد (٢٠٤٤٠) وقال محققه: اسناده حسن، و ابن أبي شيبة (١٧٧/١٣) (٣٦٧١)، وأبي عاصم ((السنة)) (٨٣٨) و (٨٦٣) وقال محققه: اسناده حسن.

[٦] أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، و مسلم (١٨٣).

[٧] أخرجه: البخاري (٤/١٤٣٤) عن أبي هريرة ﷺ.

واتە: (ئەو قولاپانە خەڵکان (بەگوێرەی کارەکانیان)، دەخاتە خوارەوە بەلای ڕاست و چەپدا)، حوذیفە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((...و في حافَتي الصِراطِ كَلاليبُ (مِنَ النار)[9] مُعَلَقةٌ))[10] ((...مِثلَ شوكِ السَعدانِ ... غَيرَ أنَّها لا يَعلَمُ قَدَرعِظَمِها إلاّ الله))[11]((.. وَ حَسَكَةٌ مُفَلطَحةٌ (أي فيه عرض و إتساع) لَها شوكَةٌ عُقَيفاءٌ (أي معوجة)))[12] ((يَخطِفُ الناسَ بأعمالِهِم..))[13] و ((.. مأمورةٌ تأخذُ مَنْ أمِرتْ بِهِ))[14] واتە: (...(لەم لاولای پردی (صراط)دا چەند قولاپێك هەیە لە (ئاگر)، كە پێوەی هەڵواسراوە) (وەك دڕكی سەعدان...... بەڵام كەس ئەندازەی گەورەیی یەكەی نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت) (و چەند دڕكێكی پان و تیژی لەسەرە و دڕكەكانی چەماونەتەوە) (خەڵكان فڕێ دەدات بە كردەوەكانیان) و (... ئەوانەش دەگرێت كە فەرمانی پێكراوە بیگرێت).

ابن رجب (ﷺ) دەفەرموێت: (بڕوا و كاری چاكە لە دونیادا ڕێگەی ڕاستە،و هەر كەسێك لە سەر ئەم ڕێگایە ڕاست ڕۆیشتبێت و بەلای ڕاست و چەپدا لای نەدابێت بۆلای گومانەكان (شبهات) و ئارەزوەكاندا (شهوات) ئەوا لەڕۆژی كۆتایدا ڕۆیشتنی ڕێك دەبێت لەسەر پردی(صراط) و لێی لانادات وە لێی ناكەوێتە خوارەوە (بڕوانە (التخويف من النار) (ص: ١٩١).

---

[8] أخرجه: أحمد (٣/٢٦)، و مسلم (١٨٥)، وابن حبان (٧٣٧٩) و قال محققه، إسناده صحيح على شرط مسلم.

[9] أخرجه: مسلم (٢٩٦٨).

[10] أخرجه: مسلم (١/١٠٥).

[11] أخرجه: البخاري (٦٥٠٣)، ومسلم (٢٩٩).

[12] أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، ومسلم (١٨٣).

[13] أخرجه: البخاري (٦٥٧٣)، و مسلم (٢٩٩).

[14] أخرجه: مسلم (٢٩٩).

## یەکەم کەس کە دەپەڕێتەوە بەسەر پردی صراطدا

لەسەرو بەندی (حەشر)دا باسمان کرد کە خوای گەورە ئەمر بە خەڵکان دەکات هەر کەسێك دوای پەرستراوی خۆی بکەوێت کە پەرستوویەتی لە ژیانی دونیادا، و لەوێدا هەموو کەسێك دوای پەرستراوی خۆی دەکەوێت و تەنها باوەڕداران دەمێننەوە کە خوای گەورەیان پەرستووە چاوەڕوانی خوای خۆیان دەکەن و دێت بۆ لایان بۆ (صراط) ودواتر بۆ بەهەشت.

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((.. فَيَأتِيَهُمُ اللّٰهُ في الصورة التي يعرِفون فَيقولُ أنا ربُّكُم (فامضُوا)[١٥] فيقولون: أنت ربُّنا فَيَتْبِعونَهُ))[١٦] واتە: ((خوای گەورە) دێت بۆ لایان بە ئەو شێوەیەی کە ئەوان دەیناسنەوە و دەفەرموێت: (من خواتانم، بڕۆن) ئەوانیش دەڵێن: (تۆ خوای ئێمەی، بەدوایدا دەڕۆن))، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە ئیبن مەسعود (ﷺ) دەفەرموێت: ((.. و الرَبُّ عز و جل أمامَهُم حتَّى يَمُرَّ في النّار))[١٧] واتە: (خوای باڵا دەست لە پێشیانەوە بەرامبەر یانە تاکو بەناو دۆزەخدا تێدەپەڕن).

یەکەم کەس کە تێدەپەڕێت بەسەر پردی صراطدا پێغەمبەری خۆشەویستمانە(ﷺ) بە خۆی و ئومەتەکەیەوە ئینجا پێغەمبەرانی تر، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((.. فأكونُ أنا و أُمَّتي أوّلَ مَنْ يُجيزها))[١٨] واتە: (من و ئومەتەکەم یەکەمین کەسان دەبین کە دەڕۆین بە سەریدا) ، و لە نێوان ئومەتی پێغەمبەردا یەکەم کەس کە دوای پێغەمبەر (ﷺ) دەپەڕێتەوە بەسەر پردی صراطدا کۆچکارە هەژارەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوان (ﷺ)، وەك لە فەرموودەکەی ثەوبان (ﷺ) هاتووە

---

[١٥] أخره: مسلم: (٢٩٦٨).

[١٦] أخرجه: البخاري (٦٥٧٣)، و مسلم (٢٩٩).

[١٧] أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٩٧٦٣) وهو حديث صحيح، صححه الشيخ الألباني في ((مختصر العلو)) – رقم (٦٩) (ص: ١١).

[١٨] أخرجه: البخاري (٧٤٧٣).

کەدەفەرموێت: ((...فقال اليَهوّديُ: فَمَنْ أوّلُ النّاسِ إجازةً؟ قال (ﷺ): ((فُقراءُ المُهاجرين))[١٩] واتە: (ئینجا جولەکەکە وتی: کێ یەکەم کەس بەسەر پردی صراطدا دەپەڕێتەوە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هەژارە کۆچ کردوەکانن)) .

## ڕۆیشتنی خەڵکان بەسەر پردی صراطدا

تێپەڕ بوونی خەڵکان بەسەر پردی صراطدا بەگوێرەی نوور و کردەوەکانیان دەبێت بەشێکیان ڕزگاریان دەبێت و بەشێکی تریان دەکەونە خوارەوە.

ئیبنو مەسعود(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...يَرِدُ النَاسُ النّارَ، ثُمَّ يَصدرونَ مِنها بأعمالِهِم...))[٢٠] واتە:(..خەڵکان بەسەر دۆزەخدا تیدەپەڕن و ئینجا لێی دەردەچن بە کردەوەکانیان...)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((...فَيُعطِيهِم نورّهم على قَدر أعمالِهِم.. فيمرّونَ (أي على الصراط) على قدر نُورهِم))[٢١] واتە: (نوور یان پێ دەدرێت بە گوێرەی کردەوەکانیان و تێدەپەڕن (واتە: بەسەر پردی صراطدا) بە ئەندازەی نوورەکانیان ، لەڕیوایەتێکی (ضعیف)دا هاتووە ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... لا يَبقَى بَرٌ ولا فاجِرٌ إلاّ دَخَلَها (أي الصراط) فَتكون على المؤمن بَرداً وسلاماً كما كانت على إبراهيم))[٢٢]واتە: (چاك و خراپ نامێنێت هەر هەموو تێدەپەڕێت (واتە: دەچن بەسەر پردی صراطدا) و ئاگرەکە سارد و سەلامەت دەبێت لەسەر باوەڕداران وەك چۆن بوو لەسەر ئیبراهیم).

بە هۆی ناخۆشی و ناڕەحەتی پەڕینەوەی موسوڵمانان بەسەر پردی صراطدا خوای گەورە ڕێگە دەدات بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و مەلائیکەکان و پێغەمبەران و

---

(١٩) أخرجه: مسلم: (٣١٥).

(٢٠) أخرجه: احمد (٤١٤١) وقال محققه:اسناده حسن، و الترمذي (٣١٩٥) و قال: حديث حسن، والدارمي (٣٢٩/٢)، و ابو يعلى (٥٢٨٢)، و الحاكم (٣٧٥/٢) وصححه و وافقه الذهبي، وصححه العلامة الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٥٢٦).

(٢١) أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٧٣٦٩) وهو حديث صحيح كما ((صحيح الترغيب)) (٣٥٩١).

(٢٢) أخرجه: أحمد (٣٢٩/٣) (١٤٥٢٠) وقال محققه:اسناده ضعيف، والحاكم (٥٨٧/٤)و صححه و وافقه الذهبي، و البيهقي ((الشعب)) (٣٧٠) و قال: هذا إسنادٌ حسن، و قال الهيثمي ((المجمع)) (٥٥/٧) رواه احمد و رجاله ثقات.

موسوڵمانان بە تکا کردن، و ئەمانەت و ڕەحم دەنێردرێت بۆ ئەم لا و ئەو لای (صراط) وەك حوذیفە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((...فَيَأتون محمداً (ﷺ) فيقومُ فيؤذَنُ لَهُ و تُرسَلُ الأمانةُ و الرّحمُ فَتَقومانِ جَنبَتَيِ الصراط يَميناً و شَمالاً...))[٢٣] واتە: (هەڵدەستێت واتە: (پێغەمبەر) وڕێگەی پێ دەدرێت وە ئەمانەت و ڕەحمی لە گەڵدا دەنێررێت و لای ڕاست و چەپی پردی صراطدا دەوەستن...).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەوەستێت لەسەر پردەکە و تکا دەکات بۆ موسوڵمانان بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بەسەریدا بپەڕنەوە). وەك حوذیفە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((..و نَبِيُّكُم على الصراط يَقولُ رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ....))[٢٤] واتە:.. (پێغەمبەرەکەتان دەوەستێت لەسەر پردی صراط و دەڵێت: پەروەردگارم بیانپارێزە بیانپارێزە (واتە: سەلامەتیانکە سەلامەتیانکە...).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ([والانبياء بجنبتي الصراط] ولا يَكلَم يومئذٍ إلاَّ الرّسُل (ودعاءُ)[٢٥] الرُسُلِ يَومَئذٍ: اللهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ...))[٢٦] واتە: (پێغەمبەران ئەو ڕۆژە لە هەردوولای پردەکەوە وەستاون و ئەو ڕۆژە هیچ کەس قسە ناکات تەنها پێغەمبەران نەبێت (و پاڕانەوەی پێغەمبەرانیش لەو ڕۆژەدا:خوایە سەلامەتیان بکە خوایە سەلامەتیان بکە...)).

هەروەها پاڕانەوەی موسوڵمانانیش لەو ڕۆژەدا کە کاتێك تێ دەپەڕن بەسەر پردی (صراط)دا ئەوەیە: (خوایە سەلامەتمان بکە خوایە سەلامەتمان بکە) ئەمەش لە دوو فەرموودەدا هاتووە، یەکەمیان: لە موغەیرەی کوڕی شوعبە(ﷺ) وە کە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((شعارُ المؤمنين على الصراط يوم

---

[٢٣] أخرجه: مسلم في كتاب ((الإيمان)) باب (قول (ﷺ) أنا أول من يشفع) (١٠٥/١)، رقم (٤٨١).

[٢٤] أخرجه: مسلم (١٠٥/١)، والحاكم (٥٨٨/٤) و صححه على شرطهما و وافقه الذهبي،وابن ابي عاصم ((السنة)) (٦٤٧) وقال محققه: اسناده صحيح والزيادة له.

[٢٥] اخرجه: البخاري (٦٥٧٣)، و أحمد ((المسند)) (١١١٢٧) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن.

[٢٦] أخرجه: أحمد (٢٦/٣)، وابو يعلى (١٢٥٣)، ومسلم (١٨٥)، و الحاكم (٣٧٥/٢) وصححه على شرطهما و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٧٣٧٩) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم

القيامةِ: اللهُمَ سَلِّمْ سَلِّمْ...))[٢٧]. واتە: (دروشمی باوەڕداران لەسەر پردی صراط لە ڕۆژی کۆتاییدا: خوایە سەلامەتمان کەیت خوایە سەلامەتمان کەیت).

دووەمیان: ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... و يُوضَعُ الصراط فَيَمُرّونَ عليه مثل جِياد الخيلِ و الرِّكابِ و قَولُهُم عليه سَلِّمْ سَلِّمْ...))[٢٨] واتە: (پردی صراط دادەنرێت و تێدەپەڕن بەسەریدا وەك خێرایی ئەسپی چاك و وشتری چاك و قسەشیان لەسەری: سەلامەتمان کە، سەلامەتمان کە).

سەبارەت بەم باسە ئیبن ورەجەبی حەنبەلی (رحمه الله) دەفەرموێت: ((الايمان والعمل الصالح في الدنيا هو الصراط المستقيم في الدنيا الذي امر الله العباد بسلوكه و الاستقامة علية وامرهم بسؤال الهداية اليه، فمن استقام سيره على هذا الصراط المستقيم في الدنيا ظاهراً و استقام مشية على ذلك الصراط المنصوب على متن جهنم ومن لم يستقم سيره على هذا الصراط المستقيم في الدنيا بل انحرف عنه اما الى فتنة الشبهات أو الى فتنة الشهوات كان إختطاف الكلاليب له على صراط جهنم بحسب إختطاف الشبهات والشهوات له عن هذا الصراط المستقيم كما في حديث ابي هريرة (ﷺ) ((انّها تخطف الناس بأعمالهم))[٢٩] واتە: (باوەڕ و کردەوەی چاك لە دونیادا ئەو ڕێگە ڕاستەیە کە خوای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی کردووە بەسەریدا بڕۆن و بەردەوام بن و لا نەدەن و داوای زیاتر ڕێنمونی بکەن بۆ ڕۆیشتن بەسەریدا. وەهەرکەسێك لە دونیادا ڕویشتنی بەسەر ئەو ڕێگە ڕاستەدا ڕیك بوو لە ناوەڕۆك و ئاشکرادا ئەو کەسە لە قیامەتدا ڕۆیشتنی ڕێك وبێ کێشە دەبێت بەسەر پردی صراط دا کە لەسەر دۆزەخە، وە هەرکەسێك لە دونیادا ڕێك نەڕۆیشت بێت لەسەر ڕێگەی ڕاست و لای دابێت بۆ هەڵدێرەکانی ئارەزوو و گومان، ئەو کەسە قولاپەکانی دۆزەخ لای دەدەن لەسەر پردەکەو هەڵی دەدەنە دۆزەخەوە وەك چۆن لە

---

[٢٧] أخرجه: الطبراني((الكبير)) (٢٠/١٠٢٥)، والحاكم (٢/٣٧٥) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، والترمذي (٢٤٣٢) و قال: حديث غريب، وضعفه الألباني في ((ضعيف سنن الترمذي)) (٢٤٣٢).

[٢٨] أخرجه: الترمذي (٢٥٥٧) و قال: حسن صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٧٢)، و((مختصر الطحاوية)) (٥٧٦).

[٢٩] انظر: مسلم (١٨٢)، و ((التخويف من النار)) (ص:١٩١) لابن رجب الحنبلي.

فەرموودەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە ئەبو هورەیرە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە و فەرموویەتی: ((قولاپەکانی پردی صراط خەڵکان بەهۆی کردەوەکانیانەوە دەخەنە دۆزەخەوە)).

## شێوەی پەڕینەوەی خاوەن باوەڕ بەسەر پردی صراطدا

پردی صراط پردێکی باریکە ستەم کاران و بێ باوەڕان ناتوانن بە سەریدا بپەڕنەوە و قولاپەکانی دەیانگرێت و فڕێیان دەداتە ناو دۆزەخەوە، موسڵمانان دەپەڕنەوە بەسەر پردی صراطدا بە گوێرەی کردەوەکانیان هی وایان هەیە خێرایە و هی وایان هەیە لەسەر خۆیە و هی وایان هەیە بە سەلامەتی دەپەڕێتەوە و هی وایان هەیە بە برینداری دەپەڕێتەوە وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەم فەرموودەیەدا ڕوونی کردۆتەوە: ((يَجوزُ المُؤمنُ كالطرْف [كطرف العين][30]، [ و كَلَمحِ البَرقِ و كالرِّيحِ ][31]، وكَانقِضاض الكوكبِ... [و كمَرِّ الطيرِ... ][32] و[ كالسَّحابِ و كشَدِّ...كحفر... ][33] [كَجري الفَرَس][34]،[ و كَأجاويدِ الخيلِ و الرِّكابِ (أي الإبل السريعة المشي)])[35]، [و مِنهُم مَنْ يَمُرُّ كَشَدِّ الرَّجُلِ))[36]، [و مِنهُم مَنْ يَسعى سعياً، و مِنهُم مَنْ يمشي مشياً، و مِنهُم مَنْ يَحبُوا حَبْواً، و مِنهُم مَنْ يزحَفُ زحفاً))[37]، ((.. حتَّى يَمُرُّ آخرهُم يُسحَبُ سحباً.. فناجٍ مُسَلَّمٌ و ناجٍ مخدوشٌ، و مكدوسٌ في نارِ جَهنَّم ...))[38]، ((فَمِنهُم مَنْ يُوبِقُ بِعَمَلِهِ، و مِنهُم مَنْ

---

[30] أخرجه: في رواية الطبراني (٩٧٦٣)، وصححه الشيخ الالباني في ((مختصر العلو)) (٦٩).

[31] أخرجه: البخاري: (٤٩١٩)، و مسلم (١٨٣).

[32] أخرجه: مسلم (١/١٠٥) ((كتاب الإيمان)).

[33] أخرجه:الترمذي (٣١٥٩)،وقال حديث حسن، وصححه الشيخ الألباني ((صحيح سنن الترمذي))(٢٥٢٦).

[34] في رواية: الطبراني ((الكبير))(٩٧٦٣)، وقال الشيخ الألباني في ((الطحاوية))(ص: ٢٦٤): حديث صحيح.

[35] أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، و مسلم (١٨٣).

[36] في رواية: الطبراني ((الكبير)) (٩٧٦٣).

[37] أخرجه: أحمد (٣/٢٦)، و مسلم (١٨٥)، وابن ماجة (٤٣٠٩)، و ابن حبان (٧٣٧٩)، وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[38] أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، و مسلم (١٨٣)، و في رواية: [فناجٍ مسَلَّمٌ و مَجروحٌ بِهِ، و مُحتَسَبٌ بِهِ، فَمنكوسٌ فيها] أخرجه: أحمد ((المسند)) (١١٠٨١) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن.

يُخردل...))[٣٩]، ((حتّى يَمُرُّ...آخِرُهُم...))[٤٠] الذي أُعطِيَ نُورُهُ على إبهامِ قَدَمِيهِ، يَحبوا على وجْهِه، و يَدَيهِ، و رِجلَيهِ...يَسحَبُ سحباً...في رواية: [لايستطيع السير الا زحفا][٤١]، تَخِرُّ رِجلٌ، و تَعَلَّقُ رِجلٌ: و يُصيبُ جوانِبَهُ النار، فلا يَزالُ كذلك حتى يَخلُصَ، فإذا خَلَصَ وَقَفَ عَليها: ثُمَّ قال: الحمدُ لله لَقدْ أعطانِيَ اللهُ ما لَمْ يُعطِ أحداً: إنْ نَجَّاني مِنها بَعدَ إذْ رَأيتُها))[٤٢].

واتە: (باوەڕدار دەپەڕێتەوە بەسەریدا وەك (چاو تروکانێك) (وەکو بریسکەی هەور وەکو بای بەهێز) وەك ئەستێرە (..... وەك ڕۆیشتنی باڵندە) وەك هەور وەك تیژی و (خێرایی) (ڕاکردنی ئەسپ دەبێت) (وەك خێرایی ئەسپ و وشتری چالاك و هی وایان هەیە تیَ دەپەڕێت وەك ڕاکردنی پیاو) و (هی وایان هەیە بە خێرا دەڕوات و هی وایان هەیە بە ڕۆیشتن دەڕوات و هی وایان هەیە بە گاگۆڵکێ دەڕوات و هی وایان هەیە لەسەر سنگ دەخشێت) (..... و هەتا کۆتاییەکەیان دەپەڕێتەوە بەسەریدا خۆی ڕادەکێشێت بە چۆن ڕاکێشانێك...وە هی وا یان هەیە بە سەلامەتی ڕزگار بووە، هی وایان هەیە بە بریندای ڕزگاری بووە، هی وا هەیە کەڵەکە بووە لەناو ئاگری دۆزەخ) و (.... هی وایان هەیە تیا دەچێت و هی وایان هەیە پارچە پارچە دەبێت و دەکەوێتە خوارەوە) (... هەتا کۆتاییەکەیان) ئەوە دەبێت کە نورەکەی لەسەر پەنجە گەورەکەی قاچی دەبێت بەدەم و دەست و قاچدا دەکەوێت و (ڕادەکێشرێت چۆن ڕاکێشانێك) و قاچێکی بەردەبێتەوە و قاچێکی تری پێوە دەبێت و ئەم لاو ئەو لای ئاگری بەردەکەوێت و بەردەوام دەبێت هەتا ڕزگاری دەبێت، کە ڕزگاری بوو دەوەستێت لەسەری ئینجا دەڵێت: سوپاس بۆ خوا بەڕاستی ئەوەی خوا بەمنی بەخشیوە بە هیچ کەسێکی نەبەخشیوە کە ڕزگاری کردم لێی دوای ئەوەی کە بینیم).

---

[٣٩] أخرجه: البخاري (٧٤٧٣).

[٤٠] أخرجه: البخاري (٤٩١٩).

[٤١] أخرجه: البخاري (٤٩١٩)، ومسلم (١٩٥).

[٤٢] أخرجه: الطبراني ((الكبير))(٩٧٦٣)، و الحاكم (٣٧٦/٢) وصححه و وافقه الذهبي، وصححه الشيخ الألباني ((مختصر العلو)) (٦٩) و ((شرح العقيدة الطحاوية)) (ص:٢٦٤)، و قال: حديث صحيح، وصححه الشيخ الأرناؤوط ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٦٠٦/٢) و قال: حديث صحيح، عن ابن مسعود مرفوعاً.

وە لەریوایەتێکی تردا هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((فَيخلُصونَ، فإذا خَلَصُوا قالوا: الحمدُ لله الذي نَجّانا مِنكَ بَعْدَ أنْ أرَناكِ، لَقدْ أعطانا الله ما لَمْ يُعطِ أحداً))[٤٣] واتە: (باوەڕداران ڕزگاریان دەبێت کە ڕزگاریان بوو دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئێمەی ڕزگار کرد لە دوای ئەوەی کە تۆمان بینی، خوای گەورە ئەوەی بە ئێمەی بەخشیوە بە هیچ کەسێکی نەبەخشیوە ، باوەڕداران خوای گەورە ڕزگاریان دەکات لە پەڕینەوەی پردی صراط و تووشی هیچ زیان نابن).

## ئەو کارانەی کە خاوەنەکەی ڕزگار دەکات لە سەر پردی صراط

**یارمەتی دانی موسڵمانان و ڕۆیشتن لەگەڵیاندا بۆ جێ بەجێ کردنی پێویستی یەکانیان:**

عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەی خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...وَمَنْ مشَى مع أخيهِ المُسلِم في حاجَتِهِ حتى يُثبِتَها لَهُ: أثبتَ اللهُ تعالى قَدَمهُ يومَ تَزِلُّ الأقدام...))[٤٤].واتە: (... و هەر کەسێك بۆ پێویستی برایەکی موسوڵمانی بڕوات تا بۆی جێگیر بکات خوای گەورە قاچی ڕاگیر دەکات لەو ڕۆژەدا کە قاچەکان هەڵدەخلیسکێن...).

وە موسوڵمان دەبێت ئاگاداری خۆی بێت کە موسوڵمانی تر لەگەڵیدا تاوانبار نەکات بە شتێك بۆ ئەوەی ناوبانگی خۆی پێ دەرکات، ئەنەس جەهەنی (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەی خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((من رمى مسلما بشيء يريد شينه به حبسه الله على جسر جهنم حتى يخرج مما قال))[٤٥] واتە: (هەر کەسێك موسڵمانێك تاوانبار بکات بە شتێك بۆ ئەوەی ناوبانگی خۆی پێ دەربکات خوای گەورە بەندی دەکات لەسەر پردی دۆزەخ هەتا بەڵگە دێنێت لەسەر ئەو وتەیەی کە وتویەتی).

---

[٤٣] أخرجه: الحاكم (٤/٥٩٠) و صححه.

[٤٤] أخرجه: ابن عساكر في ((تأريخ دمشق)) (١١/٤٤٤) و قال إسناده حسن، والطبراني ((الكبير)) (١٢٦٤٦) و حسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة))(٩٠٦)، و ((صحيح الجامع))(١٧٤).

[٤٥] أخرجه: أبو داود (٤٨٨٣)، و حسنه الشيخ الألباني في: ((صحيح أبي داود)) (٤٠٨٦).

## (قەنطەرە)ی دوای پردی صراط

موسوڵمانان کە دەپەڕینەوە لەسەر پردی صیراط دەگەنە پردێکی تر پێ ی دەوترێت (قەنطەرە) و لەم پردەدا کەس ناکەوێتە خوارەوە و لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ دایە .

ئیمامی قورطبی (رحمه الله) دەفەرموێت: ((إعْلَمْ رَحِمَكَ الله تعالى إنَّ في الآخِرة صراطين أحدهما مجازٌ لأهل المَحشر كلهم ثَقيلهم و خَفيفهم، إلاَّ مَنْ دَخلَ الجنة بِغير حِساب، و إلاَّ مَنْ يلتقِطهُ عُنقٌ مِنَ النار، فإذا خَلَصَ مَنْ خَلَصَ مِنْ هذا الصراط الأكبر الذي ذكرناهُ، ولا يَخلِصُ عنهُ إلاَّ المؤمنون الذين عَلِمَ الله مِنهُم أنَّ القِصاص لا يَستَنفِدُ حَسَناتهم حُبِسوا على صراط خاصٍ هُم ولا يَرجعُ إلى النار مِنْ هؤلاء أحدٌ إنْ شاء الله تعالى لأنَّهم قدْ عبروا الصراط الأول المَضروبِ على مَتنِ جَهَنَّم))[٤٦] واتە: (ئاگاداربە ڕەحمەتی خوات لێ بێت لە ڕۆژی کۆتاییدا دوو صراط هەیە: یەکێکیان ڕێگەی ڕۆیشتنە بۆ هەموو ئەهلی مەحشەر سوکیان و قورسیان تەنها ئەو خاوەن باوەڕانە کە خوا زانیویێتی تۆڵەسەندنەوە لێیان چاکەکانیان کەم ناکاتەوە، دوای ئەوە دەچن بۆ سەر قەنطەرە و لەسەر ئەو پردە تایبەتە ڕادەوەستێنرێن و هیچ لەوانە ناگەڕێتەوە بۆ ناو ئاگر (ان شاء الله) لەبەر ئەوەی ئەوان لە پردە گەورەکەی کە لە سەر دۆزەخ دانراوە پەڕیونەتەوە) .

ئیمامی سیوطی (رحمه الله) دەفەرموێت: (و المُختارُ أنَّهُ طرفَ الصِراطِ الذي يَلي الجَنة)[٤٧] واتە: (قسەی هەڵبژێراو سەبارەت بەم باسە ئەوەیە کە ئەو قەنطەرەیە بەشێکی پردی صراطە کە لە لای بەهەشتدایە).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم قەنطەرەی بەم شێوەیە باس کردووە: ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يخلُصُ المؤمنون مِنَ النّار، فَيُحبَسُون على قَنطَرةٍ بين الجنة و النار، فَيُقتَصُّ لِبعضهم مِنْ بعضٍ مَظالِمَ كانت بَينهم في

---

[٤٦] أنظر: ((التذكرة في أحوال الموتى و الأمور الآخرة)) (ص: ٣٣٩).

[٤٧] أنظر: ((البدور السافرة في علوم الآخرة)) ، كما في ((اللوامع)) (٢/١٩٠).

الـدنيا حتـى إذا هُـذِّبوا و نقُـوا: أُذِنَ لَهُـم في دَخـولَ الجنَّـة...))[٤٨] واتـە: (خـاوەن بـاوەڕان ڕزگاریان دەبێت لە ئاگرەکە ئینجا ڕادەوەستێنرێن لەسەر قەنطەرەکەی نێوان بەهەشت و دۆزەخ و لەوێدا تۆڵە لە هەندێکیان دەسەنرێت بۆ هەندێکیان لەو ستەمانەی کە لە نێوانیانـدا بووە لـە دونیـادا هـەتا بـە تـەواوەتی پـاك دەکرێنـەوە، ئینجـا ڕێگـەیان پـێ دەدرێت بۆ چوونە ناو بەهەشت).

لەم قەنطەرەیەدا تۆڵە سەندنەوە بەکارە چاکەکان دەبێت کەلە دونیـادا کـراوە ئـەبو هوڕەیرە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبـەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: ((مَـنْ کانـت عِندَهُ مَظلمةٌ لأخيهِ مِنْ عِرضِهِ و مالِهِ فليستحِلهُ مِنهُ اليوم قبلَ أنْ لا يكـون دينـارٌ ولا دِرهَـم، فـإنْ كان له عملٌ صالِحٌ أُخِذَ مِنهُ بِقَدَرِ مَظْلَمَتِهِ، فإنْ لَمْ تكُن لَهُ حَسناتٌ أُخِذَ مِنْ سيئاتِ صاحِبِهِ فَحُمِـلَ عليــه))[٤٩] واتـە: (هـەر کەسێك ستەمێکی لایـە کـە کردوویـەتی بەرامبـەر براکـەی لـە کەسایەتی و ماڵێکدا با ئەمڕۆ بیداتەوە و گەردنی خۆی پـێ ئازاد بکات پێش ئـەوەی دینار و درهەم نەمێنێت، ئەگەر کارێکی چاکەی هەبێت لێی وەردەگیرێت بە ئەنـدازەی ستەمەکەی کـە کردوویـەتی و ئەگـەر چـاکەکانی نـەما خراپـەکانی بەرامبەرەکـەی هەڵدەگرێت و دەخرێتە سەری).

هەروەها ئەم تۆڵـە سەندنەوەیە قـەرزاریش دەگرێتـەوە کە قەرزەکەی نەدابێتـەوە بە خاوەنەکەی لە دونیادا، ئیبنو عومەر (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: ((... مَنْ ماتَ و عَليهِ دَيْـنٌ، فَلَيسَ ثَـمَّ دينـارٌ ولا دِرهَـمٌ، و لكنَّهـا الحَسـناتُ و السيئاتُ))[٥٠] واتە: (... هەر کەسێك بمرێت و قەرزی لەسەر بێت لەوێ دینار نی یە و درهەمیش نی یە، بەڵکو بەچاکەکان و خراپەکانە).

---

[٤٨] أخرجه: البخاري (٢٤٤٠)(٦٥٣٥)، أحمد(١٣/٣)،والبخاري((الأدب المفرد))(٤٨٦)،و الحاكم (٣٥٤/٢) صححه على شرطهما و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الالباني في ((صحيح الأدب المفرد))(٣٧٥).

[٤٩] أخرجـه: أحمـد (٤٣٥/٢)، والبخـاري (٢٤٤٩)، والترمـذي (٢٥٣٤) بمعنـاه،وانظر: ((صـحيح الجـامع)) (٦٥١١).

[٥٠] أخرجه: أحمد (٧٠/٢)، و الحاكم (٢٧/٢) وصححه و وافقـه الذهبـي، و حسـنه المنـذري في ((الترغيـب)) (٣٤/٣)، وصححه شيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص:٥).

ئالەو جێگەیەدا خوای گەورە ڕق و کینە و بوغز وحەسوودی بردن و دووبەرەکی لەسنگی باوەڕداراندا دەردەهێنێت و وەك برایان لێ دێت بۆ ئەوەی باش ئامادەبن بۆ چوونە ناو بەهەشت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ (الحجر: ٤٧).

ئیبنو کثیر (ﷺ) لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ((...و قد روي سعيد في تفسيره حدثنا عن فضالة عن لقمان، عن أبي أمامة (ﷺ) قال: لا يَدخُلُ مؤمنٌ حتى يَنزع الله ما في صدرهِ مِنْ غلٍ حتى يَنزعَ مِنهُ مثل السبع الضاري))[٥١] واتە: (... سەعید لە تەفسیرەکەیدا گێڕاویەتیەوە لە فوضالەوە ئەویش لە لوقمانەوە کە ئەبو ئومامە (ﷺ) فەرموویەتی: (باوەڕدار ناچێتە ناو بەهەشت تا خوای گەورە چی ڕق و کینەیەك لەسنگیدا هەیە دەری نەهێنێت کە وەك ئاژەڵێکی دڕندەوایە)

---

[٥١] أنظر: ((تفسير القرآن العظيم)) (٣/٤٠١).

# حەوزی کەوثەر

خوای گەورە ڕێز دەبەخشێت بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە ڕۆژی کۆتاییدا بەوەی کە بە هەموو پێغەمبەرێك حەوزێك دەبەخشێت تاکو ئومەتی ئەو پێغەمبەرە لێی بخواتەوە و بەتایبەت لە نێوانیاندا پێغەمبەری خۆمان (محمد) (ﷺ) کە خوای گەورە ڕێزی لەوان زیاتر پێ دەبەخشێت بەوەی حەوزی کەوثەری تایبەتی پێ دەبەخشێت.

## حەوزی کوثەر لەکوێ یە ؟

سەبارەت بە شوێنی حەوزی کەوثەر دوو بۆ چوونی جیاواز هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** حەوزی کەوثەر لە مەحشەردایە و خاوەن باوەڕان لێی دەخۆنەوە پێش چوونیان بۆ سەر پردی صراط.

ئیمامی قورطبی (رحمه الله) دەفەرموێت: ((... و أختُلِفَ في الميزانِ و الحَوضِ أيُّهما يَكونُ قَبلَ الآخر، فقيلَ: الميزانُ قبلُ: و قيلَ: الحوضُ، قال أبو الحسن القابَسي: (و الصحيح أنَّ الحوضَ قبلُ)، و المَعنى يَقتَضيهِ فإنَّ النّاسَ يَخرجونَ عِطاشاً مِنْ قُبورِهِم ... فَيقدم قبلَ الصراط و الميزان، قال أبو حامد الغزالي في كتاب ((كشف علوم الآخرة)): (حَكى بعضُ السَلف مِنْ أهل التَصنيف، أنَّ الحَوضَ يُورَدُ بعدَ الصِراط، وهو غلَطٌ من قائلِهِ)، وهو كما قال.. و الصحيح أنَّ الحَوضَ قبلَ الصراط))[1] واتە: (جیاوازی هەیە سەبارەت بە تەرازوو حەوز کە کامیان پێش کامیانە، هەندێك دەڵێن: (ڕاست وایە کە حەوزی کەوثەر لە پێشەوەیە) و ماناکەش هەر ئەوە دەگەیەنێت چونکە خەڵکان بە تینوێتی دێنە دەر لە گۆڕەکانیان لەبەر ئەوە حەوزی کەوثەر لەپێش صراط و تەرازووە، و غەزالیش لە کتێبەکەیدا (کشف علوم الاخرة) وتویەتی: (گێڕاویەتیەوە لە هەندێك لەو پێشینانەی کە خاوەن نووسین بوون کە وتویانە حەوزەکە لەدوای پردی (صراط)ە وەیە بەڵام ئەمە هەڵەیە کە خاوەنەکەی وتویەتی)، هەر ئەوەیە کە ئەم وتویەتی..... کەوابوو ڕاست وایە کە حەوزی کەوثەر پێش پردی (صراط)ە.

---

[1] القرطبي في ((التذكرة في علوم الآخرة)) (١/٣٠٢).

زانا ئیبن ئەبو العز (رحمه الله) لەسەر ئەم بۆچوونەیە و دەفەرموێت: ((... و الحَوضُ في العَرصاتِ قَبلَ الصراطِ، لأنَّهُ يُختَلَجُ عنهُ و يُمنَعُ مِنهُ أقوامٌ قدْ ارتَدوا على أعقابِهم، و مِثلُ هؤلاء لا يُجاوِزون الصراط))[٢] واتە: (حەوزی کەوثەر لەمەحشەردایە پێش پردی صراط، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك لە حەوزی کەوثەر دوور دەخرێنەوە و دەفڕێنرێن چونکە پاشگەز بوونەتەوە، و ئەمانە پردی صراط نابڕن و بەسەریدا تێناپەڕن) .

ئیمامی قەسطلاني (رحمه الله) لە کتێبی (ارشاد الساري) دوای هێنانی فەرموودەکەی کە باس لە دوور خستنەوەی پاشگەز بووەکان دەکات لە حەوزی کەوثەر و بردنیان بەرەو ئاگری دۆزەخ، دەڵێت:...(بَعد إيرادِهِ حديث ردّ جماعةٍ عن الحوضِ) ((فأقولُ أينَ؟ فيقولُ إلى النار ...)) قال: و ذلك كالصريح في أنَّ (الحوض) في الموقفِ قبلَ الصراط و الله أعلم))[٣] واتە: (ئەمە ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە حەوزی کەوثەر لە مەحشەردایە پێش پردی صراط، والله اعلم).

هەروەها شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە (رحمه الله) دەفەرموێت: ((... و في عرصة القيامةِ الحوضُ الموروُدُ لِمُحمدٍ (ﷺ)..))[٤] واتە: (... حەوزی کەوثەر لە مەحشەردایە کە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە(ﷺ)).

**بۆچوونی دووەم: حەوزی کەوثەر دوای پردی (صراط)ە:**

خاوەنی ئەم بۆچوونەش (قاضي عیاض)ەو هەندێك لە پێشینەکان و ئیبنو حەمدان و ئیبنو حەجەری عەسقەلانی و سیوطي یە (رحمهم الله): وەکو چۆن ئیمامی سەفارینی لێیان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ((...و رَجّحَ القاضي عياض أنَّ الحوضَ بعد الصراطِ.. وقال ابن حمدان: يَشرَبُ مِنهُ المؤمنون قبلَ دخولِ الجنّة و بعد جَوازِ الصِراط .... و قال السيوطي: و قد وَرَدَ التصريحُ في حديثٍ عند الحاكم و غَيرِهِ بأنَّ الحوضَ بعد الصراط))[٥] واتە: (قاضي عیاض بەپەسەندی زانیوە کە حەوزی کەوثەر دوای پردی صراط بێت..... وە ئیبنو حەمدان دەڵێت خاوەن باوەڕان لە حەوزی کەوثەر دەخۆنەوە دوای

---

[٢] انظر: ((شرح العقيدة الطحاوية)) لابن أبي العزّ (١/٢٧٩).

[٣] أنظر: ((إرشاد الساري)) (٩/٣٣٥).

[٤] أنظر: ((الفتاوى الكبرى)) (٣/١٤٥).

[٥] أنظر: ((لوامع الأنوار البهية)) (٢/١٩٥).

بڕینی پردی صراط و پێش چوونە ناو بەهەشت.... و سیوطیش (رحمه الله) دەڵێت: ئەمە ڕوون و ئاشکرا بە لە فەرموودەیەکدا لای ئیمامی حاکم و ئەوانی تر کە دەڵێن: حەوزی کەوثەر لەدوای پردی (صراط)ە).

زانا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (رحمه الله) دەفەرموێت: ((ظاهِرُ الأحاديثِ أنَّ الحَوضَ بِجانبِ الجنة لينصب فيه الماءُ مِنْ النَّهرِ الذي داخِلُها، فلو كان قبلَ الصراط لَحالَتْ النار بَينَهُ و بين الماءِ الذي يَصبُ مِن الكوثر فيهِ، وأمَّا ما أورد عليهِ مِنَ أنَّ جماعةً يدفعون عن الحوضِ بعد أنْ يَروهُ و يذهب بِهِم إلى النارِ فَجوابُهُ: أنَّهُم يُقرَّبونَ مِنَ الحَوضِ بحيثُ يَرونَهُ و يرونَ الجنة فَيُدفَعونَ في النارِ قَبلَ أنْ يَخلَصوا مِنْ بَقيةِ الصراطِ...))[٦]. واتە: (ڕووکەشی فەرموودەکان ئەوە دەگەیەنن کە حەوزی کەوثەر لە تەنیشت بەهەشتدایە و لە ڕووباری کەوثەری بەهەشتەوە ئاوەکە دەڕژێتە ناو حەوزی کوثەر: ئەگەر پێش پردی صراط بوایە ئەوا ئاگری دۆزەخ ڕێگر دەبوو لەنێوان ئەو ئاوەی کە لە بەهەشتەوە دەڕژێتە ناو کەوثەر، بەڵام ئەوەی کە هاتووە سەبارەت بەوەی کۆمەڵێك لە حەوزی کەوثەر دوور دەخرێنەوە دوای ئەوەی کە حەوزی کەوثەر دەبینن و دەیانبەن بۆ دۆزەخ وەڵامی ئەوەیە کە ئەوان نزیك دەکرێنەوە لە حەوزەکە و بەهەشت دەبینن ئینجا دوور دەخرێنەوە لێی و دەبرێنە ناو دۆزەخ پێش ئەوەی کە هەموو پردی صیراط ببڕن...).

واپێ دەچێت کە بۆچوونی دووەم نزیکتربێت لە ڕاستی یەوە و هەروەها ئیمامی بوخاری (رحمه الله) لە ڕیز کردنی باسەکانیدا لە کتێبەکەیدا فەرموودەکانی سەبارەت بە حەوزی کەوثەری باس کردووە پێش فەرموودەکانی شەفاعەت و تەرازوو (المیزان).... هەروەها پێ دەچێت کە فەرموودەکەی (ئەنەس)یش بەڵگە بێت لەم بارەیەوە، ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((سألتُ رسول الله (ﷺ) أن يَشفَعَ لي يوم القيامة فقال: ((أنا فاعِل)) قال (أنس) قُلتُ: يا رسول الله فأينَ أطلُبُكَ؟ قال: ((أطلُبني أوَّلَ ما تُطلبُني على الصراط))، قُلتُ: فإنْ لم ألقكَ قال: ((... فاطلُبني عندَ الحوضِ فإني لا أخطيء هذه الثلاثَ مَواطِن))[٧].واتە: (داوام کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە تکام بۆ بکات لە ڕۆژی کۆتاییدا و ئەویش فەرمووی: (من تکات بۆ دەکەم)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە

---

[٦] أنظر: ((فتح الباري)) (١١/٤٦٦).

[٧] أخرجه: الترمذي (٢٤٣٣)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨١).

کویٚ داوات بکەم ؟ فەرمووی: (داوام بکە یەکەم جار کە داوام دەکەی لەسەر پردی صیراط) وتم ئەگەر پێت نەگەیشتم فەرمووی: (داوام بکە لای حەوزی کەوثەر..... چونکە من ئەو سیٚ جێگەیەم لیٚ هەڵە نابێت)

پیٚ دەچێت خاوەنەکانی بۆچوونی یەکەم حەدیثەکەی (ابن عباس) یان کردبێت بە بەڵگە کە پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەوەستان لەبەردەم خوای گەورەدا ئایا ئاوی تیادایە ئەویش فەرموویەتی: ((أي و الذي نفسي بِيَدِهِ إنَّ فِيهِ لَماءً)) واتە: (بەڵیٚ سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئاوی تیادایە ، بەلاّم ئەم فەرموودەیە (فەرموودەیەکی ضعیف)ە وەك ئیبن کثیر لە (البداية والنهاية)دا لە (١/ ٣٧٠) دەفەرموێت: ئەمە فەرموودەیەکی سەرسوڕهێنەرە لەم بارەیەوە).

و قسەی قرطبی (رحمه الله) کە دەڵێت: (حەوزی کەوثەر لە پێش پردی (صراط)ە چونکە خەڵکان لە گۆڕەکانیان دێنەدەر تینویان دەبێت لەبەر ئەوە حەوزەکە پێش تەرازوو و (صراط)ە) بەلاّم ئەم وتەیە ئیمامی سیوطي وەلاّمی داوەتەوە وەك چۆن ئیمامی سەفارینی لێی دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: ((...فإنْ قيلَ إذا أخلصوا من الموقِف دخلوا الجنة فَلَمْ يحتاجوا إلى الشُربِ مِنهُ، فالجوابُ، بل يحتاجون إلى ذلِكَ، لأنَّهُم مَحبوسُونَ هناكَ لأجلِ المَظالِمِ فكانَ الشُربُ في موقِف القصاص))[٨] واتە: (ئەگەر بوترێت خەڵکان ڕزگاریان دەبێت لە مەحشەر و دەچنە ناو بەهەشت ئەوجا پێوستیان بە ئاو خواردنەوەی حەوزەکە نابێت وەلاّمی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە بەڵکو پێویستیان بە ئاوی حەوزی کەوثەر هەیە چونکە ئەوان لەویٚ ڕاوەستێنراون بەهۆی کارە ستەمکارەکانیانەوە کەوابوو لێی دەخۆنەوە لە شوێنی تۆڵە سەندنەوە).

[٨] أنظر: ((لوامع الأنوار البهية)) (٢/ ١٩٥).

# چۆنیەتی حەوزی کەوثەر

**یەکەم: درێژی و پانی و گەورەیی حەوزی کەوثەر.**

**ئیبن ئەبو العز (رحمه الله) دەفەرموێت:** ((..و الذي يَتَلَخَصُ مِنْ الأحاديثِ الوارِدة في صِفةِ الحوضِ: إنَّهُ حَوضٌ عَظيمٌ، و مورِّد كريمٌ: يُمَدّ مِنْ شرابِ الجنة، مِنْ نَهرِ الكوثرِ، وهوَ في غايةِ الإتساعِ عرضُهُ و طولُهُ سواءٌ))[٩] **واتە: (ئەوەی کە بۆمان دەردەکەوێت لەم فەرموودانە لە وەسفی حەوزی کەوثەردا: ئەوەیە کە حەوزێکی گەورەیە،وە جێگەیەکی زۆر بەرێزە لە ڕووباری کەوثەری بەهەشتەوە ئاوی بۆ دێتە ناو و حەوزێکی زۆر فراوانە درێژی و پانی وەك یەکە، وە خوای گەورە خەلاَتی هەرە گەورە دەبەخشێت بە پێغەمبەر (ﷺ) لەناو پێغەمبەراندا بەوەی کە حەوزی تایبەتی (الکوثر)ی پێ دەبەخشێت: وەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ﴾ (الكوثر: ١)، **و خوای گەورە ئەو حەوزەی هەر لە ژیانی دونیادا نیشانی پێغەمبەری خۆی داوە(ﷺ) وەك عوقبەی کوڕی عامر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:** ((إنَّ النبي (ﷺ) خَرَجَ يوماً فَصلّى على أهلِ أُحدٍ صلاتَهُ على الميّت كالمُوّدِعِ للأحياءِ و الأموات، ثُمَ انصرفَ إلى المِنبَرِ فقال: ((إنّي فَرطُكُم و إنّي شهيدٌ عَليكُم، و إنّي و اللهِ لأنظُر إلى حوضيَ الآنَ ...))[١٠] **واتە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێك چووە دەر و نوێژی کرد لەسەر شەهیدەکانی ئوحود نوێژی مردوو، وەك خواحافیزی‌یەك لە زیندووان و مردووان پاشان گەڕایەوە سەر مینبەر و فەرمووی: من پێشتان دەکەوم و من شاهیدم بەسەرتانەوە، واللە من ئا ئێستا تەماشای حەوزەکەم دەکەم...).**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە پانی و درێژی و گەورەیی حەوزی کەوثەر لە چەند فەرموودەیەکدا ڕوونی کردۆتەوە و درێژی و پانی یەکەی بەچەند ئەندازەیەك دیاری کردووە ئەو فەرموودانەش بەم جۆرەن:-**

---

[٩] أنظر: ((شرح العقيدة الطحاوية)) (١/٢٨٠).

[١٠] أخرجه: البخاري (٦٥٩٠)، و مسلم (٢٢٩٦).

**یەکەم: لەنێوان ئیله و صەنعاء.**

ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ قَدرَ حوضي كما بينَ إيلةَ و صنعاءَ مِنَ اليمن))[11] واتە: (ئەندازەی حەوزەکەم هێندەی نێوان ئیله و صنعایە لەیەمەن).

**دووەم: نێوان مەدینە و صەنعاء.**

حاریثەی کوڕی وەهەب (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی ((... كما بين المدينة و صَنعاء..))[12] واتە: (... هێندەی نێوان مەدینە و صەنعایە...).

**سێیەم: نێوان مەدینە و عەممان.**

ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...ما بين ناحِيَيْ حوضي.. كما بين المدينةِ و عَمّانَ))[13] واتە:(... نێوان ئەم لاو ئەو لای حەوزەکەم....... هێندەی نێوان مەدینەو عەممانە).

**چوارەم: نێوان ئیله و شاری مەککە.**

جابر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... الحوضُ ما بين؟ إيلة إلى مَكة..))[14] واتە: (... حەوزەکەم هێندەی نێوان ئیلەیە تا مەککە).

**پێنجەم: نێوان عەدەن بۆ عەممان.**

یەزیدی کوڕی ئەخنەس (ﷺ) دەفەرموێت: ((قُلتُ يا رسول الله: ما سِعةُ حوضِكَ؟ قال: ((كما بين عدَنْ إلى عمان...))[15] واتە:(وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فراوانی حەوزەکەت چەندە ؟ فەرمووی: (هێندەی نێوان عەدەنە تا عەممان....)) لە ڕیوایەتەکەی ثەوبان

---

[11] أخرجه: البخاري (٦٥٨٢).

[12] أخرجه البخاري (٦٥٩١).

[13] أخرجه: أحمد (١٣٣/٣)، و مسلم (٤٢، ٢٣٠٣).

[14] أخرجه: أحمد (٣٨٤/٣)، و البزار (٣٤٨١)، و ابن حبان (٦٤٤٩) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[15] أخرجه: أحمد (٢٥٠/٥)، و الطبراني في ((الكبير)) (٧٦٧٢)، و ابن حبان (٦٤٥٧) و قال محققه: إسناده صحيح.

دا(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((حوضي مِنْ عَدنَ إلى عمّان البلقاء...))[١٦] واتە: (حەوزەکەم لە عەدەنەوەیە تا عەممانی بەلقاء...).

**شەشەم:** نێوان کەعبە و قودس.

ئەبو سەعید (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ لي حوضاً ما بينَ الكَعبةِ و بيتِ المَقدِس...))[١٧] واتە: (حەوزێکم هەیە هێندەی نێوان کەعبەیە بۆ (بیت المقدس)).

**حەوتەم:** نێوان مەدینە و جەرباء و (ئەزرەح)ە لە شام.

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((عِرضه مثل بينِكُم و بين جرباء و أذرَح...))[١٨] واتە: (پانیەکەی نمونەی نێوان ئێوەو نێوان جەرباء و ئەزرەحە...)، زاراوەی (جەرباء)و(ئەزرەح) لە (صحيح البخاري)دا هاتووە ژمارە (٦٥٧٩).

ئەو ڕیوایەتانە دژایەتی یەکتر ناکەن و زانای بەڕێز ئیبنو حبان لە (صحیح)ە کەیدا (٣٦٣/١٤) دەفەرموێت: ئەم فەرموودانە دژایەتی یەکتر ناکەن..... چونکە ئەوانە چەند وەڵامێکن لەسەر چەند پرسیارێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو فەرموودەیەکدا ڕوویەك لە ڕووەکانی حەوزەکەی ڕوون کردۆتەوە کە ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە، ماوەی نێوان صەنعاء بۆ مەدینە ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە بۆ کەسێك پەلەی نەبێت، و لە ئیلەوە بۆ مەککەش هەروەها، لە مەدینەوە بۆ عەممانی شامیش هەروەها.......).

ئیمامی سەفارینی (رحمه الله) جۆرا و جۆری ئەم فەرموودانە زیاتر ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت: (..قال بعضُ العُلماء: و هذا الإختلافُ و الإضطِرابُ لا يُوجِبُ الضَعفَ لأنَّ الصَحابة قد سَمِعوهُ في مَواطن مُتَعدِدَة، و كان النبيُّ(ﷺ) يُمَثِّلُ لِكلِّ قومِ الحوضَ بِحسبِ ما يَعلم

---

[١٦] أخرجه: الترمذي (٢٤٤٤) و قال: حديث غريب، و ابن ماجة (٤٣٠٣)، و الطبراني ((الكبير))(١٤٧/١)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٩)، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٧٢)، و في ((الظلال)) (٧٤٧).

[١٧] أخرجه: ابن ماجة (٤٣٠١)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٧٠).

[١٨] أخرجه: عبدالكريم بن الهيثمي في ((فوائده)) بِسَنَدٍ حسن، كما قال الحافِظ في ((الفتح)) (٤٧٢/١١).

المُتكَلِمُ و يفهِم السائل))[١٩]. واتە: (هەندێ زانایان وتویانە ئەم جیاوازیانە نابنە لاوازی کردنی ئەو فەرمودانە چونکە صەحابیەکان لە چەند جێگەیەکی جۆرا و جۆردا گوێیان لێ بووە، و پێغەمبەری خواش (ﷺ) نمونەی حەوزەکەی بۆ هەر کۆمەڵێك بە گوێرەی زانینی قسەکەرەکە بووە و بەشێوەیەك کە پرسیارکاری پێ تێ بگەیەنرێت).

دەتوانرێت ماوەی حەوزی کەوثەر دیاری بکرێت بەوەی کە درێژی و پانیەکەی ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە هەموو لاکانیشی وەك یەك وان: ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:: ((... حوضي مَسيرة شهرٍ زواياهُ سواءٌ))[٢٠]. واتە: (حەوزەکەم ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە هەموو گۆشەکانیشی یەکسانن)، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: ((...عرضه مِثلُ طولِهِ..))[٢١]. واتە: (... پانیەکەی وەك درێژی یەکەی وایە..).

## دووەم: چۆنیەتی ئاو وکوپ و پێویستیەکانی حەوزی کەوثەر

ئاوی حەوزی کەوثەر وەك ئاوەکانی تر نی یە کە خوای گەورە دروستی کردوون لە دونیادا بەڵکو ئەو ئاوە لە ئاوی ڕووباری کەوثەرە کە لە بەهەشتدایە و خوای گەورە بەخشیوێتی بە پێغەمبەری (ﷺ) و ئاوی کەوثەر ئاوێکە سپی ترە لە شیر و ساردترە لە سەهۆڵ و شیرین ترە لە هەنگوین و نەرمترە لە پەنیر و بۆن خۆشترە لە میسك.

عەبدولای کوڕی عەمر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... حوضي مَسيرةُ شهرٍ، ماءُهُ أبيضُ مِنَ الثَلجِ..))[٢٢] واتە: (...حەوزەکەم ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە ئاوەکەی سپی ترە لەبەفر..)، لە ڕیوایەتێکدا ثەوبان (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ماءُهُ أشدُّ بياضاً مِنَ اللّبنِ، و

---

[١٩] أنظر: ((لوامع الأنوار البهية)) (٢/٢٠١).

[٢٠] أخرجه: البخاري (٦٥٧٩).

[٢١] أخرجه: مسلم (٢٣٠٠).

[٢٢] أخرجه: البخاري (٦٥٧٩).

أحلـى مِـنَ العسـل...))[٢٣] واتـە: (ئاوەکەی سپی تـرە لـە شیر و شیرینتر وخۆشترە لـە هەنگوین...)، هەروەها ئیبنو عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... و رِيحُهُ أطيبُ مِن المِسكِ..))[٢٤] واتە:(... بۆنی خۆشترە لە میسک..)، و لـە ڕیوایەتێکـدا ئـەبو بـرزە (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: ((و مـاءهُ أبْـردُ مِـنَ الـثَلج و ألـينُ مِـنَ الزَّبَـدِ))[٢٥] واتـە: (ئاوەکەی ساردترە لەسەهۆڵ و نەرمترە لە کەرە)، وە لە ڕیوایەتێکدا: ((... مَنْ شرِبَ مِنهُ شربةً لَمْ يظمأ بَعـدها أبـداً..))[٢٦] واتـە: (... هـەر کەسـێ قومێکی لێ بخواتـەوە دوای ئـەوە هـەرگیز تینـووی نابێت..).

ئەبو ذەر (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: ((... لَـمْ يَظمأ آخِرَ ما عَليهِ...))[٢٧] واتە: (... تینوی نابێت دوای ئەوە هەتا هەتایە...)، یەزیدی کوڕی ئەخنـەس (ﷺ) دەگێڕێتـەوە لە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: ((مَـنْ شَرِبَ مِنهُ لَمْ يَظمأ أبداً و لَمْ يُسَود و جْههُ أبداً))[٢٨] واتە: هەر کەسێك لێی بخواتەوە هـەرگیز تینوویەتی تووش نابێت و هەرگیز ڕووی ڕەش نابێت).

---

[٢٣] أخرجه: أحمد (٥/٢٨٠) (٥١٩٣) وقال محققه: حديث قوي، و الطبراني ((الكبير)) (١/١٤٧)، و الترمذي (٢٤٤٤) و قال: حديث غريب، و ابن ماجة (٤٣٠٣)، و الحاكم (٤/١٨٤) و صححه و وافقه الذهبي، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٩)، و في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٧٢)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (١٠٨٢)، و ((الظلال))(٧٤٧)، و((صحيح الجامع))(٣١٦)، و((المشكاة)) (٥٥٩٢).

[٢٤] أخرجه: البخاري (٦٥٨١).

[٢٥] أخرجه: أحمد (٤/٤٢٤)، و أبو داود (٤٧٤٩)، و الحاكم (١/٧٦) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي، و ابن حبان (٦٤٥٨) و قال محققه: إسناده حسن.

[٢٦] أخرجه: أحمد (٢٢٨٢٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، الترمذي (٢٤٤٤)، وابن ماجة (٤٣٠٣) و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترمذي)) (١٩٨٩)، ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٧٢).

[٢٧] أخرجه: مسلم (٢٣٠٠).

[٢٨] أخرجه: أحمد (٥/٢٥٠) (٢٢١٥٦) وقال محققه: صحيح، و الطبراني ((الكبير)) (٧٦٧٢)، و ابن أبي عاصم في ((السنة)) (٧٢٩،٥٨٨) و قال محققه: إسناده صحيح.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیفەتی (کوب)ەکانی چواردەوری ئەم حەوزەی بۆ باس کردووین لەم فەرموودانەدا، ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((..تُرى فِيهِ (أي الحوض) أباريقُ الذّهبِ و الفِضّة كَعَددِ نُجومِ السماءِ أو أكثر..))[٢٩] واتە: (.. دەبینیت تیایدایە سوراحی ئاڵتون و زیو بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئەستێرەکانی ئاسمان یان زیاتر..).

لە ڕیوایەتێکدا کە ئیمامی عومەر (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((..وكِيزانُهُ [ و أكاويبُهُ عدَدَ نُجوم السّماءِ][٣٠]))[٣١] واتە: (وە کوبەکانی بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە) .

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو زەڕی غەفاری (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((.. و الذي نَفسُ مُحمدٍ بِيَدِه لآنِيَتُهُ أكثَرُ مِنْ عددَ نجومِ السّماء في الليلةِ المُظلِمةِ المُصَحيَةِ مِنْ آنيةِ الجنّةِ...))[٣٢] واتە: (.. سوێند بەوەی کەنەفسی موحەمەدی بەدەستە جام وپەرداخەکانی زیاترە لە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان لە شەوێکی تاریکی سایەقەدا جام و پەرداخەکانی لە بەهەشتەوەیە...).

## سێیەم: ئاوی حەوزی کەوثەر لە ئاوی ڕووباری کەوثەری بەهەشتەوە دێت.

ئاوی حەوزی کەوثەر وەرگیراوە لە ڕووباری کەوثەری ناو بەهەشت، و کەوثەر ڕووبارێکە لە بەهەشت خوای گەورە بەخشیویەتیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەهەشت دا، ئەو ڕووبارەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە میعراجدا بەرچاوی کەوت و پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی حەوزی کەوثەری بەم جۆرە کردووە:

---

[٢٩] أخرجه: مسلم (٤٣).

[٣٠] اخرجه: الترمذي (٢٤٤٤)، و ابن ماجة (٤٣٠٣) وهو حديث صحيح.

[٣١] خرجه: البخاري (٦٥٨١).

[٣٢] أخرجه: مسلم (٢٣٠٠)،و أحمد (٢١٣٢٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، و الترمذي (٢٤٤٥) و قال حديث حسن صحيح غريب، وصححه الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٩٠).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((الكوثر نَهرٌ في الجنّة تَجري على وجهِ الأرضِ))[٣٣] واتە: (کەوثەر ڕووبارێکە لە بەهەشتدا دەڕوات بەسەر ڕووی زەویدا)، و لە ڕیوایەتێکدا: ((..جَرياً ليس بمشقوقٍ..))[٣٤] واتە: (دەڕوات بێ ئەوەی پێویستی بە چاڵ و جۆگە بێت) لە ڕیوایەتێکی تردا: ((.. و لَمْ يُشَقق شقاً...))[٣٥] واتە: (وەجێ ڕۆشتنەکەی هیچ جۆرێ درز و چاڵیەکی تیا نی یە)، هەروەها لە ئیبنو عومەر (ﷺ): ((..حافَّتاهُ مِنْ ذَهبٍ))[٣٦] واتە:(لێوارەکانی ئاڵتوونە)، لە ئەنەسەوە (ﷺ): ((..حافّتاهُ قِبابُ الدُرِّ المُجَوفِ))[٣٧] واتە: (لێوارەکانی قوبەی دووڕی ناو بۆشە) ، و لە ڕیوایەتێکی تردا: ((حافَتاهُ قِبابَ اللؤلؤ))[٣٨] واتە: (لێوارەکانی قوبەی مرواریە) ، لە ڕیوایەتێکی تردا: ((حافَتاهُ قِبابُ اللؤلؤ المُجوَّف..))[٣٩] واتە: (لێوارەکانی قوبەی مرواری ناو بۆشە..).

ڕۆیشتنی ڕووبارەکە بەسەر مرواری و دوڕ دایە وەك لە حەدیثەکەی ئیبنو عەباسدا (ﷺ) هاتووە: ((... مَجراهُ على الياقوتِ و الدُّرِ..))[٤٠] واتە: (... ڕۆیشتنەکەی بەسەر یاقوت و دوڕدایە..)، لە ڕیوایەتێکی تردا: ((.. حَصباؤهُ اللؤلؤُ..))[٤١] واتە: (...چەو و زیخەکانی مرواری یە ..)، لە ڕیوایەتێکی تردا: ((... و تُربَتُهُ أطيَبُ مِنَ

[٣٣] أخرجه: أحمد (٣/١٥٢)، و ابن حبان (٦٤٧١) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٣٤] أخرجه: البزار (٣٤٨٨) بإسناد حسن كما قال المنذري في: (الترغيب) (٥٣٠٠)، وأحمد (٣/١٥٢)، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٢٥١٣)، و((صحيح الترغيب))(٣٦١٩) .

[٣٥] أخرجه: أحمد (٣/١٥٢)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٥١٣).

[٣٦] أخرجه: أحمد (٥٩١٣) وقال محققه: حديث قوي، والحاكم (٣/٥٤٣)، والطيالسي (١٩٣٣)، ابن ماجة (٤٣٣٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٩٨)، و في ((المشكاة)) (٥٦١٤).

[٣٧] أخرجه: البخاري (٦٥٨١).

[٣٨] أخرجه: ابن حبان (٦٤٧٣) و قال محققه: صحيح على شرط مسلم، و الحاكم (١/٧٩) وصححه و وافقه الذهبي.

[٣٩] أخرجه: البخاري (٤٩٦٤).

[٤٠] أخرجه:أحمد (٥٩١٣) وقال محققه: حديث قوي، ابن ماجة (٤٣٣٤)،، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٩٨)، و في ((المشكاة)) (٥٦٤١).

[٤١] أخرجه: أحمد (٣/١٥٢)،. و ابن حبان (٦٤٧١) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

المِسـكِ))[٤٢] واتـه: ... و بۆنی خاکەکەی خۆشتره له میسك، و له ڕیوایەتێکی تـردا: ((...طينُهُ مِسكٌ إذفَرٌ...))[٤٣] واته:(... قوڕەکەی بۆن خۆشتره له میسکی ئیذفەڕ...).

له ڕیوایەتێکی تردا که باس له ئاوەکەی دەکات بەم جۆرەیە: ((أشَدُّ بياضاً مِنَ اللَّـبَنِ، و أحلى مِنَ العَسَلِ، فِيها طَيورٌ أعناقُها كأعناقِ الجُزُرِ)) قال عمر: إنَّ هذه لَناعِمة[٤٤]، قال رسول الله (ﷺ) ((أكلتها أحسَنُ (أنعَمُ) مِنها))[٤٥] واته: (ئاوەکەی سپی تره له شیر و شیرینتره له هەنگوین و چەند (باڵندەیەکی تێدایە) ملیان وەك ملی وشتر وایە)، عومەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڕاستی ئەوانە زۆر له خۆشیدان)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (بخۆرەکەی چاکتره و نیعمەت پێ دراوتره و زیاتر له خۆشیدایە).

ئاوی کەوثەر دەڕژێتە ناو دوو پلوسکەوە که هەردوکیان دەڕژێنە ناو حەوزی کەوثەرەوە: وەك ئەبو ذەڕ (ﷺ) دەگێڕێتەوە له پێغەمبەری خواوە (ﷺ) که فەرموویەتی: ((يَشخَبْ ((يَنبَعِثُ))[٤٦] ((يغث))[٤٧] ((يُمَدُّ))[٤٨] فيهِ أي الحوضِ ميزابانِ ((مُشعَبين))[٤٩] ((شِعَبِين)) (أي ميل الوادي) يَمُدانِهِ مِنَ الجَنَّة أحَدُهما مِنَ ذهب و الآخرُ مِنْ ورقْ فضة (أحدُهما دُرٌّ و الآخَرُ ذَهبْ)[٥٠]))[٥١] واته: (دوو پلوسك (یاخود دوو شیو) دەڕژێتە ناویەوە که ئاوی بەهەشتی پێدادێت یەکێکیان ئاڵتونه و ئەوی تریان زیوە، له ڕیوایەتێکیدا: (یەکێکیان دوڕە و ئەوی تریان ئاڵتونه).

---

[٤٢] أخرجه: ابن ماجة (٤٣٣٤)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٩٨).

[٤٣] أخرجه: البخاري (٦٥٨١).

[٤٤] أخرجه:الترمذي (٤٥٤٢)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٣٤٩٨).

[٤٥] أخرجه: أحمد (٢٣٦/٣)، ابن ماجة (٤٣٣٤)، و الحاكم (٥٣٧/٢)، و الطبري (٢٠٩/٣٠)، و قال الشيخ الألباني في (صحيح إبن ماجة) (٢٠٦٣): حسن صحيح.

[٤٦] في رواية: الترمذي (٤٥٤٢)، و ابن ماجة (٤٣٣٤)، و هو صحيح، و قد ورد هذا الحديث بهذه الألفاظ المختلفة أحببنا إيرادها للعلم فقط.

[٤٧] رواية: مسلم.(٢٣٠٠).

[٤٨] رواية: مسلم (٢٣٠٠).

[٤٩] في رواية: ابن حبان (٦٤٥٧): و قال محققه: حديث صحيح.

[٥٠] أخرجه: ابن أبي شيبة ((المصنف)) (٤٤٣/١١)، و ابن حبان (٦٤٥٥) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٥١] أخرجه: مسلم (٢٣٠٠).

ئەبو حاتەم سەبارەت بە ڕێك خستنی ئەم دوو فەرموودەیە لە (صحیح ابن حبان) دا دەفەرموێت: ((الحديثان ليسَ بَينَهما تُضادٌ، لأنَّ أحدَ المثعَبين يكونُ مِنْ ذهبٍ و الآخَرُ مِنْ فِضةٍ قد رُكِبَ عليهِ الدُّرّ...))[٥٢] واتە: (ئەم دوو فەرموودەیە دژایەتی نی یە لەنێوانیاندا، چونكە یەكێك لە پلوسك و شیوەكان لە ئاڵتونە و ئەوی تریان لە زیوە كە دوڕی بەسەردا كراوە).

**چوارەم: ڕۆیشتنی خەڵكان بۆ سەر حەوزی كەوثەر.**

**أ: یەكەم كەس كە دەچێتە سەر ئەو حەوزە:**

یەكەم كەس كە دەگاتە سەر حەوزەكە پێغەمبەری خۆشەویستمانە(ﷺ) وەك خۆی دەفەرموێت: ((... إنِّي فَرَطُكُمْ على الحوضِ...))[٥٣] واتە: (من پێشتان دەكەوم بۆ سەر حەوزەكە).

دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەژارەكانی ناو كۆچ كردووەكانە (الفقراء المهاجرين)، ثەوبان (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((.... اوّلُ [ في رواية:.. أكثر الناسِ ] وروداً عليهِ فُقراءُ المهاجرينَ الشُّعثُ رؤوساً، و الدُّنسُ ثِياباً ((... الشَّحِبةُ وجُوهُهم [أي تغيير وجوههم من الجوع و الهزال و التعب]))[٥٤] الذين لا يَنكِحون المُتَنعِمات ولا تُفتَحُ لَهُم أبواب السُّدَدِ ((أي ابواب السلطان)) الذين يُعطونَ الحقَّ الذي عَليهِم ((في رواية...كلَّ الذي عَليهِم..))[٥٥] ولا يُعطونَ (كل) الذي لَهُم))[٥٦] واتە: (یەكەم خەڵكان و (زۆرینەیان) كە دەچنە سەرحەوزی كەوثەر هەژارانی ناو كۆچ كردووەكانە كە قژ بژبوون و پۆشاك چڵكن بوون ((.... و زەرد هەڵگەڕاو بوون (واتە: لەبرسا و لە هیلاك بوون و لاوازیدا))) ئەوانەی كە هاوسەری خاوەن نیعمەتیان پێ نەئەدرا و ئەوانەی كە دەرگای

---

[٥٢] أنظر: ((صحيح ابن حبان)) (١٤/٣٧١).

[٥٣] أخرجه: البخاري (٦٥٨٣).

[٥٤] أخرجه: أحمد (٥/٢٥٠) (٦١٦٢) بإسناد حسن كما قال المنذري في ((الترغيب)) (٥٢٩٧)، وابن أبي عاصم ((السنة)) (٧٦٥، ٧٦٨) وقال محققه: حديث صحيح، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٦١٦).

[٥٥] في رواية.

[٥٦] أخرجه: الطبراني في ((الكبير)) (١/١٤٧)، و الترمذي (٢٤٤٤): و قال حديثٌ غريب، و ابن ماجة (٢٣٠٣)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٩)،و في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٧٢)، و في ((صحيح الجامع)) (٣٨٦٢)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (١٠٨٢)، و في ((الظلال)) (٧٤٧).

بەختەوەریان لێ ناکرێتەوە، ئەوانەی کە هەموو ئەو مافانەی لەسەریان بوو دەیاندا، و ئەو هەموو مافەی کە هەیانە بوو پێیان نەدەدرا).

یەکەم کەسێك لە هەژارە کۆچ کردووەکان کە دەچێتە سەر حەوزی کەوثەر هاوڕێ یەکەمی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە ئەبو بەکری ڕاست گۆیە (ﷺ)، وەك ئیبن عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أنتَ صاحِبي في الغار و صاحِبي على الحوض))[٥٧] واتە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئەبو بەکری فەرموو: ((تۆ هاوەڵم بووی لە ئەشکەوتەکەدا و هاوەڵم دەبیت لەسەر حەوزەکە)) .

ئینجا دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کۆچ کاران - خەڵکی یەمەنی یەکخوا پەرستە لە کاتی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و بە دوای ئەواندا ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون بە چاکە لە خەڵکانی یەمەن تاکو ئێستا.

ثەوبان (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((... إنّي لَبِعُقرِ ((أي مؤخِرَةِ)) حوضي أذوَدُ الناسَ (عنه) لأهلِ اليَمَنِ، أضرِبُ بعصايَ حتّى يرفض عليهِم..))[٥٨] واتە: (... من لە ناوەڕاستی حەوزەکەمدام، خەڵکانی لێ دوور دەخەمەوە بۆ خەڵکی یەمەن و لێ دەدەم بە گۆچانەکەم تا بڕژێت بۆ ئەوان ' دوا بەدوای ئەوان هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەتی وە شوێن کەوتوانی بە گشتی پاشان یەکخوا پەرستان دەگەنە سەر حەوزەکە.

زەیدی کوڕی ئەرقەم (ﷺ) دەفەرموێت: ((كُنّا مع رسولِ الله (ﷺ) في سفرٍ، فَنَزلْنا منزِلاً فَسَمِعْتُهُ يَقولُ: ((ما أنتُم بجُزءٍ مِنْ مائةِ ألفِ جزءٍ مِمَّن يَرِدُ عليَّ الحوضَ مِنْ أمَّتي)) قال أبو حمزة: كم كُنتُم يومَئِذٍ ؟ قال: سبعُمائةٍ أو ثمانمائةٍ[٥٩] و في رواية ((ثمانمئة أو تسعمائة))[٦٠] واتە: (ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین (ﷺ) لە سەفەرێکدا و لامان دایە جێگەیەك و گوێم لێ

---

[٥٧] أخرجه:، وأحمد في ((الفضائل)) (١٧٧): و قال محققه: أخرجه ابن جرير (٥/١٠): بإسنادٍ حسن، وأخرجه الترمذي (٣٦٧٩) و قال: هذا حديث حسنٌ غريب صحيح، و ضعّف الشيخ الألباني الحديث من طريق الترمذي و الحاكم فقط في ((المشكاة)) (٦٠١٩): إسناده ضعيف ((ضعيف الجامع)) (١٣٢٧)، ((السلسلة الضعيفة)) (٢٩٥٦).

[٥٨] أخرجه: مسلم (٢٣٠١).

[٥٩] أخرجه: أحمد (٣٦٩/٤)، و أبوداود (٤٧٤٦)، و الطبراني ((الكبير)) (٤٩٩٧)، و الحاكم (٧٦/١)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٢٣)، و في ((المشكاة)) (٥٥٩٣).

[٦٠] في رواية : أحمد (٣٦٩/٤)، و الحاكم (٧٦/١).

بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((ئێوە بەشێك نابن لە سەد هەزار بەش لەوانەی کە دێنە لام بۆ سەر حەوزەکەم لە ئومەتەکەم)) ئەبو حەمزە وتی: ئێوە ئەو ڕۆژە چەند کەس دەبوون ؟ ئەویش فەرمووی: ((حەوت سەد کەس یان هەشت سەد کەس، لە ڕیوایەتێکدا هەشت سەد کەس یان نۆ سەد کەس)).

ب-کۆبوونەوەی ئومەتی ئیسلامی لە چوار دەوری حەوزەکە:

خەڵکانی موسوڵمان پۆل پۆل دەگەنە لای حەوزەکە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((...فتَرِدونَ عليَّ معاً و أشتاتاً...))[٦١] واتە: (... هەمووتان بەیەکەوە یان کۆمەڵ کۆمەڵ دەگەنە لای من...)، پێغەمبەریش (ﷺ) لەلای مینبەرەکەی وەستاوە، وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((...مِنبري على حوضي...))[٦٢] واتە: (...مینبەرەکەم لەسەر حەوزەکەمە...) .

وە لە پێشدا پێغەمبەر (ﷺ) تەماشای ئومەتەکەی دەکات چۆن دەگەنە لای حەوزەکەی، وەك ئەسماء کچی ئەبی بەکر (رضي الله عنها) دەفەرموێت: ((... إنِّي على الحوضِ حتَّى انظُرُ مَنْ يَرِد عليَّ مِنكُمْ...))[٦٣] واتە: (... من لەسەر حەوزەکەمم تا تەماشا بکەم کێ لە ئێوە دەگاتە لای من...) .

سەبارەت بە قەرەباڵغی ئومەتی ئیسلامی لە چوار دەوری حەوزی کەوثەر عرباضي کوڕی ساریە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((لَتَـزدَحَمَنَّ هذه الأمةُ على الحوضِ إزدحامَ إبلٍ ورَدَت لَخمسٍ))[٦٤] واتە: (ئەم ئومەتە کۆ دەبێتەوە لەسەر حەوزەکە بە وێنەی قەرەباڵغی کۆمەڵە وشترێك کە پێنج ڕۆژ ئاویان

---

[٦١] أخرجه: أبو يعلى (٢٤٣١)، و البزار (٩٠٠)، وابن ابي عاصم ((السنة)) (٧٦١) وقال محققه: حديث صحيح، و حسن إسناده علي بن المديني كما في ((تفسير القرآن العظيم)) لإبن كثير (١٩٢/٤)، و قال المنذري: رواه أبو يعلى و البزار و إسنادهما جيد: كما في: ((تهذيب الترغيب)) : (٧١٧)، و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب و الترهيب)) (٧٨٢)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٢٨٦٥).

[٦٢] أخرجه: البخاري (٦٥٨٦).

[٦٣] أخرجه: البخاري (٦٥٩٢).

[٦٤] أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٦٣٢/١٨)، وقال صاحب ((المجمع))(٣٦٥/١٠): رواه الطبراني بإسنادين أحدهما حسن، وابن حبان (٧٢٣٩) و قال محققه: إسناده محتمل للتحسين، و حسّنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) ، (٤٩٤٤)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٢١٤٥)، و في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٧٤/٤).

نەخواردبێتەوە) ، لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((... إنَّـهُ لَيَـردُ على الحوضِ يومَ القيامةِ أكثرَ مِمَّا بين صنعاءَ و إيلةٍ))[٦٥] واتە: (... لە ڕۆژی کۆتاییدا زیاتر لە نێوان (صەنعاء و ئیلە) لە موسوڵمانان خەڵکان دێنە لام بۆ سەر حەوزەکە).

**پێنجەم: هەموو پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی خوا حەوزێکی تایبەتیان هەیە.**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە بۆمان کە هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خوای گەورە حەوزێکی تایبەت بە خۆی و ئومەتەکەی هەیە بەپێی ژمارەی ئومەتەکەی، سەمورەی کوڕی جوندب (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ لِكُلِّ نبيٍّ حوضاً و إنَّهُم يَتَباهونَ أيُّهُم أكثرُ واردةً، و إنِّي أرجـوا أنْ أكونَ أكثرهم وارِدَةً))[٦٦] واتە: (هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە، و ئەوان شانازی دەکەن کە کێیان زیاتر ژمارەی هاتووانی سەر حەوزەکەی زیاتربێت، وە من هیوام وایە کە هاتوانی سەر حەوزەکەم لە هەموویان زیاتر بێت).

هەموو پێغەمبەرێك کەسانی ئومەتەکەی خۆی بانگ دەکات بۆ لای حەوزەکەی، وەك سەمورەی کوڕی جوندب (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((إنَّ الأنبياءَ يَتباهونَ أيُّهُم أكثرُ أصحاباً مِنْ أمَّتِه، فارجوا أنْ أكون يومَئِذٍ أكثرهم كلهم وارِدةً، و إنَّ كلَّ رجُلٍ مِنهُم يومئِذٍ قائِمٌ على حوضٍ مَلآن معهُ عصاً يدعُو مَنْ عَرَفَ مِنْ أمَّتِهِ...))[٦٧] واتە:(پێغەمبەران (علیهم السلام) شانازی بەوەوە دەکەن کە کامیان شوێن کەوتوو و هاوەڵانی ئومەتەکەی زیاترە، منیش هیوام وایە لەو ڕۆژەدا هاتووانی سەر حەوزەکەم لە هەموویان زیاتر بێت، هەموو یەکێك لەوان وەستاوە لای حەوزێکی پڕ ئاو و گوچانێکی بەدەستەوەیە و ئەوەی بیناسێت لە ئومەتەکەی بانگی دەکات بۆ لای حەوزەکەی). پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆچانێکی بە دەستەوە دەبێت بۆ دوور

---

[٦٥] أخرجه: أحمد (٤/١)، وابو يعلى (٥٦)، وابن خزيمة (٤٦٨)، وابن ابي عاصم ((السنة)) (٧٦٩) وقال محققه: اسناده صحيح، و ابن حبان (٦٤٧٦) وهو حديث صحيح.

[٦٦] أخرجه: الترمذي (٢٤٤٣)، وقال حديث غريب، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٩٨٨)، و في ((سلسلة الأحاديث الصحيحة))(١٥٨٩) .

[٦٧] أخرجه: الطبراني((الكبير)) (٧٠٥٣)، وقال الهيثمي ((المجمع)) (٣٦٣/١٠) فيه مروان بن جعفر وثقة ابن أبي حاتم. بقية رجاله ثقات، و حسّنهُ الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٥٨٩)، و في ((صحيح الجامع)) (١٥٨٦).

خستنەوەی ئەو کەسانەی لە ئومەتەکەی خۆی نین وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...لأذود عنْ حوضي كما تُذادُ الغريبةُ مِنْ الإبلِ))[٦٨] واتە: (خەڵکان دوور دەخەمەوە لە حەوزەکەم وەك دوور خستنەوەی وشترێکی نامۆ لە ناو کۆمەڵێك وشتری تر).

ثەوبان(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((.. أنا عِند عُقرِ حَوضي أذوَدُ عنهُ النّاسَ، إنّي لأضرِبهُم بعصاي حتّى يرفَضَّ ((عليهم))..))[٦٩] واتە: (....من لای حەوزەکەمدام، خەڵکانی تری لێ دوور دەخەمەوە، و بە دارەکەم لێیان دەدەم، تا ئاوەکە تەواو لێی بڕژێت بۆ ئومەتەکەم).

لەو ڕۆژەدا پیاوان و ئافرەتانی ئومەتەکانی تر دێنە لای حەوزی کەوثەر و گۆزە و قاپیان پێ یە و دەیانەوێت ئاوی حەوزەکەی تێ بکەن و ماوەیان نادرێت کە لێی بەرن و بیخۆنەوە ، وەك جابر (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أنا فرطكم بينَ أيديكُم، فإنْ لَمْ تَجِدوني فأنَا على الحوضِ .... و سيأتي رِّجالٌ و نِساءٌ بآنيةٍ و قِرَبٍ ثمَّ لا يَذوقون مِنهُ شيئاً))[٧٠] واتە: (من پێشتان دەکەوم، ئەگەر بە من نەگەیشتن ئەوا من لەسەر حەوزەکەمم..... و پیاوان و ئافرەتانێك دێن بە گۆزە و جامەوە و پاشان هیچی لێ ناچێژن).

## چۆن پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئومەتەکانیان دەناسنەوە ؟

هەموو ئومەتێك لە ئومەتەکانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) نیشانەیەکی تایبەتیان هەیە و پێغەمبەرەکەیان ئومەتەکەی خۆی پێ دەناسێتەوە و بانگیان دەکەن بۆ سەر حەوزەکانیان: سەمورەی کوڕی جوندب (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((.... و إنَّ كلَّ رَجُلٍ مِنهُم ((أي الأنبياء)) قائِمٌ على حوضٍ

---

[٦٨] أخرجه: مسلم (٢٣٠٤).

[٦٩] أخرجه: ابن أبي شيبة ((المصنف))(٤٤٣/١١)، وابن حبان (٦٤٥٥) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٧٠] أخرجه: البزار (٣٤٨١)، و ابن حبان (٦٤٤٩) و قال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم.

ملآنٍ معَهُ عصاً يدعو مَنْ عَرَف مِنْ أُمَّتِهِ، و لِكلِّ أمَةٍ سيماءٌ يعرفهم بِهـا نبِيُّهُم))[٧١] واتـه: (.... هەموو پیاوێك لە پێغەمبەران وەستاوە لای حەوزێکی پڕەوە و دارێکی پێ یە و ئەوانە بانگ دەکات کە دەیناسێت لە ئوّمەتەکەی، و هەموو ئوّمەتێك نیشانەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە کە پێی دەناسرێتەوە)

پێغەمبەری خۆشمان (ﷺ) ئومەتەکەی خۆی باش دەناسێتەوە بە ڕواڵەت و ناوەکانیاندا و بانگیان دەکات بۆ سەر حەوزەکەی. عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((فتَرِدُونَ عليَّ معاً أشتاتاً، فأعرِفُكُم بِسيماكُم و أسمائِكُم، كما يَعرِفُ الرَّجُلُ الغَريبةَ مِن الإبـلِ في إبلِـهِ...))[٧٢] واتە: (دێن بۆ لام بەیەکەوە و پۆل پۆل، و دەتان ناسمەوە بە ڕواڵەتتاندا و بە ناوەکانتاندا، وەك چۆن پیاو وشتری نامۆ لە ناو وشترەکانیدا دەناسێتەوە)

## چۆن پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئومەتەکەی دەناسێتەوە لە ناو ئومەتەکاندا ؟

پێغەمبەر(ﷺ) ئومەتەکەی خۆی دەناسێتەوە بە شوێنەکانی دەست نوێژ و بەوەی کە نامەی کارەکانیان بە دەستی ڕاستیانەوەیە و بەوەی کە نەوەکانیان لە پێشیانەوە دێن و دەچن، ئەبو دەرداء (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((.... أنا أوّلُ مَنْ يُؤذنُ لَهُ بالسّجُودِ.... فأنظُر إلى ما بينَ يديَّ، فأعرِفُ أُمّتي مِنْ بينِ الأُمَمِ و مِنْ خَلفي مِثلَ ذلِك، و عن يميني مثلَ ذلِكَ، و عَن شِمالي مثلَ ذلك، فقال رجلٌ: يا رسول الله: كيفَ تعرِفُ أمّتَكَ مِنْ بين الأُمَم فيما بين نوحٍ إلى أمتِكَ؟ قال: ((فإنّهُم يأتونَ يومَ القيامةِ غُرًّا مُحَجَّلينَ مِنْ أثرِ الوضوءِ))[٧٣]، ((....سيماءُ أُمّتي....))[٧٤]، لَيسَ أحدٌ كذلك

---

[٧١] أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٧٠٥٣)، وحسّنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٥٨٩)، و في ((صحيح الجامع)) (١٥٨٦).

[٧٢] أخرجه: أبو يعلى ((مسنده)) (١٢٥٠)، و البزار (٤٢٦/١)، و حسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب و الترهيب)) (٧٨٢)، و ((السلسلة الصحيحة)) (٢٨٦٥).

[٧٣] أخرجه: ابن ماجة (٤٣٠٦)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٧٥)، و في ((ارواء الغليل)) (٧٧٦)، عن أبي هريرة مرفوعاً.

[٧٤] أخرجه: ابن ماجة (٤٢٨٢)، و أنظر: ((صحيح ابن ماجة)) (٣٤٥٥)، عن أبي هريرة مرفوعاً.

غيرُهُم، و أعرِفُهُم أنَّهُم يؤتونَ كُتُبَهُم بأيمانِهِم، و أعرِفُهُم تَسعى بينَ أيديهِم ذُرِّيَّتُهُم))[٧٥] واتە: ((من یەکەم کەس دەبم کە ڕێگەم پێ دەدرێت کڕنووش بەرم....تەماشای پێش خۆم دەکەم و ئومەتەکەم لە ناو ئومەتەکاندا دەناسمەوە لە پێشمەوە و لە پاشمەوە و لە لای ڕاستمەوە و لای چەپمەوە)) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ئومەتەکەت دەناسیتەوە لە نێوان ئومەتەکاندا هەر لە نوحەوە (عليه السلام) تا ئومەتەکەی خۆت ؟ فەرمووی: ((ئەگەر پیاوێك چەند ئەسپێکی نەوچەوان و دەست سپی هەبێت لە نێوان چەند ئەسپێکی ڕەشی تۆخدا ئایا نایان ناسێتەوە؟)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەوان لە ڕۆژی کۆتاییدا ناوچەوان و دەست و قاچ سپین بەهۆی شوێنەواری دەست نوێژ)) ((ئەوە نیشانەی ئومەتەکەمە)) جگە لەوان کەس وانی یە، وە دەیان ناسمەوە ئەوانە کە نامەی کردەوەکانیان بەلای ڕاستیانەوەیە، وە دەیان ناسمەوە کە نەوەکانیان دێن و دەچن لە پێشیانەوە)

ئەبو دەرداء (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((...وأعرِفُهُم بِسيماهُم في وُجوهِهِم مِنْ أثرِ السجودِ..))[٧٦] واتە:(... بەشێوەیاندا دەیان ناسمەوە لە دەم و چاویاندا بە شوێنەواری سوجدە بردنیان ، وە دەبێت باش بزانین کە نیشانەی سپی کردنی دەست و قاچ و دەم و چاو لە ڕۆژی کۆتاییدا تەنها بۆ ئەوانە دەبێت کە بەتەواوەتی دەست نوێژ دەشۆن و هەموو سونەتەکانی دەست نوێژ جێبەجێ دەکەن، ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أنتُم الغُرُّ المُحَجَّلون يوم القيامة مِنْ إسباغ الوضوءِ..))[٧٧] واتە: (ئێوە دەست و قاچ سپین لە ڕۆژی کۆتاییدا لە جوان شۆردنی شوێنەکان دەست نوێژ. پێویستە زیاتر لەو شوێنانە بشۆین کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دیاری کردوین بۆ دەست نوێژ، ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((تَبلُغُ حِليةُ أهل الجنَّة مَبلَغَ الوضوءِ))[٧٨] و أراد بالحلية ها هُنا التحجيل يومَ القيامةِ مِنْ أثرِ

---

[٧٥] أخرجه: مسلم (٢٤٧)، و أحمد (١٩٩/٥)، ابن ماجة (٤٢٨٢) مختصراً و صححه الشيخ الألباني في ((المشكاة)) (٩٩٩)، و في ((صحيح سنن أبن ماجة)) (٣٤٥٥).

[٧٦] أخرجه: أحمد (١٩٩/٥)، و هو حديث صحيح، ومسلم (٢٤٧)، وابن ماجة (٤٢٨٢).

[٧٧] أخرجه: مسلم (٥٧٨)، و أنظر: ((صحيح الجامع)) (١٤٨٩).

[٧٨] أخرجه: أحمد (٣٧١/٢)، و مسلم (٢٥٠)، و النسائي (٩٣/١)، و ابن حبان (١٠٤٥) و قال محققه: حديث صحيح.

الوضوءِ[٧٩]. واتە:(ڕووناکی تا شوێنی دەست نوێژ دەبێت بۆ کەسانی ناو بەهەشت لەڕۆژی کۆتاییدا ئەو جێگایانە ڕۆشن دەبێتەوە).

پێویستە زیاتر بایەخ بدەین بەوەی سوجدەکانمان چاکتر بێت، چونکە موسوڵمانان ڕووناکی ناوچەوانیان لە سوجدە بردنیانەوەیە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ....سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ رُكَّعًا..... ﴾ (الفتح: ٢٩). هەروەها عەبدوڵای کوڕی یاسر(ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ((أمّتي يومَ القيامة غُر مِنَ السُجودِ مُحَجّلونَ مِنَ الوُضوءِ))[٨٠] واتە: (ئومەتەکەم لە ڕۆژی کۆتاییدا ناوچەوان سپین بەهۆی سوجدە بردنیانەوە، ودەست و قاچ سپین بەهۆی دەست نوێژیانەوە). موسوڵمانان بە بۆنی خۆشی دەمیان بەهۆی ڕۆژووەکانیانەوە دەناسرێنەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا وەك ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... والذي نفس محمد بيده لخلوف فم الصائم اطيب عند الله يوم القيامة من ريح المسك.....))[٨١]. واتە: (سوێند بەوەی گیانی محمدی بەدەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە بۆنی میسك خۆشترە لای خوا لە ڕۆژی کۆتاییدا....)

ئبن و حەبان (رحمه الله) دەفەرموێت: ((شعار المومنين في القيامة: التحجيل بوضوئهم في الدنيا فرقاً بينهم و بين سائر الامم، وشعارهم في القيامة بصومهم طيب خلوفهم اطيب من ريح المسك ليعرفوا بين ذلك الجمع بذلك العمل))[٨٢]. واتە: (نیشانەی بڕواداران لە قیامەتدا یەکەم درەوشانەوەی شوێنی دەست نوێژەکانیانە بۆ ئەوەی بناسرێنەوە لە ناو ئومەتەکانی تردا، نیشانەی دووەمیان بۆنی خۆشی ناو دەمیانە بە هۆی ڕۆژووەکانیانەوە کە لە بۆنی میسك خۆشترە بۆ ئەوەی لەو جێگە ڕاوەستانەدا بناسرێنەوە بەو کارەیانەوە).

---

[٧٩] أنظر: (النهاية) لإبن الأثير (٢٥/٣).

[٨٠] أخرجه: الترمذي (٦٠٧)، قال: حديث حسن صحيح، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٤٩٧).

[٨١] أخرجه بهذا اللفظ: ابن خزيمة (١٨٩٦)، وابن حبان (٣٤٢٣) وقال محققه: اسناده صحيح.

[٨٢] انظر: ((صحيح ابن ماجة)) (٢١١/٨).

